ساڵی چواردەهەم هاوینی ٢٠١٣
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
75

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

راوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین

هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdem.net

# ناوەڕۆک

## فیکرو فەلسەفە ٤ ـ ٥٧



## وتارو لێکۆڵینەوە ٥٨ ـ ١٠٣



## گفتوگۆ ١٠٤ ـ ١٢٣

## ئەدەب و هونەر ١٢٤ ـ ١٧٥



## وێستگەکان ١٧٦ ـ ١٩٥



## بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم ١٩٦

ناتوانم ماڵئاوایی هەتاهەتاییت لێ بکەم و ناوت بەسەر لاپەڕە دڕەوشاوەکانمەوە نەهێڵم. تۆ لە تەنیاییدا دەستت گرتم و لە پاڵ خەمەکانمدا ڕاکشایت. نەت هێشت وەك لقێکی باریك وشك هەڵبێم و وەك دەنکە تەرزەیەکی وێڵ لەسەر زەویەکی ڕەقدا ئاسەوارم نەمێنێت. لە گەرمەی هەڵکشان و داکشانەکاندا کە چاوم بوو بوو بە فەنەرک ئەم سەر ئەو سەری گێژەڵووکەیەکی چنگ خۆڵەمێشی، تۆ پەنایەکی ئارامت پێ پەخشیم. پەناک لەبەرکردنی کراسی گزنگ و گوڵێکی ڕەنگین بە ناوچاوی پاییزەوە. پەناک بڵێسەیەکی هێور کە پڕپڕیێت لە نووری لێبوردەیی و گەرمایی دەستی فریشتەیەکی دەریا. تۆ هەرکەسێك بهاتایەتە لات گوڵ بارانی وشەی ڕازاوەت دەکردم، لە بەستێنی خۆمدا بە تاقە گۆڤاری بالاّ زراف ناوت دەهێنام. ئەوکاتەی هێشتا تەمەنی باڵ گرتنم لە خەوی ژنێکی ژان گرتوو تێ نەپەڕیبوو، تۆ و هاوڕێکانت منتان لە کەژاوەی دڵی پڕ لە خۆشەویستی خۆتان ناو پاشان سڵاوێکتان بۆ ئاسمان پیاناردم. ئێستا باڵی چواردە ساڵانەی تەمەنی من لە ڕستەی تەڕی ئێوە و لە شکۆفەی خەیاڵی تۆ و لە تاڤگەی وشە ڕۆح سووك و سپیەکانتە. کاکە شێرکۆی ئازیزم من ئێستایش بەناوی تۆوە جوانم و هەرگیز یادەوەریەکانت لەیادناکەم.

گۆڤاری (سەردەم)ی خۆشەویستت.





# ئـاراسـتـەی نـوێـی کلتورەکانی جیهان

نووسینی: فرانسیس فۆکۆیاما
و. لە فارسییەوە: رەند

پرۆفیسۆر سامۆیل هانتینگتۆن لە پەرتوکی (پێکدادانی شارستانییەتەکان)ی خۆی لە ساڵی (١٩٩٦)دا دەڵێت: دوای جەنگی سارد، سیاسەتە جیهانییەکان لەژێر کێشمەکێشمی نێوان ئایدۆلۆژییە ناتەباکاندا نامێنێتەوە، بەڵکو دیلی دەستی ناکۆکی نێوان کلتور و شارستانییەتەکانە.

ناوبراو نوسیویەتی: دەسەڵاتی کلتوری، شوێنکەوتەی هێزە پاشکۆکانی بەجیهانیبوون دەکەن، سەرەنجام ئینتمای مرۆڤەکانیش بەشێوەیەکی گشتگیر لەسەر بنەمای پێکهاتەی مەزهەبی، نەتەوەیی و مێژوویی هاوبەش پێناس دەکرێنەوە.

هانتینگتۆن بەهاکانی پەیوەست بە ڕووناکبیریی خۆرئاوا، دیموکراسی، مافە تاکەکەسییەکان وەک وێنایەک بۆ بەها مەسیحییەکانی خۆرئاوا وەسف دەکات، بەم چەشنە پاساوی بۆ دەهێنایەوە کە



فۆکۆیاما

کلتورەکانی تر بە هەندێ بەهای جیاوازەوە کۆمەڵێک دامەزراوەی جیاواز دەخوڵقێنن.

دوای یەک دەیە لە بڵاوبوونەوەی ئەم پەرتوکە، زۆر کەس لەو بڕوایەدان کە تیۆری پێکدادانی شارستانییەتەکان ئێستا بەهۆی ڕووداوەکانەوە خۆی چەسپاند. هێزە مەزهەبییەکان بەشێوەیەکی بەربڵاو هاتوونەتە ئارا کە ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامدا هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلامگەرا توندڕەوەکان تەنانەت لە باشوری ئاسیا، ئەمریکای لاتین، ئەمریکا و ڕووسیادا دەبینرێت.

ئەو مشتومڕانەی لە تیۆری پێکدادانی شارستانییەتەکاندا خراونەتەڕوو، بەتەواوەتی پەیوەندیان بەم مەسەلەیەوە هەیە و هاتنگتۆن چۆتە ناواخنی مەسەلەکانەوە، بەڵام سەرجەم ئەم مەسەلانە پرسیارێکی چارەنوسساز دەهێننە ئارا: ئایا ڕەهەندە سیاسییەکانی بیروباوەڕ و متمانە لەلایەن کلتورەکانەوە دەخوڵقێن یان ئێمە دەتوانین لەسەر بنەمای جیهانێکی تر بژین یان ڕەنگە تەنانەت دنیایەکی تر بدۆزینەوە؟

من لەگەڵ تیۆری پێکدادانی شارستانییەتەکاندا هەم هاوڕام و هەم ناتەبام، لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا هاوڕام کە فاکتەرە کلتورییەکان بوونەتە گۆشەنیگایەک کە زۆرینەی خەڵکی ئەمڕۆ لە ناواخنی ئەو گۆشەنیگایەوە دەڕوانێتە کاروبارە نێودەوڵەتییەکان.

لەلایەکی ترەوە لەو بڕوایەدام کە لەم تیۆرییەدا، ئەو لایەنە بە هێزە و تواناکانەی بوونەتەمایەی گەشەپێدانی جیهان ڕەوتێکیان بڕیوە کە دەبێتەمایەی پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن و یەکخستنەوەی دامودەزگاکان، بەڵام ئاراستەکەشیان بۆ زل کردنی قەبارەی خۆیانە لەسەر ئاستی جیهان.

هانتینگتۆن ڕاست دەکات کە دەڵێت ناسنامەی سیاسی لەسەر بنەمای کلتوری هاوبەش، لە ئایندەیەکی نزیکدا بەرەو نەمان دەچێت. ئەمە زۆر نادیموکراسیانەیە کە هێزە ئابورییە جیهانییەکان، توانستی کۆمەڵگا لۆکاڵییەکان بۆ بڕیاردان لە بەرنامەداڕشتنی ژیانی سیاسی هاوبەشدا کاڵ بکەنەوە. ڕاستە کە وڵاتە جۆراوجۆرەکان دەبێ ڕێگە تایبەتییەکەی خۆیان بەرەو ئاقاری مۆدێرنێتە ببڕن، ئەو ڕێگا تایبەتییەی کە ئەوروپای خۆرئاوا، ئەمریکا، یابان، ڕووسیا و وڵاتانی تر پیایدا ڕۆیشتوون بە تەواوەتی لەیەکتر جیاوازن. مۆدێرنیزەکردن و گەشەپێدان لە ناواخنی هەوڵە نەتەوەییە خۆماڵییەکانەوە هەڵدەقوڵێ کە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەژین، نەک لەلایەن ئەو کەسانەی

بێگانەن. وڵاتان دەتوانن لەیەکترەوە فێرببن، بەڵام توانستەکانیان بۆ هێنانەدی ئامانجێک لەسەر خاکی وڵاتێکی تر، بەگشتی زۆر سنوردارە. ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئەمریکا لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا لە عێراق بەشێوەیەکی مەترسیدار فێری بووە و هەستی پێکردووە. بەڵام پرسیارێک کە پێویستە وەڵامـی بدەینەوە ئەمەیە کە ئایا ئێمە ڕێبازی جۆراوجۆرمان بەرەو ئامانجێکی کۆتایی گرتۆتەبەر؟ (بۆ نمونە ئامانجێکی وەک شارستانییەتی جیهانێکی یەکگرتوو) یان ڕاستییەکەی ئەمەیە کە کلتورە جۆراوجۆرە مرۆییەکان بەرەو ئەو مەبەستە هەنگاو دەنێن کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ یەکتر جیا ببنەوە.

بە بڕوای من ئەوەی کە دژ بە تیۆری پرۆفیسۆر هانتینگتۆنە، ئەوەیە کە مۆدێرنیزەکردن پێویستی بە هاوئاراستەیی جۆرەها دامودەزگا هەیە بەبێ ئـەوەی بایەخ بە خاڵی دەستپێکی کلتورەکە بدەین. یەکپارچەیی ئابوریی لەنێوان وڵاتاندا، ئەنجامێکی باشتر دەدات بەدەستەوە، کاتێ لەبری پەیوەندییەکی سست بتوانرێ وابەستەبوونێکی کلتوریی لەسەربنەمای یاسا و بەشێوەیەکی شەفاف بنیات بنرێت، دەبێتەمایەی هاتنەئارای متمانە.

خاڵی دەستپێکی گەشەکردنی هەر وڵاتێک، ئەو بارودۆخەیە کە (ماکس ویبەر)ی سۆشیالیستی ئەڵمانی بە چڕکردنەوەی هێزێکی یاسامەند لەسەر خاکێکی دیاریکراو پێناسی دەکـات، بەڵام کاتێ ئەم بارودۆخە بە هەڕەشەیەک یا بە ئەنارشیزمێک دەستپێدەکات ئـەوا موجیزەی وڵاتێکی مۆدێرن لـەوەدایـە کە توانای چـارەسـەری ناکۆکییەکانی نێو دەسەڵاتی هەبێت. بەو مانایەی وڵاتێک دەبێ هێندە دەسەڵاتدار بێت کە سیستەم دابین بکات و یاساکان جێبەجێ بکات، بەدەرلەمە ئەگەر وڵاتـەکـە گەشەیەکی ئابوریی درێژخایەنیشی لەبەردەمدا بێت، دەبێ پیادەکردنی دەسەڵاتەکانی خۆی سنوردار بکات. ئەمە ئەو کەموکوڕییەیە کە گەشەی بێ بنەمای ئابوریی لە زۆرینەی ناوچە تازەگەشەکردووەکانی جیهان دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە، سەرجەم کۆمەڵگاکان پێویستیان بە سیستەم و حکومەتی یاسا و دەوڵەتێکە کە بتوانێ کاڵا گشتییە بنەڕەتییەکان فەراهەم بهێنێ و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەرچاوەکانی داهات دابەش بکات.

ئـەگـەر فـەرمـانـڕەواکـان نەتوانن بەشێوەیەکی کاریگەرانە حکومڕانی بکەن، ئەگەر ڕێژەی گەندەڵیان لە ئاستێکی بـەرزدا بێت و سـەرچـاوەی داهاتە گشتییەکان بەرەو ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان بە ئاراستەدا ببەن، ئەگەر بەشێوەیەکی تاکڕەوانە حکومڕانی بکەن، ئەوا لەو بارودۆخەدا ئەو داهات و سەرچاوانەی بۆ گەشەکردنی درێژخایەن پێویستن، بەهۆی کۆمەڵێک بیانوویەکی گچکەوە لەناو دەچێت. لەسەر ئەم بنەمایە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە لە کۆتایی دەیەی (٩٠)دا، وڵاتانی شایستە و خاوەن حکومڕانیە باشەکان بوونەتە نمونەیەکی دیار لە دنیای ئەمڕۆدا.

وڵاتێکی مـۆدێـرن چـۆن حکومڕانییەکی باش دەستەبەر دەکات؟ (حکومڕانی) دیارییەک نییە کە لەلایەن فەرمانڕەوایانەوە بە هاوڵاتیان ببەخشرێت، ئەم سیستەمە سەرەنجام دەبـێ لەسەر بنەمای وەڵامـدانـەوەی خەڵک بنیات بنرێت، بەجۆرێک کە سیستەم پێویستە خزمەت بە بـەرژەوەنـدی هاوڵاتیان لەلایەن فەرمانڕەوایانەوە دابین بکات نەک

بەرژەوەندی بۆ چینی فەرمانڕەوا و دۆستان و خزم و کەسوکاری فەرمانڕەوا دابین بکات.
سەرجەم دەوڵەتان دەتوانن بە ڕێگەی جۆراوجۆر وەڵامدانەوە و بەرپرسیارێتی بگرنە ئەستۆ، باوترین مۆدیلیش لەم ئاقارەدا میکانیزمی (وەڵامدانەوەی گشتی)یە لەهەمبەر بەرپرسانـدا لەڕێگەی پرۆسەی هەڵبژاردنەوە. میکانیزمیتریش بریتییە لە (وەڵامدانەوەی ستونی) کە تیایدا دامودەزگا جۆراوجۆرەکانی حکومەت میکانیزمی کاری یەکتر دەخەنەژێر چاودێری یەکترەوە و کۆنترۆڵی یەکتر دەکەن.
ئەنجومەن و دادگاکان و سەربەخۆیی دەسەڵاتی جێبەجێکاریش گرنگییەکی زۆریان هەیە. سەرەڕای ئەمانەش کۆمەڵێک میکانیزمیش لە دەرەوەی سیستەمی سیاسی ڕەسمیدا هەن. وەڵامدانەوە پێویستی بە شەفافیەتی ڕەفتاری دەسەڵاتدارانە، چونکە حکومڕانە خراپەکان بە دەگمەن باس لە شکست و پێشێلکارییەکانیان دەکـەن. هەر لەبەرئەمەشە کە حکومڕانی باش پێویستی بە (میدیای سەربەخۆ) و (دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی) هەیە تا ڕەفتاری دەوڵەت بخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە. بەم شێوەیە وڵاتە مۆدێرنە کاریگەرەکان، لەبەر ئەو سانسۆرانەی دژ بەخۆی دەیگرێتەبەر، لەسەر ئاستی جیهان وڵاتە مۆدێرنانە جێگەی بایەخن و لەوپەڕی تواناادا لەسەر کورسی دەسەڵات ئەو مەسەلەیە لەیاد ناکەن.
متمانە چ لە ناوخۆی وڵاتەکەوە و چ لە نێوان وڵاتاندا دروست ببێ، دەشێ لە ڕێگەی دوو سەرچاوەوە دابین بکرێت: یەکەمیان سەرچاوە کلتورییەکانە کە لەو ڕێگەیەوە متمانە لەنێوان بەهاکان، دابونەریت و مێژووە هاوبەشەکەیاندا دێتەئارا.
لە سەرجەم کۆمەڵگاکاندا متمانە لەناو خێزان و لە ڕێگەی پەیوەندییە خزمایەتییەکانەوە دەست پـێـدەکـات، پـاشـان وردەوردە لـە قـەوارەیـەکـی بەرفراوانتردا و لەناو گروپە کۆمەڵایەتییەکانەوە دێتەوەئارا.
دووەمین جۆری متمانە لەسەر بنەمای سەرچاوە هاوبەشەکانە، ئەم جۆرە متمانەیە دەتوانرێ لەناو ئەو لایەنانەی بەیەکتر نامۆن بهێنرێتەئارا، واتا لەڕووی کلتورییەوە هیچ خاڵێکی هاوبەشیان لەگەڵ یەکتردا نییە و لەوانەیە لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا سەرقاڵی چالاکی بن. ئەم جۆرە متمانەیەش لەسەربنەمای دامەزراوە و ئەنسیتیتۆکانە .
لەنێوان ئـەم دوو جـۆرە متمانەیەدا، مۆدیلە کلتوریەکەی بەشێوەیەکی ئاشکرا بۆتە کارێکی سروشتی و سەرتاپاگیر، بـەڵام لە هەمانکاتدا خێڵەکیانەترە. سەرجەم بنەما مرۆییەکان خۆیان لەسەر گروپە کۆمەڵایەتییەکان یا کۆمەڵگە کلتورییە بەراییەکان ئۆرگانیزە دەکەن، بەنزیکەیی سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگا کاتێ ڕووبـەڕووی کێشە یان قەیرانێک دەبنەوە، بەرەو ئەم گروپە کۆمەڵایەتیانە دەگەڕێنەوە.
دووەمین جۆری متمانە، بەجۆرێکی جیاواز پەرە بە کاریگەرییە بەهێزەکەی خۆی دەدات. ئەم جۆرە متمانەیە تەمەن درێژترە چونکە لەسەر بنەمای پەیوەندییە تایبەتییەکان و سەربەخۆیی ئابورییەکی مۆدێرنە.
کاتێک وڵاتان لە پرۆسەی مۆدێرنیزەبووندا دەژیان، متمانە لە (بەرژەوەندییە تایبەتییەکان)دا لەهەمبەر (پەیوەندییە خزمایەتییەکان) ڕادەوەستایەوە نەک لە بەرامبەر بە کلتور.

پرۆسەی بەجیهانیبوونیش، چانسی گەشەپێدانی بازاڕەکانی لە سنورەکانی کۆمەڵگایەکی تایبەت بەرفراوانتر کرد. بازاڕ لە چوارچێوەیەکی ناتایبەتی و ئۆرگانیزەکراو و دامـــەزراودا، پێویستی بە گەشەپێدانێکی زیاتریش هەبوو تا لەو ڕێگەیەوە متمانە لەناو لایەنە نامۆ بەیەکترەکاندا فۆرمەڵە ببێ. بۆ نمونە بازرگانی لەناو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی نەریتیانە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا فۆرمەڵە بوو، لەو ژینگەیەدا زۆر دژوار بوو کە متمانە بە بێگانە و کەسانی نامۆ بکەیت، یاخود مامەڵە یان بازرگانی لەگەڵ کەسێکدا بکەیت کە هیچ پەیوەندییەکت پێوە نەبووبێت.

ئەگەرچی ئەم شێوازە لە سەرمایەی کۆمەڵایەتیدا لەسەربنەمای پەیوەندییە خزمایەتییەکان تا ماوەیەک و تا ئەندازەیەک کاریگەریی هەبوو، بەڵام سنوردار بوو. ئەم ڕێبازە بەومانایە بوو کە بازرگانی تایبەت بە بنەماڵە، ناتوانێ بچێتە قۆناغی کۆمپانیا پرۆفیشناڵ و مەزنەکانەوە.

کۆمەڵێ پاساوی سیاسی زۆر لەبەردەست ئەو وڵاتانەدایە کە لەسەربنەمای زەمینەی هاوبەشی کلتوری، نەتەوەییو مێژوویی بڕیاری هاوپەیمانی لەگەڵ یەکتردا دەدەن، بەڵام ئەقڵی ئابوریی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە دەبێ متمانە لەسەربنەمای سەرمایە ناتاکەکەسییەکان بێ.

یەکپارچەیی لە ئابوریی جیهانیدا تەمەن درێژتر و کاریگەرترە، پێویستە لەبری کێبرکێی دەروونی و تایبەتی لەسەربنەمای (بەرژەوەندی) و لەبری کلتور لەسەربنەمای (دەزگا و دامــەزراوە) بێت. ئەمەش گۆشەنیگایەکی خۆرئاواییانە نییە بەڵکو ئاراستەیەکی جیهانییە.

سەرچاوە: مجله ارتباطات، شماره ٢، سال ١٣٩٠، ص (٤٥-٥١)

# پێشگۆتن بۆ هەر میتافیزیکێک کە بشێت لە ئایندەدا بێت بە زانست

ئیمانوێل کانت
و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

**لە رێیەرییەوە**
**پێویستە سەرلەنوێ بناغەیەك بۆ شیمانەی میتافیزیك برێژرێت، چونکە گومانەکەی هیوم خستیە ژێر پرسیارەوە**

مێژووی فەلسەفە (ی کۆن و نوێ) بۆ هەندێک زانا بریتییە لە خودی فەلسەفەکەیان. ئەم پێشگۆتنە بۆ ئەوان نەنووسراوە. ئەوان دەبێت جارێ چاوەڕوان بن هەتا ئەو کەسانە کە کۆششی بەدیهێنان دەکەن لە سەرچاوەکانی خودی ئاوەزەوە، کۆتایی بە کارەکەیان دەهێنن، ئەوجا سەرەی ئەوانە لەبارەی ئەوە بدوێن کە لە جیهاندا ڕوویداوە.



کانت

مەبەستی من ئەوەیە، هەموو ئەو کەسانە کە وای دەبینن مێتافیزیک شایانی ئەوەیە خۆیانی پێوە خەریک بکەن، بگەیەنم بەو بڕوایە کە زۆر پێویستە دەست لە کارەکەیان هەڵبگرن و هەر شتێکی کراو لەو بوارەدا وەک نەکراو دابنێن، ئەوان جارێ پێویستە بپرسن کە «داخۆ شتێکی وەک مێتافیزیک بەگشتی شیاو بێت.»
گەر مێتافیزیک زانست بێت، کەواتە ئیتر هۆی چییە ناتوانێت هاوشێوەی زانستەکانی دی ستایشی گشتی و بەردەوام بۆ خۆی مسۆگەر بکات؟ گەر ئەو زانست نییە، کەواتە ئیتر چۆن ئەو خۆی بەردەوام لەژێر ڕواڵەتی زانستێکدا بادەدات و زەینی مرۆڤ دەخاتە بەردەم هیوای هەرگیز نەبڕاوە بەڵام هەرگیز بەدینەهاتوو؟ کەواتە با مرۆ زانینی یان نەزانینی خۆی هەر پێشان بدات، سەرەڕای ئەوە هێشتا هەر پێویستە جارێ جەختییەک لەبارەی سروشتی ئەم زانستە بێمۆڵەتە مسۆگەر بکرێت. ئاخر مەحاڵە مرۆ چیدی بتوانێت درێژە بەو پەیوەندییە بدات کە لەتەک ئەودا هەیەتی. نزیکەی شایانی پێپێکەنینە کە هەموو زانستێکی دی بەردەوام لە پێشکەوتندایە، بەڵام مرۆ لە ئەمدا _ ئەم کە دەیەوێت خودی دانایی بێت و هەموو یەکێک پرسیار لە پەیامەکەی دەکات، بەردەوام لە شوێنی خۆیدا دەسووڕێتەوە و یەک هەنگاو ناچێتە پێشەوە.

بەڵام دوای ئەوە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کار لە زانستێکدا کراوە، ئەوجا گەر مرۆ بە سورماوی لەوە بهزرێت کە داخۆ تا چەند لەو زانستەدا هەنگاو بەرەو پێش نراوە، ئیدی هیچ نابەجێ نابێت کە کەسێک بۆ دوا جار بگات بەو پرسیارە کە داخۆ و چۆن هەبوونی زانستێکی بەو چەشنە بشێت. ئاخر ئاوەزی مرۆڤ ئەوەندە حەزی لە بیناکردنە کە ئیدی چەندین جار بورجی بیناکردووە و پاشان سەرلەنوێ هەڵیوەشاندۆتەوە، تەنیا بۆ ئەوەی ببینێت کە داخۆ بناغەکەی چۆن دروستکرابێت.
پرسیار لەبارەی شیمانەی هەبوونی زانستێک پێشمەرجێکی هەیە کە گومانکردنە لە هەقیقەتی ئەو زانستە. بەڵام گومانێکی بەم چەشنە هەموو یەکێک نیگەران دەکات کە ڕەنگە سەرجەمی پڕوپاتاڵەکەی لەم بەناو خشڵە پێکهاتبێت، بۆیە دەشێت ئەو کەسە کە ئەم گومانەی بۆ دێت، حساب بۆ ئەوە بکات کە لە هەموو لایەنێکەوە بەرهەڵستی بکرێت. هەندێک کەس کە بە ئاگایی شانازیان موڵکە کۆنەکەیان ڕادەگرن و بەهۆی کۆنییەکەیەوە بە ڕەوای دەبینن، کتێبی ڕێبەرییە مێتافیزیکییەکانیان گرتووە بە دەستەوە و بە بێرێزی لێی بڕوانن، هەندێکی دی کە هیچی دیکەیان نەبینیوە جگە لەوەی پێشتر لە جێیەک بینیویانە، لێی تێناگەن، بۆیە ئیدی هەموو شتێک بۆ ماوەیەک ئەوها دەمێنێتەوە کە هەروەک هیچ ڕووی نەدابێت و پاڵنەر بێت بۆ ئەوە کە هەوڵ بۆ گۆڕینێکی نزیک بدرێت یان هیوای بۆ بخوازرێت.
من سەرەڕای ئەوە دەوێرم وای دابنێم کە خوێنەری خۆهزریوی ئەم پێشگۆتنەی بەردەست نەک تەنیا دەکەوێتە گومانەوە لەو زانستە کە ئەو تا ئەمڕۆ خاوەنی بووە، بەڵکو تەنانەت پاشان بەتەواوی دەگات بەو بڕوایە کە بەبێ بەجێگەیاندنی ئەم داواکاریە ڕاگەیانراوانەی ئێرە نەشیاوە ئەو جۆرە زانستە هەبێت و شیمانەی هەبوونی ئەو بەندە بەم داواکاریانەوە، ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەم داواکاریانە لە هیچ کوێ بەجێنەگەیەنراون، ئەوا جاری لە هیچ کوێ مێتافیزیک لەگۆڕێ نییە. بەڵام لەبەر ئەوەی هاوکات پێداویستی بۆ مێتافیزیک هەرگیز دانامرکێتەوە، چونکە گرنگیدانی ئاوەزی گشتیی مرۆڤ زۆر پڕسۆز پێوەی ئاڵۆزکاوە، ئەوا خوێنەر دەیدرکێنێت کە ڕیفۆرمێکی تەواوەتیی مێتافیزیک، یان باشتر ببێژین، زایینی نوێی ئەو، جارێ بەگوێرەی پلانێکی هێشتا تەواو نەناسراو لەبەردەمدایە، جا با مرۆ تەنانەت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، چۆن بویسترێت، هەر بەرهەڵستیی ئەو کارە بکات.
لەکاتی هەوڵەکانی لۆک و لایبنیتسەوە، یان ڕاستتر، لەکاتی سەرهەڵدانی مێتافیزیکەوە بە درێژایی مێژووەکەی، هیچ ڕوداوێک پەیوەند بە قەدەری ئەم زانستەوە هێندەی هێرشەکەی دەیڤید هیوم بۆ سەری بەواتا نەبووە. هیوم هیچ ڕۆشناییەکی بەم جۆرەی مەئریفە نەدا، بەڵام پزیسکێکی ئەوتۆی خستەوە کە مرۆ دەیتوانی لێوەی ڕووناکییەک دابگیرسێنێت، بێگومان گەر هاتوو کەرەسەیەکی سووتانی ببینیایەتەوە کە دەشیا بە خەمەوە گڕی گەشاوەی بهێڵرێتەوە و پەرەی پێبدرێت.
هیوم لە یەک تاکە تێگەی بەواتای مێتافیزیکەوە دەرچوو: تێگەی گرێدراویی هۆ و ئەنجام (بەمەش گرێدراویی تێگەکانی هێز و کردار و هتد کە دەرەنجامی ئەو تێگەیەن)، هەروەها داوای لە ئاوەز کرد __ ئاوەز کە وای دادەنێت ئەو تێگەیەی لەنێو کۆشی خۆیدا هێنابێتە ئاراوە __، بەوردی بۆی ڕوونبکاتەوە کە ئەو بە چە مافێک وای دادەنێت: دەشێت شتێک بە چەشنێک پێکهاتبێت، ئەوجا گەر ئەو شتە

دابنرێت، ئەوا دەبێت بەزەرووری بەو ڕێیەوە شتێکی دیکە دابنرێت _ ئاخر ئەمە بریتییە لە تێگەی هۆ.
هیوم بەبێ هیچ نەسازییەک سەلماندی: نەشیاوە بەتەواوی بۆ ئاوەز بلوێت بە ئاپریۆری و لە تێگەوە گرێدراوییەکی بەو چەشنە بهزرێنێت، چونکە ئەم گرێدراوییە زەroورە لەخۆدەگرێت. بەڵام ئەوە هیچ شیاوی تێگەیشتن نییە، کە بۆچی لەبەر ئەوەی شتێک هەیە، ئیدی دەبێت بەزەرووری شتێکی دیکە هەبێت، ئەوجا ئایا چۆن دەشێت تێگەیەکی بەم چەشنەی گرێدراوی بە ئاپریۆری پێشبینی بکرێت.
هیوم لەمەوە گەیشت بەو دەرەنجامە کە ئاوەز بەم تێگەیە خۆی تەواو فریودەدات، ئاوەز بەسەهوو ئەو بە کۆرپەی خۆی دادەنێت، چونکە تێگەکە تەنیا زۆڵێکە کە توانستی وێناکردن خستوویەتیەوە، ئەم توانستەیە کە، دوای ئەوەی ئەزموون حامیلەی کردووە، پێشبینیی تایبەتیی داوەتە پاڵ یاسای گرێدراوی، ئەوجا زەroورەیەکی سەبژێکتی، واتا خوویەکی هاتووەئارای لەو یاسایەوە بەسەهوو وەک زەroورەیەکی ئۆبژێکتی زیت کردۆتەوە و گۆیا لە تێگەیشتنەوە هاتۆتەئاراوە. هیوم لەمەوە گەیشت بەو دەرەنجامە کە: ئاوەز هیچ توانایەکی نییە بۆ ئەوەی گرێدراوییەکی بەو چەشنە بهزرێنێت، ئەوە تەنانەت بە گشتیش، چونکە گەر ئەوە بکات، ئەوسا تێگەکانی تەنیا بریتی دەبن لە هۆنینەوە و سەرجەمی ئەو مەئریفانەش کە گۆیا بە ئاپریۆری هەن، هیچی دیکە نابن جگە لە ئەزموونگەلی گشتی کە بەسەهوو خەتمیان لێدراوە، ئەمەش واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە لە هیچ کوێ مێتافیزیک نییە و نەشیاوە هەرگیز ببێت.

### گومانەکەی هیوم تەنانەت کانتی لە هەڵوێستە دۆگماییەکەی بێدارکردەوە

من بە ڕاشکاوی دەیدرکێنم: یادهێنانەوەی دەیڤید هیوم ئەو ڕەوشە بوو کە پێش چەند ساڵێکی زۆر لە سەرخەوی دۆگماییم بێداری کردمەوە و ئاڕاستەیەکی تەواو جیاوازی دا بە توێژینەوەکانم لە بواری فەلسەفەی مەزندەییدا (سپێکولاتیڤدا / تیۆرییادا). من بێگومان دوور بووم لەوە کە گوێڕایەڵیی ئەو بکەم، چونکە لەگەڵ دەرەنجامەکانیدا نەبووم، ئاخر هیوم بەو دەرەنجامانە گەیشت، چونکە ئەو سەرجەمیانە پێشبینیی ئەرکەکەی خۆی نەکرد، بەڵکو خۆی تەنیا بە پاژێکیانەوە خەریک کرد کە ناتوانێت زانیاری تەواو بە دەستەوە بدات گەر هاتوو ڕەچاوی سەرجەم نەکرێت. گەر مرۆ لە ئیدێیەکی دامەزراو بەڵام تەواونەکراوەوە دەست پێبکات کە کەسێک پاش خۆی بەجێی هێشتووە، ئەوا زۆر چاک دەتوانێت هیوادار بێت کە بە لێهزرینی بەردەوامی پێدراو زۆرتر لەو پیاوە هزرتیژە بڕبکات کە یەکەم پزیسکی ئەم ڕوناکییەی داگیرساند.
کەواتە من سەرەتا لەوە هزریم کە داخۆ پرۆژەکەی هیوم بەگشتی شیاوی پێشبینیکردن بێت، ئەوجا هێندەی نەخایاند بۆم دەرکەوت: تێگەی گرێدراویی هۆ و ئەنجام بە هیچ شێوەیەک تاکە تێگەیەک نییە کە بەڕێیەوە زەین ئاپریۆریانە گرێدراوییەکانی شتەکان دەهزرێنێت، بە پێچەوانەوە مێتافیزیک تەواو لەو گرێدراویانە پێکدێت. من هەوڵم دا ژمارەیان بۆ خۆم مسۆگەر بکەم، ئەوجا

لەبەر ئەوەی ئەم کارەم بەگوێرەی خۆزگەکەم، واتا لە یەک تاکە پرنسیپەوە بۆ لوا، ئیدی دەستم دایە هەڵهێنجانی (دێدوکسیۆنی) ئەم تێگانە و لەبارەیان جەخت بووم کە ئەوان لە ئەزموونەوە وەک دەرەنجام نەبراونەتەوە، وەک چۆن هیوم دەیگۆت، بەڵکو لە زەینی پەتییەوە هەڵقوڵاون. ئەم هەڵهێنجانە کە بۆ هزرتیژەکەی پێش خۆم وەک نەشیاو دەردەکەوت، لە ڕاستیشدا هیچ کەسێکی دی جگە لەو نەیدەتوانی ئەم ئیدێیەی بۆ بێت، جا گەرچی هەموو یەکێک تێگەکان سووک و ئاسان بەکاردەهێنێت بەبێ ئەوەی بپرسێت کە داخۆ چواندنی گشتییان بە چییەوە بەند بێت، بەڵێ دەبێژم ئەم هەڵهێنجانە بریتی بوو لە ئاڵۆزترین ئەرک کە پەیوەند بە مێتافیزیکەوە شیاوی ئەنجامدان بێت، بەڵام لێرەدا نالەبارتر لەو ئاڵۆزییە ئەوەیە کە خودی مێتافیزیک، جا ئەو تا چەند لە هەرکوێ هەبێت، نەیدەتوانی کەمترین یاریدەم بدات، چونکە دەبوو ئەو هەڵهێنجانە جارێ گەرەنتی بە شیمانەی هەبوونی مێتافیزیکێک بدات. ئەوجا لەبەر ئەوەی بۆم لوا نەک تەنیا کێشەکەی هیوم تەنیا لە یەک ڕەوشی تایبەتیدا، بەڵکو تەنانەت پەیوەند بە سەرجەم توانستی ئاوەزی پەتییەوە چارەسەر بکەم، ئیدی توانیم هەنگاوی جەختتر بەڵام هێواشتر بنێم تا لە کۆتاییدا سەرجەم چێوەی ئاوەزی پەتی لە سنوور و ناوەرۆکیدا بەتەواوی بەگوێرەی پرنسیپی گشتی دیاری بکەم، ئەمەش کارێکی ئەوتۆ بوو کە مێتافیزیک پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی سیستەمەکەی خۆی بەگوێرەی پلانێکی مسۆگەر بینا بکات.

**لەبەر ئەوەی ڕەخنەی ئاوەزی پەتی هەندێك ناڕۆشنیی لەخۆدەگرێت، ئەوا گەرەکە ئەم پێشگۆتنانە ڕێبەرییەکی ئاسانتر شیاوی تێگەیشتن بن**

ناڕۆشنییەکی تایبەتی لە فراوانیی پلانەکەوە دێتەئاراوە و پەیوەند پێوەی ناشێت پنتە سەرەکییەکان کە مەبەستی توێژینەوەکەن، ڕەچاو نەکرێن، کەواتە گازندەکە ڕەوایە و لەبەر ئەم هۆیە بەم پێشگۆتنانەی ئێرە یەکلای دەکەینەوە.

**لە بەشی سەرەکییەوە**

**مەئریفەی مێتافیزیکی ئەزموونی نییە**

کێشەکە سەرەتا پەیوەند بە سەرچاوەکانی مەئریفەیەکی مێتافیزیکیەوە بەندە بە تێگەکەی ئەو خۆیەوە، واتا ناشێت ئەو سەرچاوانە ئەزموونی بن، کەواتە هەرگیز نابێت پرنسیپەکانی (کە بێگومان نەک تەنیا ڕێساکانی، بەڵکو هەروەها تێگە بناغەییەکانیشی سەر بەوانن) لە ئەزموونەوە وەرگیرابن، ئاخر ئەو گەرەک نییە مەئریفەی فیزیکی بێت، بەڵکو گەرەکە مەئریفەی مێتافیزیکی بێت، واتا خۆی لەوبەر ئەزموونەوە ببینێتەوە.

**بەڵام گەر مەئریفەی میتافیزیکی هەبێت، ئەوا ناشێت شرۆڤەیی بێت، واتا ناشێت تەواو هەڵهێنجەرانە لە گریمانەی دراوەوە بەگوێرەی یاسای دژبێژی وەك دەرەنجام ببرێتەوە، بەڵکو دەبێت پێکهێنراو بێت. بۆ نموونە لە لایەك بڕیارە ئەزموونیەکان کە ئاپریۆری نین، پێکهێنراون، لە لایەکی دی بڕیارە ماتماتیکیەکان کە شرۆڤەیی نین، پێکهێنراون، چونکە پێویستیان بە لێڕوانینە و سەرەڕای ئەمە کارەکتەرێکی ئاپریۆرییان هەیە.**

مەئریفەی مێتافیزیکی دەبێت بەڕوونی بڕیاری ئاپریۆری لەخۆبگرێت. تایبەتمەندیی سەرچاوەکانی داوای ئەمە دەکات. ئاشکرایە تەنیا بڕیار پێویستی بە سەرچاوەیەکە کە ئەو خۆی دەیەوێت، یان تەنیا بڕیار دەشێت بەگوێرەی فۆرمە لۆگیکیەکەی بە چەشنێک بێت کە ئەو خۆی دەیەوێت. سەرەڕای ئەوە بڕیارەکان جیاوازن: بەگوێرەی ناوەڕۆک کە بەهۆیەوە ئەوان یان تەنیا روونکەرەوەن و هیچ شتێک نادەنە پاڵ ناوەڕۆکی مەئریفە، یان فراوانکەرن و مەئریفەی دراو گەورەتر دەکەن. دەشێت ئەوانەی یەکەم ناوبنرێن بڕیاری شرۆڤەیی، ئەوانەی دووەم بڕیاری پێکهێنراو (سینتێزی).
بڕیارە شرۆڤەییەکان تەنیا ئەوە لە هەڵگیراودا دەبێژن کە لە تێگەی بکەردا بەڕاستی هزرێنراوە، جا گەرچی بێگومان هێندە ڕۆشن و بە هەمان ئاگایی نەهزرێنراوە. گەر من ببێژم: سەرجەم جەستەکان کشاون، ئەوا من بە کەمترین شێوە ئەو تێگەیەم فراوان نەکردووە کە بۆ من جەستە هەمە، بەڵکو تەنیا شیتەڵم کردووە، ئەویش بەوە کە کشانی ئەو تێگەیە بەڕاستی پێش بڕیارەکە هزرێنراوە، جا گەرچی بە زارەکی دەرنەبڕراوە. کەواتە بڕیارەکە شرۆڤەییە. بە پێچەوانەوە ڕستەی: هەندێک جەستە قورسن، لە هەڵگیراودا شتێک لەخۆدەگرێت کە لە تێگەی گشتیی جەستەدا بەڕاستی ناهزرێنرێت، کەواتە مەئریفەکەی من گەورەتر دەکات، ئەویش بەوە کە شتێک دەداتە پاڵ تێگەکەی من و لەبەر ئەم هۆیە دەبێت ئەم بڕیارە ناوبنرێت پێکهێنراو.
سەرجەم بڕیارە شرۆڤەییەکان بەتەوای بەندن بە یاسای دژبێژییەوە و بەگوێرەی سروشتیان مەئریفەی ئاپریۆرین، جا گەر تەنانەت ئەو تێگانە کە کەرەسەی (ماتەریی) ئەوانن، ئەمپیری بن یان نەبن. ئاخر لەبەر ئەوەی هەڵگیراوی بڕیارێکی ئەرێنیی شرۆڤەیی پێشتر لەنێو تێگەی بکەردا دەهزرێنرێت، ئەوا نەشیاوە هەڵگیراوەکە بەبێ دژبێژیکردنی نەرێنی بکرێت، هەروەها پێچەوانەکەی لە بڕیارێکی شرۆڤەیی بەڵام نەرێنیکەردا، بە زەرووری لەبارەی بکەر نەرێنی دەکرێت، ئەمەش بەگوێرەی یاسای دژبێژی. ڕستەکانی: «هەموو جەستەیەک کشاوە« و «هیچ جەستەیەک نەکشاو نییە«، سووک و ئاسان لەم چەشنەن.
هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە بڕیارە شرۆڤەییەکان ئاپریۆرین، جا گەرچی بێگومان تێگەکانیان ئەمپیرین، بۆ نموونە: زێڕ میتالێکی زەردە. ئاخر بۆ ئەوەی من ئەمە بزانم، من هیچ ئەزموونێکی دیکەم پێویست نییە جگە لەو تێگەیە کە من بۆ زێڕ هەمە، تێگەکەش ئەوە لەخۆدەگرێت کە: ئەم جەستەیە زەرد و میتالە. ئەمە بریتی بوو لە تێگەکەی من، منیش بۆم نەبوو هیچی دی بکەم جگە لەوە کە ئەم تێگەیە دابەشێنم بەبێ ئەوەی من لە دەرەوەی بۆ شتی دی بڕوانم.

بڕیاری پێکهێنراو هەن بە ئاپۆستەریۆری کە سەرچاوەیان ئەزموونییە، بڕیاری پێکهێنراوی دیکە هەن کە بە ئاپریۆری جەختن و لە زەینی پەتی و ئاوەزەوە سەرهەڵدەدەن، بەڵام هەردووکیان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە هەرگیز ناشێت ئەوان بەگوێرەی ڕێسای شرۆڤە (ئانالیزیس)، واتا بەگوێرەی یاسای دژبێژی، بێنەئاراوە. ئەوان پێویستیان بە پرنسیپێکی تەواو جیاواز هەیە، جا گەرچی دەبێت ئەوان لە هەر ڕێسایەکەوە هەردەم بەگوێرەی یاسای دژبێژی وەک دەرەنجام ببرێنەوە. ئاخر نابێت هیچ شتێک پێچەوانەی ئەم ڕێسایە بێت، جا گەرچی بێگومان نەشیاوە هەموو شتێک لەوەوە وەک دەرەنجام ببرێتەوە. من دەمەوێت سەرەتا بڕیارە پێکهێنراوەکان پۆلێن بکەم.

١. بڕیارە ئەزموونییەکان هەمیشە پێکهێنراون. ئاخر شتێکی سەیر دەبێت گەر بڕیارێکی شرۆڤەیی پەیوەند بە ئەزموونەوە بینابکرێت، چونکە من بۆم نییە لە چێکردنی بڕیارەکەدا لە تێگەکەم تێبپەڕم، کەواتە من بۆ ئەوە پێویستم بە شایەتیی ئەزموون نییە. کاتێک دەبێژین جەستەیەک کشاوە، ئەوا ئەم دەربڕینە بڕیارێکە کە بە ئاپریۆری جەختە و بڕیاری ئەزموونی نییە. ئاخر پێش ئەوەی من ڕووبکەمە ئەزموون، من سەرجەم مەرجەکانم بۆ بڕیارەکەم لەنێو تێگەکەدا هەیە، من دەتوانم لێوەی هەڵگیراوەکە بەگوێرەی یاسای دژبێژی دەربکێشم و بەو ڕێیەشەوە هاوکات بەئاگابێم لە زەرورەی بڕیارەکە، زەرورەیەک کە هەرگیز ئەزموون فێرمی ناکات.

٢. سەرجەم بڕیارە ماتماتیکیەکان پێکهێنراون. پێدەچێت دابەشێنەرانی ئاوەزی مرۆڤ هەتا ئێستا دەرکیان بەم پرنسیپە نەکردبێت، بەڵێ تەنانەت دژی سەرجەم بۆچونەکانیان بێت، جا گەرچی بەبێ شیمانەی دژبێژیکردن جەختە و وەک سەرەنجامی ئەمەش زۆر گرنگە. ئاخر لەبەر ئەوەی مرۆ وایدادەنا کە دەرەنجامەکانی ماتماتیکیەکان پێکڕا لەسەر یاسای دژبێژی دەڕۆن (ئەوە کە سروشتی هەموو جەختییەکی بەڵگەنەویست (ئاپۆدیکتی) داوای دەکات)، ئیدی مرۆ قەناعەتی بە خۆی هێنا کە هەروەها ڕێساکانیش لە یاسای دژبێژییەوە دەناسرێن، بەڵام ئەوان لەمەدا زۆر بەسەهوودا چوون. بێگومان دەشێت بەگوێرەی یاسای دژبێژی لە بڕیارێکی پێکهێنراو تێبگەین، بەڵام ئەمە نەک لەخۆدا، بەڵکو ئەمە تەنیا کاتێک دەشێت گەر بڕیارێکی دیکەی پێکهێنراو وەک پێشمەرج دابنرێت کە لێوەی پاشان ئەو وەک دەرەنجام شیاوی بردنەوەیە.

سەرەتا پێویستە تێبینییەک بدرێت: بڕیارە (هـزردۆزە) بنەڕەتیە ماتماتیکیەکان هەردەم بڕیاری ئاپریۆرین و ئەزموونی نین، چونکە ئەوان زەرورەیان لەگەڵدایە کە ناشێت لە ئەزموونەوە وەرگیرابێت. بەڵام ئاساییە گەر مرۆ ئەم تێڕوانینەم لێوەرنەگرێت، گەر ئەوە بکرێت، ئەوسا من پرنسیپەکەم تەرخان دەکەم بۆ ماتماتیکی پەتی، کە تێگەکەی هەر لە سەرەتاوە ئەوەش پێشان دەدات کە ئەو مەئریفەی ئەزموونی لەخۆنەگرتووە، بەڵکو تەنیا ئاپریۆریانە مەئریفەی پەتیی لەخۆگرتووە.

سەرەتا گەرەک بوو وادابنرێت کە بڕیاری (٧+٥=١٢) تەنیا بڕیارێکی شرۆڤەییە کە لە تێگەی کۆی حەوت و پێنج بەگوێرەی یاسای دژبێژی دەکەوێتەوە. بەڵام گەر مرۆ وردتر بڕوانێت، ئەوسا بۆی دەردەکەوێت کە تێگەی کۆی ٧ و ٥ هیچی دی جگە لە یەکێتیی هەردوو ژمارەکە لەنێو یەک تاکە

ژمارەدا لەخۆناگرێت، لێرەشدا بە هیچ شێوەیەک مرۆ لەوە ناهزرێت، داخۆ ئەم ژمارەیە چی بێت کە هەردووکیانی کۆکردۆتەوە. تێگەی دوازدە بە هیچ شێوەیەک بەو رێیەوە نەهزرێنراوە کە من بێم تەنیا لەو یەکخستنەی حەوت و پێنج بهزرێم، هەروەها، من چەند زۆر تێگەکەی خۆم لەمەڕ کۆیەکی شیاوی بەو چەشنە دابەشێنم، من هێشتا هەر لەو دابەشاندنەدا دوازدە نابینمەوە. مرۆ دەبێت لەم تێگانە تێپەڕبکات، ئەویش بە یاریدەی لێڕوانین کە پەیوەندی دەکات بە یەکێکیانەوە، بۆ نموونە بە پێنج پەنجەکەی خۆیەوە یان (وەک زێگنەر لە ئەریتمێتیکەکەیدا دەیکات) بە پێنج نوقتەوە، ئەوجا هەنگاو بە هەنگاو یەکەکانی پێنجی دراو لە لێڕوانیندا دەخاتە پاڵ تێگەی حەوت. کەواتە مرۆ بەڕاستی بەڕێی بڕیاری (١٢=٥+٧) پەرە بە تێگەکەی خۆی دەدات و تێگەیەکی نوێ کە لە تێگەی یەکەمدا بە هیچ شێوەیەک نەهزرێنرابوو، دەخاتە پاڵ تێگەی یەکەم، کەواتە بڕیاری ئەریتمێتیکی هەردەم پێکهێنراوە. ئێمە باشتر لەمە تێدەگەین گەر ژمارەی گەورەتر وەربگرین. لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێت، کە تا چەند ئێمە بە کەیفی خۆمان ئەمدیو و ئەودیو بە تێگەکەمان بکەین، هێشتا هەر گەر هانا بۆ لێڕوانین نەبەین، ئەوا ناتوانین ئەو کۆیە بە دابەشاندنی تێگەکان بدۆزینەوە.

بە هەمان شێوە هیچ ڕێسایەکی جیۆمەتریی پەتی شرۆڤەیی نییە. بڕیاری (هزردۆزی) وەک: ڕاستەهێڵی نێوان دوو پنت کورتترین هێڵە، تەنیا بڕیارێکی پێکهێنراوە، چونکە تێگەی من لەمەڕ ڕاستەهێڵ قەوارەیەک لەخۆناگرێت، بەڵکو تەنیا چۆنێتییەک لەخۆدەگرێت. کەواتە تێگەی «کورتترین» بەتەواوی دێتە پاڵی و نەشیاوە بە دابەشاندن لە تێگەی ڕاستەهێڵەوە وەک دەرەنجام دەربکێشرێت. کەواتە پێویستە لێرەدا هانا بۆ لێڕوانین ببرێت و تەنیا ئەوە کە پێکهێنان دەشێنێت.

لایەنی کرۆکی و جیاوازی مەئریفەی ماتماتیکیی پەتی لە هەموو مەئریفە ئاپریۆریەکانی دی ئەوەیە کە ئەو هەرگیز نابێت بە تێگە، بەڵکو دەبێت هەردەم بە چێکردنی (کۆنستروکسیۆنی) تێگەکان ڕەوتێک وەربگرێت. کەواتە لەبەر ئەوەی ئەو دەبێت لە بڕیارەکانیدا لە تێگەی ئەو شتە تێپەڕبکات کە لێڕوانینی پەیوەندیکەر بە شتەکەوە لەخۆی گرتووە، ئەوا هەرگیز ناشێت و نابێت بڕیارەکانی بە دابەشاندنی تێگەکان، واتا بە شرۆڤەیی، سەرهەڵبدەن، هەربۆیە پێکڕا پێکهێنراون.

بەڵام من خۆم پێناگیرێت تێبینییەک لەسەر ئەو زیانە بدەم کە پشتگوێخستنی ئەم ڕەچاوە وەک سانا و بێواتا دیارە بە فەلسەفەی گەیاند. کاتێک هیوم هەستی بەو پیشەیە کرد کە شایانی فەیلەسوفێکە و هەوڵی دا دیدی خۆی ئاڕاستەی سەرجەم کایەی مەئریفەی پەتیی ئاپریۆری بکات، واتا کایەیەک کە زەینی مرۆڤ باوەڕدەکات لەنێویدا خاوەنی سامانی زۆر بێت، کەچی ئەو لەو هەوڵەیدا بێ لێهزرین تەواوی بەشێکی بەواتای لێقرتاند کە ماتماتیکی پەتییە، ئەوەشی لەو بۆچوونەوە کرد کە گۆیا سروشتی ئەو، یان با بڵێین دەستووری دەوڵەتەکەی، بەندە بە پرنسیپی تەواو جیاوازەوە، واتا بەندە بە یاسای دژبێژییەوە، لێرەشدا بڕیارەکانی ئەوها ورد و گشتی یان بە ناولێنان لەو شێوەیەدا دانەبەشاند کە من ئێستا دەیکەم. بەڵام ئەو کارەی هیوم کردی، تا ڕادەیەکی ئەوتۆ بڕی کرد کە هەروەک ببێژێت: ماتماتیکی پەتی تەنیا بڕیاری شرۆڤەیی، بە پێچەوانەوە مێتافیزیک بڕیاری پێکهێنراو

بە ئاپریۆری لەخۆدەگرێت. بەڵام هیوم لەمەدا زۆر بەسەهوودا چوو، ئەم سەهووەش سەرەنجامی زیانبەخشی بۆ سەرجەم تێگەیشتنی خودی ئەو هەبوو. ئاخر گەر هیوم ئەم کارەی نەکردایە، ئەوسا دەیتوانی پرسیارەکەی سەبارەت بە سەرچاوەی بڕیارە پێکهێنراوەکانمان زۆر لە تێگە مێتافیزیکیەکەی خۆی بۆ کاوساڵێتی (هۆئەنجامی) تێبپەڕێنێت و تەنانەت دەشیا پەرەپێبدات بۆ پرسیار لەبارەی شیمانەی ماتماتیک بە ئاپریۆری. ئاخر ئەو پێویست بوو ئەمیش وەک پێکهێنراو قبووڵ بکات. گەر ئەمەی بکردایە، ئەوسا هەرگیز نەیدەتوانی بڕیارە مێتافیزیکیەکانی تەنیا لەسەر زەمینەی ئەزموون بینا بکات، ئاخر ئەوسا دەبوو بڕیارەکانی ماتماتیکی پەتیش بخاتە ژێر ڕکێفی ئەزموونەوە، بەڵام ئەو زۆر ژیر بوو و بۆیە نەدەشیا کارێکی بەو چەشنەی لێبووەشێتەوە.

٣. بڕیارە مێتافیزیکیە ڕاستەقینەکان پێکڕا پێکهێنراون. مرۆ دەبێت ئەو بڕیارانە کە سەر بە مێتافیزیکن، لە بڕیاری ڕاستەقینەی مێتافیزیکی جیابکاتەوە. ژمارەیەکی زۆر لە بڕیارەکانی یەکەم شرۆڤەیین و تەنیا دەسوێژێکن بۆ بڕیاری مێتافیزیکی کە پێکهێنراون و مەبەستی زانستیش تەنیا و تەنیا ڕوو لەوان دەکات. بۆ نموونە بڕیاری: سەرجەم ئەوە کە لە شتەکاندا جەوهەرە، سرەوتووە، ئەمە بڕیارێکی پێکهێنراوە و لە بنەڕەتدا مێتافیزیکییە.

**بە پرسیاری ڕەخنەیی لەبارەی شیمانە بۆ هەبوونی مێتافیزیك کۆتایی دەهێنرێت بە دۆگماتیزم و گومانگەرایی**

بێزاریمان لە دۆگماتیزم کە هیچمان فێرناکات، هاوکات لە گومانگەرایی کە هەرگیز گفتی هیچمان پێنادات، تەنانەت گفتی دۆخی ئارامیی نەزانییەکی ڕەواشمان پێنادات، ئەوجا داواکاریی گرنگییەکەی مەئریفە کە پێویستمان پێیەتی، هەروەها بێمتمانەییمان بەهۆی ئەزموونی درێژخایەنی هەر مەئریفەیەکەوە کە باوەڕ دەکەین هەمان بێت یان لەژێر ناونیشانی ئاوەزی پەتیدا دێتە بەردەممان، بۆ ئێمە لەمانەوە تەنیا پرسیارێکی ڕەخنەیی دەمێنێتەوە کە دوای وەڵامدانەوەی دەتوانین هەڵوێستی ئایندەییمان بنیاتبنێین: ئایا دەشێت مێتافیزیک ببێت؟

**ماتماتیکی پەتی و زانستی سروشتیی پەتی شیاوی گومانلێکردن نین و هەردووکیان بەندن بە بڕیاری پێکهێنراوی ئاپریۆرییەوە. بەڵام دەبوو بڕیارەکانی مێتافیزیکیش ئەوها بوونایە. پەیوەند بە ئەوانەوە پێویست ناکات بپرسین کە داخۆ ئەو بڕیارانە شیاو بن. بەڵکو تەنیا گەرەکە بپرسین کە چۆن ئەوان شیاون.**

خۆشبەختانە وا کەوتۆتەوە کە گەرچی ئێمە هەنوکە ناتوانین گریمانەی هەبوونی ڕاستەقینەی مێتافیزیک وەک زانست بکەین، سەرەڕای ئەوە دەتوانین گەشبینانە ببێژین کە مەئریفەی پێهێنراوی ئاپریۆری،

واتا ماتماتیکی پەتی و زانستی سروشتیی پەتی، بەڕاستی و دراوی هەن. ئاخر هەردووکیان بڕیاری ئەوتۆ لەخۆدەگرن کە تا ڕادەیەک ئاپۆدیکتیانە بەڕێی ئاوەزەوە جەختن، بەڵام تا ڕادەیەکی دی جەختن لەڕووی ئەو کۆکبوونە گشتییەوە کە مرۆ بە ئەزموون پێیگەیشتووە و سەرەڕای ئەوە وەک سەربەخۆ لە ئەزموون دەناسێنرێن. کەواتە ئێمە بەبێ ناکۆکی چەند مەئریفەیەکی پێکهێنراوی ئاپریۆریمان هەن، جگە لەوە ئێمە بۆمان نییە بپرسین کە داخۆ بشێت ئەوان ببن (ئاخر ئەوان بەڕاستی هەن)، بەڵکو تەنیا بۆمان هەیە بپرسین کە چۆن دەشێت ئەوان ببن، تاکو ئیتر بەم شیوەیە بتوانین لە پرنسیپی شیمانەی مەئریفەی دراوەوە هەروەها شیمانەی هەموو مەئریفەکانی دی وەک دەرەنجام ببەینەوە.
ئێمە لە سەرەوە جیاوازی گەورەی بڕیارە شرۆڤەیی و پێکهێنراوەکانمان بینی، توانیمان بەئاسانی لە شیمانەی بڕیارە شرۆڤەییەکان تێبگەین، چونکە ئەو شیمانەیە تەنیا پابەندی یاسای دژبێژییە. هەروەها شیمانەی بڕیاری ئاپۆستەریۆری، واتا ئەوە کە لە ئەزموونەوە چێدەکرێت، پێویستی بە ڕوونکردنەوەی تایبەتی نییە، چونکە خودی ئەزموون هیچی دیکە نییە جگە لە کۆکردنەوەی زنجیرەیی (واتا پێکهێنانی) دەرککردنەکان. کەواتە بۆ ئێمە تەنیا بڕیارە پێکهێنراوە ئاپریۆریەکان دەمێننەوە کە پێویستە بۆ شیمانەی هەبوونیان بگەڕێین یان لەو شیمانەیە بتوێژینەوە، چونکە دەبێت بەند بێت بە پرنسیپی جیاوازەوە لە یاسای دژبێژی.
بەڵام ئێمە لێرەدا بۆمان نییە سەرەتا بۆ شیمانەی ئەو جۆرە بڕیارانە بگەڕێین، واتا بپرسین کە داخۆ بشێت ئەوان ببن. ئاخر ئەوان هەن، تەنانەت بە جەختییەکی نەشیاوی گومانلێکردن بەڕاستی دراون، ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەو مێتۆدە کە ئێمە لەسەری دەڕۆین، گەرەکە شرۆڤەیی بێت، ئەوا ئێمە سەرەتا لەم بنەمایەوە دەستپێدەکەین: ئەو جۆرە مەئریفە پێکهێنراوەی ئاوەز کە بێگومان پەتییە، بەڕاستی هەیە. بەڵام پێویستە پاشان لە بناغەی ئەم شیمانەیە بتوێژینەوە و بپرسین، کە چۆن ئەم مەئریفەیە شیاوە، تاکو ئیدی بتوانین لە پرنسیپەکانی شیمانەی ئەوەوە مەرجەکانی بەکارهێنانی، هەروەها چێوە و سنوورەکانی ئەو بەکارهێنانە، دیاری بکەین. کەواتە ئەرکە ڕاستەقینەکە، دەربڕراو بە ڕوونییەکی تەواوەتی کە هەموو شتێک پێوەی بەندە، بریتییە لە:

### ئایا چۆن دەشێت بڕیارگەلی پێکهێنراو بە ئاپریۆری هەبن؟

تا چەند وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە نەشیاوی دەستبەرداربییە، هاوکات ئەوەندەش زەحمەتە، بەواتاترین هۆکاریش کە بۆچی مرۆ هەتا ئەمڕۆ هەوڵی وەڵامدانەوەی نەداوە، ئەوەیە کە هەرگیز هیچ کەسێک لەوە نەهزریوە داخۆ پرسیارێکی بەم چەشنە شیاوی کردن بێت، ئەوجا دووەم هۆکار ئەوەیە کە وەڵامدانەوەی ساتارکەری ئەم پرسیارە لێهزرینێکی بەردەوامتر و قووڵتر و پڕئەرکتری لە فراوانترین ئیشی مێتافیزیک پێویستە، ئیشێک کە لە یەکەم بڵاوبوونەوەیدا گفتی نەمریی بە نووسەرەکەی دا. هەروەها هەموو خوێنەرێکی تێگەیشتوو، گەر بە جدی لەو شێوەیەدا لەم ئەرکە بهزرێت کە خودی

ئەرکەکە داوای دەکات، دەبێت سەرەتا، سڵەمێنراوە بە ئاڵۆزییەکەی، بە نەشیاوی چارەسەرکردنی دابنێت، لێرەشدا گەر بەڕاستی مەئریفەگەلی پەتیی پێکهێنراو بە ئاپریۆری نەبوونایە، ئەوسا ئەو بە تەواو مەحاڵی دادەنا، لەو شێوەیەدا کە بەڕاستی بەرەو ڕووی دەیڤید هیوم بۆوە. هیوم بێگومان بە هیچ شیوەیەک پێشبینی پرسیارەکەی لە گشتێتییەکی بەم چەشنەدا نەکرد، لەو شێوەیەدا کە چۆن لێرە ڕوودەدات، و دەبێت ڕووبدات گەر وەڵامدانەوەکە بۆ سەرجەم مێتافیزیک بەبایەخ بێت. ئاخر ئەو پیاوە هزرتیژە گۆتی: گەر تێگەیەکم پێدرابێت، ئیدی چۆن دەشیت من لەو تێگەیە تێبپەڕم و تێگەیەکی دیکەی پێوەگرێبدەم کە لەنێو تێگەکەی یەکەمدا نییە، ئەوەش بە چەشنێک بکەم کە هەروەکو ئەم تێگەیەیان بەزەرووری سەر بەوەی یەکەم بێت؟ تەنیا ئەزموون پێی دەکرێت ئەو جۆرە گرێدانانە بخاتە بەردەستمان (ئەو بەم شێوەیە لەو ئاڵۆزییەوە کە بە مەحاڵی دادەنا، دەرەنجامی بردەوە) و سەرجەمی ئەو بەناو زەروورەیـە، یان، ئەمیش هەر هەمان شتە، سەرجەمی ئەو مەئریفەیە کە بە ئاپریۆری دادەنرێت، هیچی دیکە نییە جگە لە خووگرتنێکی درێژخایەن بەوەوە کە شتێک بە ڕاست دابنرێت و بەمەش زەروورەی سەبژێکتی بە زەروورەی ئۆبژێکتی دابنرێت.
کەواتە هەتا مێتافیزیکییەکان پرسیاری «ئایا چۆن مەئریفە پێکهێنراوەکان بە ئاپریۆری دەشێن؟» قایلکەرانە وەڵامنەدەنەوە، ئەوا هەموویان سووک و ئاسان و بەگوێرەی یاسا بۆ ماوەیەکی کاتی لە کارەکانیان خانەنشین کراون.
کاتێک ئێمە ئێستا ڕووەو ئەم چارەسەرە هەنگاو دەنێین، ئەمەش بێگومان بە مێتۆدی شرۆڤەیی، لێرەشدا گریمانە دەکەین کە ئەو مەئریفانە لە ئاوەزی پەتییەوە بەڕاستی هەن، ئەوا تەنیا دەتوانین پشت بە دوو زانستی مەئریفەی تیۆریانە ببەستین (ئێمە لێرە تەنیا لەوان دەدوێین) کە بریتین لە ماتماتیکی پەتی و زانستی سروشتیی پەتی، چونکە تەنیا ئەمان دەتوانن بابەتەکانمان لە لێڕوانیندا بەڕوونی پێشان بدەن، بۆیە گەر بۆ نموونە لەواندا مەئریفەیەک بە ئاپریۆری هەبێت و بتوانێت ڕاستی یان یەکگرتنەوەی مەئریفەکە لەتەک ئۆبژێکتدا، ئەمەش بە واتای بتوانێت بە کۆنکرێت کردەکێتییەکەی (ڕاستەقینەکەی) پێشان بدات، ئەوسا دەتوانین لێوەی بە ڕێگەی شرۆڤەیی ڕووەو بناغەی شیمانەی ئەو مەئریفەیە هەنگاو بنێین.

**پەڕینەوە لە ڕوونکردنەوەی بڕیارە ئاپریۆرییە مسۆگەرکراوە پێکهێنراوەکانەوە لە ماتماتیک و زانستی سروشتیی پەتێدا ڕووەو ئەو پرسیارە کە چۆن دەشێت مێتافیزیک وەك زانست بێت. بەڵام بۆ ئەمە پێویستە سەرەتا خۆ بەو پرسیارەوە خەریکبکرێت کە چۆن مێتافیزیك وەك هابیتوسی (توانستی) سروشتی دەشێت (ئاخر ئەو وەك ئەمەش هەیە و گەرەکە قبووڵ بکرێت).**

بەڵام بۆ ئەوەی لەم مەئریفە پەتییە ئاپریۆرییە ڕاستەقینە و هاوکات بناغەڕێژراوانەوە سەربکەوین ڕووەو شیمانەی مێتافیزیکێک وەک زانست لەو شێوەیەدا کە ئێمە هەوڵی بۆ دەدەین، پێویستە ئەو

شتە كە پاڵهێزی هەر مێتافیزیكێكە، ئەوەش بێگومان وەک مەئریفەی ئاپریۆری كە بە سروشتی دراوە و لە ڕاستییەكەیدا جارێ مسۆگەر نییە، بەڵام بناغەی ئەو مێتافیزیكەیە كە وەک باوە بەبێ توێژینەوەی ڕەخنەیی لە شیمانەكانی هەبوونی كاری تێدا دەكرێت و ناو دەنرێت مێتافیزیک، بەكورتی پێویستە جارێ لەژێر پرسیارە سەرەكییەكەماندا لە هابیتوسی سروشتیی ئەو بۆ بوون بە زانستێكی بەو چەشنە تێبگەین. بەم شێوەیە پرسیارە سەرەكییە ترانسێندێنتالەكە بەسەر چوار پرسیاردا بەش دەبێت و بەدووی یەكدا وەڵامیان دەدەینەوە.
١_ ئایا چۆن ماتماتیكی پەتی دەشێت؟
٢_ ئایا چۆن زانستی سروشتیی پەتی دەشێت؟
٣_ ئایا چۆن مێتافیزیک بەگشتی دەشێت؟
٤_ ئایا چۆن مێتافیزیک وەک زانست دەشێت؟

**فەرهەنگۆك**

تێبینی:
١. پێویست نییە وەرنەگێڕانی هەندێک تێگەی تایبەتیی كانت وەک سەیر بنوێنێت، ئەوان نە ئەڵمانین و نە ئەڵمانیی كانتن، بەڵكو بەرەهایی كانتین، سۆزمەندانە ببێژین: بریتین لە تێگە جادووییەكانی فەلسەفەكەی، هەروەها دەتوانین سەرلەنوی سۆزمەندانە ببێژین: وەرگێڕ دڵی نایەت تەرجومەیان بكات. هەروەها زۆر هزرمەندی ئەرەب كە ئەمڕۆ خۆیان بە كانتەوە خەریک دەكەن، پێدەچێت لەو ئاگاییەوە كە لەسەرەوە پێشانمان دا، خۆیان لە وەرگێڕانی تێگەكانی ئەو بەدووربگرن و بەمەش چەوتەهەوڵێ ئەرەبیخوازی كەسانی پێش خۆیان ڕاست بكەنەوە، واتە هەڵەی ڕشتنی ئەو ئاوە كە ئەمڕۆش زۆر توێژەر یان هەوڵدەری فەلسەفەیی لای خۆمان پێی لێدەخشێنن.
٢. ئەم فەرهەنگۆكە بەگوێرەی ئەلفبای كوردی_لاتینی ڕێكخراوە.
ئاپۆدیكتی: چواندن بێ هیچ شیمانەیەكی گومانلێكردن. بۆ نموونە لە لۆگیكدا گۆتە هەیە كە نەشیاوە پێچەوانەكەی ڕاست بێت.
ئاپۆستەریۆری: پاش ئەزموون. بۆ نموونە گۆتە هەیە كە پاش ئەزموون (دەرككردن) سەرهەڵدەدات.
ئاپریۆری: پێش ئەزموون. لای كانت بڕیاری ئاپریۆری ئەو جۆرەیە كە بەدەر لە ئەزموون سەرهەڵدەدات و تەنانەت پێشمەرجی ئەزموونە، كەواتە دەشێت ئەزموون لەو جۆرە بڕیارانەوە وەک دەرەنجام ببرێتەوە.
بڕیار: (یان حوكم) ڕستەی لۆگیكییە كە لە بكەر و هەڵگیراو پێكدێت. بۆ نمونە: گوڵەكە بۆنخۆشە. گوڵەكە بریتییە لە بكەر، بۆنخۆش بریتییە لە هەڵگیراو، هەردووكیان بە ڤێربی ناتەواوی «ە« پەیوەند كراون.
فەلسەفەی مەزندەیی: بەرانەر «تیۆرییا»ی گریكی دانراوە. تیۆرییا واتا ڕوانین یان ڕەچاوكردن،

هەوڵی مەئریفەیی ڕوانینە لە بوونەوەرە سەرمەدیەکان، لە کۆتاییدا لە کرۆکی خودایەتی. لای کانتیش هەمان واتای هەیە: مەئریفەیەکی تیۆریانە کە مرۆ ناتوانێت بە ئەزموون پێی بگات.
هابیتوس: شتێک وەک دیاردە لەگۆڕی بێت، بۆ نموونە بڕوابوونی مرۆڤ بە خودایەتی وەک دیاردەی سروشتی. هەڵوێستی ناخەکیی مرۆڤ. توانستی سروشتی.
ئەریتمێتیک: ئەو بەشەی ماتماتیکە کە بە ژمارە و ژماردنەوە خەریکە.
کاوساڵێتی: کاوزا بەواتای هۆکار. تێگەیەکە بۆ هەبوونی پەیوەندی لە نێوان هۆ و ئەنجام یان کردار و پەرچەکرداردا.
ترانسێندێنتال: واتای فەرهەنگی: پەڕینەوە، پەڕییەوە. واتای تێگەیی: لەوبەر ئەزموونەوە، بەدەر لە ئەزموون. لای کانت بەواتای: پێشمەرج بۆ شیمانەی هەبوونی ئەزموون. مەئریفەی ترانسێندێنتال خۆی بە بابەتەکانەوە خەریک ناکات، بەڵکو بە جۆری مەئریفەی بابەتەکانەوە لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەو مەئریفەیە بە ئاپریۆری، لە پێش ئەزموونی یان دەرککردنی بابەتەکانی نێو جیهانەوە هەیە. جگە لەوە واتاکەی جیاوازە لە واتای تێگەی «ترانسێندێنت». ئەمیان بەواتای: نەشیاوی زانین. کە دەڵێین جیهان ترانسێندێنتە، مەبەستمان لەوەیە کە ناتوانین لەبارەی ئەو بزانین.
یاسای دژبێژی: بە واتایەکی دی: یاسای سێیەم بەدەرکەر، لە لۆگیکدا ڕوودەکاتە گوتەیەک و نەرێنیکردنی. ئەریستۆتێلیس بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: ناشێت هەمان شت لە هەمان ڕووەوە هەمان شت بیگرێتەوە و نەیگرێتەوە. ناشێت شتێک هاوکات هەبێت و نەبێت. کەواتە لە نێوان هەبوون و نەبوونی شتێکدا سێیەمێک نییە.

**سەرچاوە**

تێبینی:
ئەم ئیشە ڕەخنەییانەی کانت کە هەوڵ دەدەین بە زنجیرە لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاویان بکەینەوە، کورتکراوەی ئیشەکانی ئەون بە مەبەستی ڕەخساندنی دەرفەتی دیدێکی گشتی بۆ سەرجەم ئیشەکەی کە ئەنجامدراوە لە:
Kant. Ausgewählte Schriften. Die Grundlagen des kritischen Denkens. Hrsg. Von Gerhard Stenzel. Bearbeitung und Einleitung: Walter Del-Negro. Bertelsmann Lesering. ١٩٥٨.

# تێۆدۆر ئادۆرنۆو دیالەکتیکی ڕۆشنگەری

نووسینی: د. بهرام مقدادی
و. لە فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد

لە نێوان ئەو هزرڤان و کەڵە بیرمەندانە کە لە دەیە سەرەتاییەکانی سەدەی بیستەمدا لە بیرۆکەی (ئەقڵخوازی - ئاوەزباوەڕی) ئاوڕپاندا و خستیانە بەر ڕەخنە و ڕاژەوە، تاقمێک بیرمەندی ئاڵمانی هەبوون کە کارەیلی فیکری، زانستگایی و توێژینەیی خۆیان لەگەڵ یەکدا ڕێخستبوو. ئەوان بەر لەوەی کە لە دابونەریتی ڕەخنەی «مارکس» سوودیان ئەگرت، بەڵام بە پێچەوانەیشەوە بە ڕەخنەگرتن و نافەرمانی لە (ئەقڵ باوەڕی- ئەقڵخوازی) مارکس ناکۆکی خۆیان نیشاندەدا و لەم نێوانە لە زۆربەی دەسکەوتە سوودبەخشەکانی ئەندێشەی مۆدێرنیزم بەهرەمەندیش دەبوون. ئەم کۆمەڵە بیرمەندە ناودارە، ئەمڕۆکە بەناو نووسەران و هزرڤانانی قوتابخانەی فەلسەفی (فڕانکفۆرت) ئەژماردرێن، لەبەر ئەوەی کە



بهرام مقداری

زۆریان لە سەرەتای سەدەی بیستەم (سەرەتای سییەکان) یان لە زانستگای فرانکفۆرت سەرقاڵی وانە وتن بوون، یان لە گۆڤاری ئەم زانستگایە کە لەو چاخەدا ڕێخرابوو و سەرنووسەرەکەی «ماکس هۆرکهایمەر» بوو، لە بواری فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتیی و دەروونناسییەکان، وتار و ڕەخنەیان ئاراستە دەکرد. لە واقیعدا ئەم بیرمەندانە لە سەدەی بیستەم لە ڕیزی یەکەمی ئەو کەسێتییە ناوازانە بوون کە لە گۆڕەپانی فیکر و تێڕامان تینێکی بە هێزیان بە فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتیی و تەنانەت زانستە سیاسییەکان بەخشیبوو و لەو لایشەوە لە هیچ جۆر ڕەخنەگرتنێک لەم دەڤەرە باکیان نەبوو.
هەروا کە ئاماژەی پێدرا، سەرنووسەری ئەم گۆڤارە کەسێک بوو بە ناو « ماکس هۆرکهایمەر» کە هاوڕێ و هاوکاری ئێجگار نزیکی « تێۆدۆر ئادۆرنۆ» Theodor Adorno)))) لەم زانسگایەدا بوو. « ئادۆرنۆ » کە یەکێک لە بیرمەندە هەرەمەزنەکانی سەدەی بیستەم بوو، شانی دەدا لە شانی کەڵە بیرمەندانێک وەک «جان پۆل سارتەر١» و لەم گۆڤارە فەلسەفیی و ڕۆشنبیرییە لە چەندین دەڤەری جۆراوجۆر وتار و ڕەخنەی فەلسەفی، دەروونناسی و ڕەنگە لە هەموو گرینگتر جوانیناسی یان ئیستێتیکا ئاراستە دەکرد، بەڵام گرینگترین بەرهەمی ئەو کە بە هاوبیری و دووقۆڵی هۆرکهایمەر بە ئاکامی گەیاندووە، کتێبێکە بەناو «دیالەکتیکی ڕۆشنگەری» کە ئەم پەرتووکە لەم پەنجا ساڵەی دواییە، گرینگایەتییەکی سەیری پێدراوە و بەردەوام بووەتە جێگای تێڕامان و تێفکرینی بیرمەند و هزرڤانە ئەمڕۆییەکان.
ئەم پەرتووکە، بەرهەمێکە لێوانلێو لە تاڵی و تاتێل و بێ هیوایی، چوونکا هەردوو نووسەری ئەم کتێبە بە چەشنێکی هاوتا خوازیاری بیرۆکە فەلسەفییەکانی «ئارتوور شۆبنهاوەر» بوون و ئەو کاتەی کە لەمەڕ کۆمەڵگەی مۆدێرن دەکەونە ئاخافتن زایەڵەیەک لە وتە بێ دەرەنجام و بێ هیواکەی ئەو هرزڤانە دێتە گوێی بیسەر. (دیالەکتیکی ڕۆشنگەری) لەلایەکیترەوە دەسکەوتی ساڵە تار و ڕەشەکانی شەڕی دووهەمی دوونیا بوو.
بەڕای «ئادۆرنۆ» ئەو ئاوەزگەرییە کە ئەقڵخوازی لە سوود وەرگرتن دەیبینێت، ڕۆژگارێک هەبوو کە لافی سەربەستی مرۆڤی لێدەدا و دەیویست لە خەباتگێڕی لەگەڵ داب و نەریتەکان بگاتە ئۆستوورەگەلێکی تازە، بەڵام هەر خۆی بووە داب و نەریتێکی تازە

و لەئەنجامدا، ستایلێکی بەربڵاوتر و پان و پۆڕتری لە دەسەڵاتداری خولقاند. لەڕوانگەی «ئادۆڕنۆ»، مەبەستی ئەقڵی ئامێری (ئاوەز ئامرازی) ئەوەیە کە بگاتە لایەنێک کە بەسەر سرووشت دەسەڵات و زاڵبوونی خۆی بسەلمێنێت. پێشکەوتنی مرۆڤ لەوەی کە بەسەر سرووشت زاڵ بێت، دیارە ئامانجێکی دژ بە مرۆڤایەتی لە پشتەوەیە و لە ئاکام دەگاتە دیلی و بەندەیی مرۆڤ لە بەرامبەر سەرمایە و هەروەها پەرەسەندنی بۆ سەرەودەرەی فاشیزم. ئاوەزگەری، هەڵقوڵاوی قەیران لە سەردەمی ئێستادایە. ئاوەزگەرەکان، هەوڵیان ئەدا کە مرۆڤ لە ئەندێشەی ئۆستوورەیی – ئایینی قوتارکەن، یان هەروا کە «نیتچە٢» وتبووی (خودا بکوژن)، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئاوەزگەری چووە خانەی ئەقڵ ئامێرییەوە، ئیدی نەیتوانی خۆی لە ئاستەنگە ئۆستوورەییەکان دەرباز بکات. تاکێتی، کە لە ڕۆژگاری پێشڤەچوونی وردەبورژوازی بە قودسیەت و پیرۆزی گەیشتبوو، بەرەبەرە بووە هێزێکی وێرانکەر و دژ بە مرۆڤایەتی. ئازادی، ئیدی مانای ڕزگاری مرۆڤی نەئەدا، بەڵکوو تەنها وەک چەمکێکی سیاسی نوشوستی هێنا و چەمکی کلتووریش هەتا ئەو ڕادەیە سووک بوو کە ناویان لێنابوو «فەن و سەنعەتی کەلتوور» .

«ئادۆڕنۆ» و «هورکهایمەر» لە پەرتووکی «دیالەکتیکی ڕۆشنگەری»، تیشک دەخەنە سەر ئەم پرسە سەرەکییە کە ئەقڵی ئامێرگەرایی لە چاخی ئەمڕۆ، هەر دەسکەوتێکی فەرهەنگی وەکوو مەتا و کاڵا دەبینێت. ئاسەواری هونەری و کلتووری، ئەگەرچی لافی سەربەخۆیی و خاوەن دەسەڵاتی لە بۆنەگەلی



بەرهەمهێنیان دەدەن، بەڵام لە ئەنجامدا، هەموویان بەرهەم هاتووی بازاڕن. فەرهەنگ لە واقیعدا، تەکنۆلۆجی و داهاتی بەهرەی ئەقڵخوازی بە کاردێنێت هەتا بتوانێت زاڵبوونی و دەسەڵاتداری سەرمایە پەرە بدات. ڕێخستنی سەرمایەدارانەی بەرهەم هاتن و چوارچێوە و سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەسەر کۆڵەکەی خاوەنیەتی شەخسی، لە واقیعدا ململانێ و کێبەرکێی و قازانج خوازی بە شوێنەوەیە و لەم دۆخە ناحەزە دیارە ئیمکانی وەدی هاتنی هێزە داهێنەرە زەینی و مەعنەوییەکان لە دەس دەچێت و زۆر بە سانایی بە فیڕۆ دەچن و هەرەس دەهێنن.

«ئادۆرنۆ» بە بیچم گرتن و گۆڕانی هۆگرییە دکتاتۆری و تۆتالیتەرەکان لە فەرهەنگدا زۆر هەستیار بوو و نیشانیدا کە چلۆن مرۆڤ، بە تەئسیر وەرگرتن لە میدیا گشتییەکان، ئیمکانی جیاکردنەوەی ئەقڵ و بێ ئەقڵی لەدەسداوە. بە تایبەت «ئادۆرنۆ» بە مۆسیقای جاز، ئەدەبی جەماوەری و عەوامانە وەک ڕۆمانە ئاسایی و ئەڤیندار و بێ گیر و گرفتەکان و هەروەتر ئاهەنگ و بەرنامە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنییەکان ئاماژە ئەکات کە چۆن زەینی خوێنەر و بیسەریان بە خۆوەوە سەرقاڵ کردووە و هیچ شتێکیان بۆ داهێنەرێتی و خەیاڵ و فیکر و ئەندێشە تەرخان نەکردووە. بەم چەشنە، ئەندێشە و تێفکرین لە زەینی مرۆڤی هاوچەرخ سڕیویانە و لەواقیعدا لەزەت و چێژ بردن لەو شوێنەیە کە لە بنەڕەتەوە ئەندێشە و داڵغەیەکی سەربەخۆ بوونی نەبێت. بەرهەمی هونەری، نەک بە هۆی پێکهاتی دەروونی، بەڵکوو تەنیا بە هۆی ناڤنیشان و ڕەمزە ساکارەکەی، فام دەکرێت و ڕوودەم لە هێز و تواناکانی هونەرمەند بێ هەواڵ دەمێنێت و تەنیا گوێی بۆ بەرهەمە ئاسایی و عەوامانەکان شل کردووە و بێ ئەوەی کە هۆش و گۆشی لە بەرهەمێکی گرینگ داچەقێنێت تەنیا وەختی خۆی بۆ بەرهەمە ئاساییەکان زەوتدەکات و هەر بەو شێوەیە خوو دەگرێت.

بەڕای «ئادۆرنۆ»، ئەم فەرهەنگە یەکێتییەکی خەیاڵی بەرهەم دێنێت و بە هەر لەونێک سەرکوتگەری مەیل و لەزەتە ڕاستەقینەکانی مرۆڤی هاوچەرخە. ئەم یەکێتییە، جیهانی ئەزموونی بە چەشنێکی درۆئینە لەگەڵ جوانیناسی (ئیستێتیکا) Aesthetics هاوشان دەکات .« ئادۆرنۆ» تەنانەت هونەری مۆدێرن، کە بەردەوام لە بەرانبەر هونەری جەماوەر و کۆمەڵایەتی لایەنگری لێدەکرد، لە کارکردە دەرەنجامی و دواییەکانی ئەم یەکێتییە بە شریک و هاوبەش دەژمێرێت و وای بۆدەچێت کە خۆڕاگربوونی هونەری مۆدێرن لە بەرانبەر گشتی خوازی درۆینەی کۆمەڵایەتی، ڕێگەکەی وا خوار کردووە و پێگەکەی وا سست و لاواز کردووە و تا ئەو ڕادەی وەلانراو و دوورخراو کردووە کە ئیدی ناتوانێت لە شوێنگەی هونەری بەرز و خاوەن هەڤیاز خۆی ڕابگرێت.

ڕوانگە و بیر و بۆچوونی «ئادۆرنۆ» لە چەمکی دیالەکتیکی (نێگەتیڤ)- دیالەکتیکێک کە ئیمکانی سازشتی تەواو ( reconciliation ( total)) وەک کارێکی خەیاڵی ڕەتدەکاتەوە، بۆ فەلسەفەی نوێ مارکسیستی گرنگایەتییەکی بونیادی و سەرەکی هەیە. هێڵی ڕەخنەگەری فەرهەنگی کە لە سەرانسەری بەرهەمگەلی

ئەو، بە تایبەت لە پەرتووکی (دیالەکتیکی ڕۆشنگەری) کە لە کتێبە بنەڕەتییەکانی سەدەی بیستەمە، دێتە ژمار و لە بەرهەمەکانی دیکەی ئەو لەمەڕ فەلسەفە و کۆمەڵناسیی مۆسیقا بەیان کراوە، هەر وایە. بیرۆکەی جوانیناسی ئادۆڕنۆ گرینگایەتییەکی سەرتر لە بەستێنی ئەم بەشەی تێدایە بە جۆرێک کە تاقمێک لە فەیلەسووفە هاوچەرخەکان ئەوەیان وەک خاڵی دەسپێکانە بۆ بەدواچوونەوە لە ڕۆڵی فەلسەفە بە چەشنێکی گشتی هێناوەتە ئارا.

هەستیاری«ئادۆڕنۆ» لەبۆ مەسەلەگەلی پەیوەندیار بەزمان- بۆ نموونە دژایەتییە «نیتچە»ییەکەی بە نیسبەت پێناسەی زاراوە ناسی —بە گەشی لە تاقمێک لە بەرهەمگەلە ساکارترەکەی وەک وتارەکانی بەسەر دێڕی (لایەنەکانی کۆمەڵناسی) چاپکراوی ساڵی ١٩٥٦ و گوتاربێژییە سەرەتاییەکانی کە بەناو (زاراوە ناسینی فەلسەفی) ناسراون، دەبیندرێت. ئەگەرچی ئەندێشەی «ئادۆڕنۆ» زۆر جێی گومانە، بەڵام لە نیهیلیزمی بێناوەرۆکی و سەرسەریی ئەندێشەی بەرپێکهاتەخوازیی کەوا دەردەکەوێت ڕوانگەکانی پێشبینی کردووە و لەویش بانتر هەنگاوی هەڵێناوە، مەودایەکی هەرە زۆری ڕەخساندووە.

«ئادۆڕنۆ» بێ گومان یەکێکە لە گرینگترین هزرڤانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت. ئەم بیرمەندە لەم قۆتابخانە بووەتە هێزێکی ناوجی هەرە گەورە نێوان «مارکسیزم٣» و قوتابخانە فەلسەفییەکانی دیکە و لەواقیعدا ئەندێشەکانی لە نێوان فەلسەفە و کۆمەڵناسیی و کۆڵینەوەی فەرهەنگیدا ئاو دەخواتەوە. لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ«هیگڵ ٤»، «هایدگەر٥»، «هۆسێرل٦» و کۆمەڵێک هزرڤان و بیرمەندی ناوداری دیکە لە بواری تێفکرین و وردبوونەوە، دیارە دنەدەر و بێ هاوتایە و بە تازەیی کارتێکەرییە بەرینەکەی لە دەرەوەی وڵاتی ئاڵمانیایش سەلمێنراوە.

**تێبینییەکان:**

**١-جان پۆل سارتەر( ١٩٠٥-١٩٨٠)**



فەیلەسووف، ڕۆماننوس، شانۆنووس، ڕەخنەگر و بیرۆکەوانی فەلسەفی، لەدایکبووی فەڕەنسەیە. ئەگەرچی لە چینی بۆرژوازی دائەکەوێت، بەڵام لەگەڵ هاوبیر و هاونەوەکانی خۆی هەمیشە ڕەخنەی توند و تیژی ئاڕاستەی ئەم چینە کردووە. یەکەم ڕۆمانی بەناو «هێڵنج» لە ساڵی ١٩٣٨ لە پاریس چاپ ئەبێت و دوابەدوا چەند ڕۆمان و شانۆی دیکە بڵاودەبێتەوە. یەکێک لەو نووسەرانە بووە کە چالاکییەکی زۆری لە بواری سیاسی لە ئەستۆ گرتبوو بەرهەمگەلی زۆر و فرەڕەهەندەی لە بوارگەلی جۆراوجۆر لێبەجێماوە وەک: مێشەکان، دەستە پیسەکان، خودا و شەیتان، ڕێگەی ئازادی، دیوار، ژنە سۆزانی بەشەرەف و ...تاد. بە تەواوی ئەم وتانە ڕووە فەلسەفییەکەی سارتەر لە ڕووەکانی دیکەی زۆر تیشکدەرتر بووە و کارتێکەریەکی ئەوتۆی لەم گۆڕەپانە قەبڵاندووە و وەک ناوازەترین ئەندامی قوتابخانەی ئیگزیستانسیالیزم هەمیشە لەبەرچاو بووە. دەڵێی ئیگزیستانسیالیزم لە چاخی ئەمڕۆ بە ناوی ئەم بیرمەندە گرێ دراوە .



**٢-نیتچە (١٨٤٤ – ١٩٠٠)**

نیتچە، کەڵەفەیلەسووفی ئاڵمانی یەکەم جار لە مێژووی فەلسەفەدا زۆر بێ مەترسی مەرگی (خودای کۆنی) ڕاگەیاند و مزگێنی بۆ لەدایکبوونی (مرۆڤی نوێ)ی لە سەدەی بیستەم دا. دوابەدوای مەرگی ئەم هزرڤانە تاقمێک نیتچەناس ئەم بیر و باوەڕەیان خستە ڕوو کە بیرۆکەی فاشیزم لە ژێر کارتێکەری بەرهەمگەلی نیتچە سەریهەڵداوە و لەولایشەوە هەندێک

بیرمەندی دیکە ئەم بیرەیان خستە گڕ کە نیتچە بۆ یەکەم جار فەلسەفەی پۆستمۆدێرنیزمی باو کردوە و بە باوەکە ڕەسەنەکەی ئەم بزاڤە فەلسەفی و کۆمەڵایەتییە پێناسە کراوە . زۆربەی بیرمەندانی سەدەی بیستەم وەک «هایدگەر»، «ئادۆرنۆ»، «جان پۆل سارتەر» و «ئالبیر کامۆ» و چەندین کەسێتی ناوازەی دیکە لە ژێر پەنجەی دەسەڵاتی ئەم بیرمەند و خاوەن ڕایە بەرهەمە فیکرییەکانی خۆیان نووسیوە .

### ٣-«**مارکسیزم**»

لە واقیعدا تیورییەک بوو لەمەڕ چۆنییەتی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی مرۆڤ کە لە لایەن«کارل مارکس» فەیلەسووف و کۆمەڵناسی گەورە و فەردریخ ئەنگڵس (هاوڕێی مارکس) کە هەر دوو ئاڵمانی بوون، دانرابوو.
لەم قوتابخانە فەلسەفییە، چەن لقی فەلسەفی — سیاسی لێبۆتەوە کە لە سەرەکیترینەکەیان دەکرێت ئاماژە بە «مارکسیزم لێنێنیسم، مارکسیزم ستالینیسم و مارکسیزمی نوێ یا مارکسیزمی چەپ» بدەین کە هەر کام لەم لقانە هەلومەرجێکی ڕامیاری، فەلسەفی، مێژوویی جیاوازن لە سەدەی بیستەم.





هیگڵ

## ٤-هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١)

فەیلەسووفی بەناوبانگی ئاڵمانی کە بەرهەمگەلێکی زۆر گرینگ و بایەخداری لێ بەجێماوە. هیگڵ لە واقیعدا لە مێژووی فەلسەفە بە دوایین فەیلەسووفی هەرە گەورە دەژمێردرێت کە بە مەرگی ئەم کەڵە بیرمەندە، چاخی فەیلەسووفە مەزنەکان دوایی هاتووە.

یەکێک لە سەرەکیی ترین کارتێکەرییەکانی ئەم فەیلەسووفە ئەمە بوو کە پێگەیەکی بە هێزی لە نێوان قوتابخانە فەلسەفییەکانی دوای خۆی نواند، بەو جۆرە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم سێ لقی فەلسەفی لە ئەندێشەکەی جیابۆتەوە کە بریتین لە:

١-فەلسەفەی نیتچە، فەیلەسووفی هەرە گەورەی ئاڵمانی بە بەرهەمگەلی گەورە و گرینگ وەک «وەهای وت زەردوشت».

٢-قوتابخانەی فەلسەفی مارکسیزم کە بیرداڕێژی ئەم فەلسەفە لە لایەن مارکس و ئەنگڵس دانراوە.

٣-فەلسەفەی بوونیانە یا قوتابخانەی«ئیگزیستانسیالیزم»کە چەن فەیلەسووفی گەورەی فەڕەنسا و ئاڵمانیایی لە بیرداڕێژانی ئەم قوتابخانە فەلسەفییە بوون کە لەوانە دەکرێت ئاماژە بدەین بە «هایدگەر» و «ژان پۆل سارتەر» وەک ناوازەترین ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە.

فەلسەفەی«ئیگزیستانسیالیزم»لە سەدەی بیستەم تەئسیرێکی زۆر قووڵ و دیاریکراوی بەسەر کولتوور و مێژووی هزری وڵاتە ئەوروپییەکان و وڵاتانی دیکە قەبڵاندووە و هەروەها کاریگەری خۆی بەسەر ئەدەبی هاوچەرخ بە تایبەت «ئەدەبی پووچی» یا «شانۆی پووچی»ش سەلماندووە.

## ٥-مارتن هایدگەر (١٨٨٩-١٩٧٦)



هایدگەر

مارتن هایدگەر بە یەکێک لە ئەندامە هەرە ناوازەکانی قوتابخانەی فەلسەفی ئیگزیستانسیالیزم ناوزەد کراوە. ئەم فەیلەسووفە مەزنە کە فەلسەفەی لە ژێر چاودێری ئۆستادەکەی «هۆسێرل» خوێندبوو، زۆر بە ڕاشکاوی ڕەخنە ئەدەبی و فەلسەفییەکانی سەدەی بیستەم بە زۆری لە ژێر پەنجەی دەسەڵاتی ئەودا پێناسە کراون و تەئسیری ئەندێشەکانی بەسەر زۆربەی چەمک و زاراوە ئەدەبی و فەلسەفییەکانی چەرخی ئەمڕۆ حاشاهەڵنەگرە. بەڵام بە هۆی ئەندامەتی لە پارتی نازیسم بە سەرۆکایەتی هیتلەر، لە مێژووی فەلسەفە زۆر جار بە خراپیش ناوی لێبراوە.

## ٦-ئێدمۆند هۆسێرل (١٨٥٩-١٩٣٨)

فەیلەسووفی فینۆمۆلۆژیست کە بەڕەچەڵەک جوولەکە (یەهوودی) بووە و لە سەردەمی دەسەڵاتداری هیتلەر و پارتی نازیسم بە ناچار ئاڵمانی جێهێشت. بەگوێرەی چەندین بەڵگەی مێژوویی مارتن هایدگەر کە بەناوبانگترین قووتابی هۆسێرل بوو لە دەربەدەرکردنی ئەم بیرمەندە تەئسیرێکی زۆری بووە. هەڵبەت لە دادگایەک کە دوا شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ تاوانبارکردنی کاربەدەستانی نازیسم ڕێخرا، هایدگەر لەبۆ ئەم مەسەلە هەرگیز تاوانبار نەکرا.

**ژێدەر:**


فرهنگ اصطلاحات نقد ادبی (از افلاطون تا عصر حاضر)، نوشته دکتر بهرام مقدادی، انتشارات فکر روز، تهران: ١٣٧٨

بۆ شارەزایی زۆرتر بڕوانە ئەم ژێدەرانە:

١-دایره المعارف علوم اجتماعی، دکتر باقر ساروخانی، چاپ مؤسسه کیهان، ١٣٧٠

٢-فرهنگ علوم سیاسی، علی اقا بخشی، چاپ

نگاه، ۱۳٦٦
۳-فرهنگ جامع علوم سیاسی، محمود طلوعی، چاپ حیدری، ۱۳۷۲
٤-فرهنگ سیاسی، داریوش اشوری، انتشارات مروارید، ۱۳۵۷
٥-فرهنگ اندیشه ی نو، ویراستار:ع. پاشایی، انتشارات مازیار، ۱۳٦۹
٦-فرهنگ جامع لغات و اصطلاحات سیاسی، محمد جواد علمی، چاپ آداب، ۱۳۷۰
۷-فرهنگ اصطلاحات فلسفه و علوم اجتماعی، ماری بریجانیان، ویراستار: بهاءالدین خرمشاهی، مؤسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی ، چاپ آرین، ۱۳۷۱
۸-مدرنیته و اندیشه ی انتقادی، بابک احمدی، نشر مرکز، ۱۳۷٤

9- Ayer, A.J. and O, Grady, Jane., eds. A dictionary of Philosophical Quotations. London;Blackwell Co., 1992
10- Collier, Peter and Geyer-Ryan, Helga., eds. Literary Theory Today. London;T.J. Press Ltd., 1992
11- Edwards, Paul., ed. The Encyclopedia of Philosophy. V. 5, 6 New York;Macmillan Publishing Co., 1967
12- Urmson, J.U. and Ree, Jonathan., eds. The Concise Encyclopedia of Western Philosophy and Philosophers. New York;Unwin Brothers Ltd., 1989
13- Williams , Raymond. Marxism and Literature. London;Pitman Press, 1977

# ڕەخنەی بەها ئەخلاقییەکان لە فەلسەفەی نیچە

و. لە فارسییەوە: سەعید کاکی

**بەها ئەخلاقییەکانی پێش نیچە:**

فەلسەفەی ئەخلاق، توێژینەوەیەکی فەلسەفی و بیرمەندانەیە لەسەر بەها ئەخلاقییەکانی مرۆڤ. تێگەیشتن لە بەها ئەخلاقییەکان کاریگەری ڕاستەوخۆی لە ژیانی مرۆڤەکان داناوە. بە تایبەت دەربڕین و هەڵوێستەکانیان لەسەر خەڵکی و کردەوەکانیان کە بە چ شێوەیەک بڕیار دەدەن. بۆیە خەڵکی کەم تا کورتێک هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی کە ژیانیان لەگەڵ بەها ئەخلاقییەکاندا یەک بخەنەوە، بەڵام نەک بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە، بەو جۆرەی کەوا هەندێک شێوەی ژیان لە هەندێکی تر بەپێزترە (وەلیامز،١٣٨٣:٢٩).

لەم سەروبەندەدا فەلسەفەی ئەخلاقی نیچە

ڕەهەندێکی تر دەگرێتە بەر و گرینگیەکی تایبەتی هەیە. بەهۆی ئەوەی کە شێوەی ڕوانینی ئەو لەسەر ئەخلاق لە بنەڕەتەوە شێوەیەکی تر دەگرێتە بەر.

پێش ئەوەی کە بچینە ناو باسەکە، باشتر وایە بەخێرایی باسێک لەسەر بەها ئەخلاقییەکانی پێش نیچە بکەین بۆئەوەی کە بۆمان دەرکەوێت نیچە ڕەخنەی چی دەکات.

ئێمە بە وردی شێوەی سەرهەڵدانی بەها ئەخلاقییەکان نازانین، بەڵام بۆمان دەرکەوتووە یەکەم کەسێکە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا بە چڕوپڕی بایەخی بە بەها ئەخلاقییەکان داوە، فەلسەفەی سوقرات[1] و ئەفلاتوونە. ئەم فەیلەسووفانە، وتبوویان هەروەها کە هەبوونی خۆر بۆ ڕۆشنایی، گژوگیا و زیندەوەرەکانی سەر گۆی زەویی پێویستە، ئایدیای خێر بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ و کردارەکانی لە کۆمەڵگادا پێویستە.

هەربۆیە کردەی بەها دانان لە ناوەڕۆکی بابەتەکانی پەیوەندیدار بە مرۆڤەوە ڕادەوەستێت. کەواتە سڕینەوەی بەها ئەخلاقییەکان لە پێگەی هەبووە خاوەن عەقڵەکان خەسارێکە بۆ سەر ژیانی مرۆڤ و گەروابێ ئێمە بەچڕوپڕی لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیمان تێناگەین (هۆڵمز،١٣٨٢:٢٥).

ئەرەستۆ پاش ئەفلاتوون ڕێچکەی مامۆستاکەی گرتە بەر، ئەویش بەها ئەخلاقییەکانی لە ژیانی بەختەوەرانەدا دەبینیەوە و ئامانجی بەها ئەخلاقییەکانی لە هاوسەنگی ڕادەی مام ناوەند دەبینیەوە. فێرگە و ڕێبازەکانی پاش ئەرەستۆی وەکوو ئێپیکۆریی و ڕەواقیەکان بەها ئەخلاقییەکانیان لە ئۆقرە گرتنی دەرونیدا دەبینیەوە. ئێپیکۆر، بەهای ئەخلاقی دەبردەوە بۆ سەر چێژ (پاپکین، ١٣٦٩:٣٢).

بۆچوونی ئێپیکۆر ئەوە بوو، کە چێژ سەرەتا و دوا ئامانجی ژیانی بەختەوەرانەیە و لە ڕاستیدا چێژ یەکەم خێرێکە لەگەڵ سروشتدا یەکدەگرنەوە. بەڵام مەبەست لە چێژ تاودانی هەوەس و ئارەزووەکان نییە، بەڵکو ئۆقرە گرتنە و دورکەوتنەوە لەو شتانەیە کە ئاسایشی دەرونی مرۆڤ تێکدەدەن (ژان بێرن، ١٣٨١:١٠٤).

ڕەواقیەکانیش لایان وابوو چاکە و گەشەسەندنی لایەنی ئەخلاقی بە تاکەوە بەندە. ئەگەر بێتوو کەسێک بایەخ بە ڕووداوەکان نەدا، ئیدی گرفتەکانی جیهان بەسەریدا زاڵ نابن، هەر بۆیە ڕواقیەکان بەها ئەخلاقییەکانیان دەگەڕاندەوە بۆ باوەشی مرۆڤ. گەرچی لە ئەخلاقدا تووشی ناکۆکی نێوان جەبر و ئێختیار بوون. بەڵام بەرپرسیاری ئەخلاقی وەکوو بەهای ئەخلاقی لە ئەستۆی مرۆڤدایە و هەربۆیە تووڕیان نەدەدایە جیهانێکی بەرزەجێ وەکوو ئەوەیکە خودا لە جیهانێکی تر بۆت قەرەبوو دەکاتەوە. دواتر ئەخلاقی مەسیحی بەهاکانی ئەخلاقی ڕەواقیان گەڕاندەوە بۆ سەر ئیمان، یانی گرینگ ترین دەستووری ئەخلاقی مەسیحی ژیان بە سەربردنە لە ژێر فەرمانی خودا و بەها ئەخلاقییەکان دەبێ پەیڕەوی لە ئیمان بکەن (مەک ئێنتایەر،١٣٧٩:٢٢٤).

**١- پلە و پێگەی بەها ئەخلاقییەکانی سەردەمی مودێرن**

سەردەمی مۆدێرن لە سێ لایەنی گرینگەوە سەریهەڵدا : ١- فیزیای نوێ بەتایبەت کەسانێکی وەکوو گالیلۆ، کۆپێرنیک و نیوتەن.....

**٢- فەلسەفەی مودێرن وەکوو: فەلسەفەی، دێکارت، لۆك، هیۆم و کانت......**

**٣- فەلسەفەی سیاسی مودێرنی وەکوو: هۆبز، دێمۆکراسی لۆك......**

بەها ئەخلاقییەکانی مودێرنیش لەم کەین و بەینەدا، لەسەر تەوەری تاکخوازی قۆراخەی بەستووە. ئەخلاقی مۆدێرن و ڕێبازەکانی هەوڵی ئەوەیان دەدا ئەخلاق بەرەو ئازادی و بەرپرسیاری هانبدەن و لە هەناوی ئەم ئازادیەدا تاك بە کۆمەڵگاوە نووساوە. چەمکەکانی ئەخلاقی مۆدێرن بە مێژوو و هەروەها بەستێنی کۆمەڵگاوە بەندن.

هەر بۆیە، بەها ئەخلاقییەکانی وەکوو سۆزگەرایی، چێژخوازیی، فەزیلەت خوازیی لە ناوەڕۆکی فەلسەفەی ئەخلاقی مودێرندا شوێن پێی خۆی کردەوە. هۆبز و ئێسپێنۆزا دوو کەسایەتی و فەیلەسووفی نوێخوازن و کاریگەریان لەسەر هاوچەرخەکانی خۆیان داناوە. بۆ نموونە، ئەخلاقی ئێسپێنۆزا لەسەر فۆرمێکی عەقڵ تەوەر دامەزراوە و هەربۆیە سەرجەم ڕووداوەکان لەسەر نەزمێکی هەتاهەتایی و یاسا نەگۆڕەکانی سروشت ڕوو دەدەن، گەرچی ئێسپێنۆزا لاهووتی یەهوودی بە شێوەیەکی تاك خوازانە و بە دوور لە یاسا و ڕێسای ئایینی یەهوود شیدەکردەوە. ئێسپێنۆزا کاریگەری ئەخلاقی ڕەواقی پێوە دیارە و لەژێر عەقڵی پەتی دێکاریتدا بوو و هەروەها دۆئالیزمی دێکارتی ڕەتدایەوە و فەلسەفەیەکی لەژێر ناوی یەکانەکی بوون دامەزراند کە بیرۆکەیەکی یەکەخواز بوو. بەڵام ئێسپێنۆزا وای بۆ دەچوو ئەخلاق ڕەها و نەگۆڕ نیە، بەڵکو ڕێژەییە و ئیعتباریە و هەروەها هیچ شتێک لە خۆیدا چاك یان خراپ نییە، بەڵکو ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بکەری کارەکە چ هەڵوێستێک دەگرێتە بەر (پاپکین،٤٧).

هۆبز وەکوو فەیلەسووفێکی مەتریالی مێتۆدیک [١]. هەر وەکوو ئێسپێنۆزا ئەخلاقی بە ڕێژەیی لە قەڵەمداوە و لای وابوو بەها ئەخلاقییەکان عەینی نین[٢].

هۆبز دەڵێ ئەوەی بۆ کەسێک چاکە یان خراپە، بۆچوونی ئەو کەسەیە و بەس، گەر وابێ داوەریە ئەخلاقیی و بەها ئەخلاقییەکان بە هەست و تێگەیشتنی مرۆڤەوە بەندن (ڕیچارد تاك، ١٣٨٢ : ٨٧-٨٦).

عەقڵ خوازەکان، بەها ئەخلاقییەکانیان لە بکەری کردەکەدا دەبینییە و پشتیان بە ڕێگەی بەڵگە هێنانەوە دەبەست و هەروەها لایەنی ئیمانیان لە ئەخلاق داماڵی و پێداگریان لەسەر پێوەندی

١-لە فەلسەفەدا، ڕێچکەی ماتریالیست ڕیشەی لە فەیلەسووفەکانی پێش سوقراتیدا داکوتاوە، بۆ نموونە دێمۆکریتۆس ماتێریالیکی سادەیە، لە فەلسەفەی نوێدا، هۆبز، نوێنەری ماتێریالیزمی مێتۆدیە و ماتێریالیزمی مێژوویی و دیالێکتیکی لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی هێگل و مارکس پەرە دەسێنێ.

٢- ئەخلاقی عەینی — مانای ئەوەیە چاکە و خراپە لە دەرەوەی زەینی ئێمەدان، ئەفلاتوون ئەخلاقی زەینیە لای وایە چاکە و خراپە بنەمای لەسەر هەستی مرۆڤە و فڕی بە سەر عەینەوە نییە. وەکوو هیۆم

نێوان ئەخلاق و بەهاکانی تاک یان کۆمەڵگا دەکرد. لەلایەکی تر ئەزموونییەکانی وەکوو هیۆم بناغەی بەها ئەخلاقییەکانیان لە سە ر هەستی مرۆڤدا دانا و لای وابوو عەقل کۆیلەی هەستە و بەس. کەسانێکی تری وەکوو ئیستوارت میل و بێنتام، بەها ئەخلاقییەکانیان لە قازانجدا دەبیننەوە و خێری ئەخلاقیان بەوە دەزانی کەوا قازانج بۆ زۆرینەی کۆمەڵگا دابین بکەن (مەک ئێنتایەر، ٣٢٢:١٣٧٩).

ئەخلاقی قازانجخوازانە و ئەرکخوازانەی (کانت) دەوری سەرەکیان لەسەر ئەخلاق و بەهاکانی جیهانی مودێڕن گێڕاوە. کانت وەکوو فەیلەسووفێکی ئەرکخواز دژ بە بۆچوونی قازانجخوازەکان لەسەر بەها ئەخلاقییەکان ڕاوەستا، هەربۆیە بەهای ئەخلاقی لە «ویستی چاکە[3]»دا دەبینیەوە و مەبەستیشی لە ویستی چاکە، بە ئەنجام گەیاندنی ئەرک[4]و بەڵێنە[5] (کانت ١٣٦٩ : ١٤-١٣).

لەم بەستێنەدا، پرسەکە ئەمەیە ئەخلاقی نیچە چ خاڵێکی هاوبەش یان خود ناکۆکی لەگەڵ ئەم باسەدا هەیە؟

یان ئەوەی کە پرسی سەرەکی نیچە لەسەر ئەخلاق چییە؟ نیچە کاریگەری لەسەر بەها ئەخلاقییەکان داناوە و پلە و پێگەی تایبەتی خۆی لە فەلسەفەی ئەخلاقدا هەیە. نیچە لەلایەک ڕێزی لە ئەخلاقی پێش سوقڕاتی دەگرت و وەکوو هێمای ژیان چاوی لێدەکرد و لەلایەکی تریش ڕەخنەگر و دوژمنی ئەخلاقی سوقڕاتی بوو. نیچە لە ویستی ڕەش بینانەی شوپنهاوێر کەڵکی وەرگرت و بەرەو ویستی ژیان هانیدا، هەروەها نیچە لە بەشی ئەخلاقی سەروەر و کۆیلەدا کاریگەری هێگلی[6]پێوە دیارە، بەڵام نیچە شێوەکانی عەقڵ تیکدەدا، نیچە ئەخلاقی کانتی وەکوو پاساو هێنانەوە بۆ سەلماندنی ئەخلاقی مەسیحی ناودێر کردوە و لەجیاتی سەلماندنی زانینی کانتی کە وتبووی چی دەزانین؟ نیچە ئەم پرسیارەی ورووژاند کەوا چ شتێک بۆ ژیان باشە؟ هەربۆیە بۆچووکانی نیچە تاڕادەیەک لەگەڵ فەلسەفەی پراگماییدا یەکدەگرنەوە. کەواتە زیندووبوونی نەریتێک لەوەدایە بیرکردنەوەکان بە مێژوو و بەستێنی کۆمەڵگاوە بەندە، هەروەها یەکگرتنەوەیەک لەنێوان ئێسپێنۆزا و نیچەدا هەیە. نیچە ڕێزی لە ئێسپێنۆزا دەگرت بەهۆی ئەوەی کە چەمک گەلێکی وەکوو ئازادی ویست[7]و زانینی بەرەو هێز هاندەدا (پیەڕسۆن، ٤٠:١٣٨٨). تەنانەت لە یۆناندا و لە کتێبی کۆمار کالیکلێس دژ بە ئەفلاتوون کەوا دادپەروەری لە هاوسەنگی نێوان؛ عەقڵ، بوێری و مەیل، دادەنا

3 -goodwill

4-duty

5 -obligation

٦- هێگل باس لە کۆیلە و خاوەن کۆیلەی لە بەستێنی مێژوویدا کردووە و هەروەکوو قۆناغێکی مێژوویی ئاگامەندانە جاوی لێکردووە و بۆ دوو چینی جیاواز بە کاری هێناوە و مەبەستی لە پرۆژەکەی گەیشتن بە ئازادی لە ڕێگەی عەقڵەوە بوو. بەڵام نیچە، کۆیلە و سەروەری وەکوو باسێکی ئەخلاقی چاوی لێکردوە و بایەخی بە بەستێنە مێژووییەکی نەداوە.

٧- لە نێوان «کۆناتووس» یان پاراستنی زاتی ئیسپێۆزا ویستی هێزە یەکگرتنەوەیەک هەیە.




ڕاوەستا و لای وابوو دادپەروەری گەیشتن بە دەسەڵاتە[8].

**٣- چوارچێوەی گشتی فەلسەفەی ئەخلاقی نیچە:**

نیچە دژایەتی ئەخلاقی قازانجخوازانەی دەکرد، بەڵگەی نیچە ئەوەبوو کەوا بەهاگەلێکی وەکوو «خۆشگوزەرانی» بەو جۆرەی کەوا قازانجخوازەکان باسی لێدەکەن هیچ نییە جگە لە خزمەت کردنی مرۆڤە مام ناوەندەکان. ئەو مرۆڤانەی کەوا هایدیگەر وەکوو مرۆڤی ناڕەسەن یان داسمەن چاوی لێدەکردن، و حەزیان ئەوەیە خۆیان بنوێنن یان ئەوەیکە لە خزمەت کەسێکی تردا بن، نیچە لە سێ خاڵدا دژ بە تیۆرییە ئەخلاقیی و بەها ئەخلاقییەکان دەوەستێتەوە.

١- لە سەر بنەما گشتیەکانی ئەخلاق، بۆ نموونە کانت تایبەتمەندی ئەخلاقی لەهەمەکی بووندا دەبیننەوە وەکوو ئەم بڕیارەی کەوا دەڵێ: " کردارت وەها بێ ، بتەوێ بڕیارەکەت ببێتە یاسایەکی گشتی". نیچە لە بەرانبەر ئەم بڕیارەدا، دژ بە هەر چەشنە یاسادانان و پاراستنی کرداری گشتی و تایبەت بووە و لە ئەنجامدا ئەم جیاوازیانەی بنەبڕدەکرد (حەقێقی ، ١٣٧٨ : ١١٢-١١١).

٢- چەمکی یەکسانی سیستەمە سیاسیەکان: دیموکراسی و سوسیالیزم بەهاکانی وەکوو ئازادی و دادپەروەریان هێنایە ناو ئەخلاق و بەڕای نیچە ئامانە تێکڕا بناغەیان لە

[8]- نیچە مەبەستی لە هێز دەسەڵات نیە، بەڵام کالیکلێس مەبەستی لە هێز دەسەڵاتداری بوو.

ئارمانەکانی مەسیح دایە و ئەویش خولقاندنی (مرۆڤی مێگەلە). نیچە لەم بووارەدا دژ بە هەر چەشنە بەهایەکی وەکوو یەکسانی بوو، یەکسانی بنەمای نییە و مرۆڤە مێگەلەکان بۆ ئەوەی کە هەموو شتێک وەکوو خۆیان لێ بکەن چەمکی وەکوو یاساکانی کۆمەڵگای داسەپاندووە.

٣-چەمکی زاڵ بوون بەسەر نەفسدا:

نیچە لای وابوو ئەو سیستەمە ئەخلاقیانەی کەوا مرۆڤەکان هاندەدەن خۆڕاگربن و ملدانەنەوێنن بۆ حەزە کاتییەکانی خۆیان. بەڵام ئەو جۆرە ئەخلاقەی هەندێک مرۆڤی بیر وشک بۆ سەرکوتی نەفس و غەریزە سروشتیەکان کەڵکی لێوەردەگرن، دژیان دەوەستایەوە و ڕەخنەیان دەکات، نیچە دژ بە یەکانەگی نەفس ڕادەوەستێتەوە و هەر چەشنە دۆئالیزمی نەفس و لەش لە بۆچوونە ئەفلاتوونی — دێکارتیەکەیدا مەحکووم دەکات. بە ڕای ئەو نەفس هیچ نیە جگە لە کۆمەڵێک سۆز و هەست، هەربۆیە ئەم بۆچوونە هیۆم فەیلەسووفی گومانکاری ئەزمونخوازمان وەبیر دێنێتەوە (حەقێقی، ١١٤-١١٣).

پرسەکە لێرەدا ئەوەیە، نیچە لە بەرانبەر بەها ئەخلاقییەکاندا چ بۆچوونێکی تری هەیە؟ هەروەها کە ئاماژەمان پێدا لە فەلسەفەی ئەخلاقی سوقرات دا شێوەیەک لە ڕوخساری گەیشتن بە ڕاستەقینە خۆی حەشارداوە، یانی کەسێکی وەکوو ئەرەستۆ وێنایەک لە فەزیلەتی ئەخلاقی واتە گەیشتن بە بەختەوەری ئاراستە کردووە و کانتیش شیکردنەوەیەکی لە ئەخلاق و عەقڵی کردەکی بۆ ئێمە دابین دەکات و جۆن ئێستوارت میل، پێداگری لەچەمکی چێژ گرتووە (solomon٢٠٠٣: ٤٤).

بەڵام نیچە بە پێچەوانەی سەرجەم بۆچوونە بەها تەوەرەکانی پێش خۆی ، فەیلەسووفی ئەخلاقی تاکگەرا لە قەڵەمدەدرێت (کاپلستۆن، ١٣٧٨: ٦٤).

نیچە فەیلەسووفێک نیە لە نەریتێکی فەلسەفی شیکاریدا بیگونجێنین بۆئەوەی بەها ئەخلاقییەکان لێکبداتەوە، هەر بۆیە دژ بە سەرجەم بەها ئەخلاقییەکان دەوەستێتەوە و بەهای نوێ دەخولقێنێ. بە گشتی نیچە، فەیلەسووفێکی ئەخلاق ناباوەڕە[9]و بە شێوەیەکی بوون ناسیانە[10]چاو لە بەها ئەخلاقییەکان دەکات و لەگەڵ ئەو فەیلەسووفانەی کەوا دژی مێتافیزیکن هاودەنگە، بە گشتی نیچە فەیلەسووفێکە تەفسیری جۆرواجۆری لەسەر کراوە، واتە تەفسیری وەکوو هایدێگەر، دۆلۆز و یاسپەرز، فەلسەفەکەی دژە سیستەمە، مەبەستی نیچە لە تەفسیری بەها ئەخلاقییەکان، گەڕاننەوەی «بێ تاوانی و بێ گومانی» هەتاهەتایی ئایینە بۆ سەر بوون ، بەڵام بە چاوێکی تر چاویی لێدەکات، ئەویش لە ڕوانگەی «ئەودیوی چاکە و خراپە»وە (نیچە ١٣٧٨: ٥٨).

هەربۆیە زمانی نیچە بۆ دەربڕینی بۆچوونەکانی لە بازنەی ئەخلاقی سیستەماتیک و ئێپێستمۆلۆژیک

9- An moralist
10- Ontological

دا ناگوجێت، و پڕن لە قسەی نەسەق و زۆرجاریش تەوس و تەشەر. کەواتە نیچە دژ بە هەر چەشنە بۆچوونێکە کەوا ئەخلاق وەکوو بنەمایەکی نەگۆڕ چاو لێدەکەن وەهەربۆیە ئەو دەیەویست خۆی لەم کۆت و بەندە ڕزگار بکات (یاسپەرز،١٣٨٠:٢٣٣).

نیچە لە جیاتی شیکردنەوەی چەمکە ئەخلاقییەکان، لە تەفسیر کەڵک وەردەگرێ، قسەی نەستەق، لای نیچە جۆرێک فەننی تەفسیر و شرۆڤەیە و لە هەمان کاتدا بابەتێکە بۆ هەڵسەنگاندن (دۆلۆز، ١٣٨٣:٢٢). هەربۆیە نیچە لە ڕێگەی بۆچوونێکی ڕەچەڵەک ناسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی بیرکردنەوەکان و دۆزینەوەی سەرچاوەی ڕەچەڵەکەکانیان.

٤- ڕەخنەی بەها ئەخلاقییەکانی مەسیح:

پرسیارێک لێرەدا ئاراستە دەبێ، ئەویش ئەمەیە، نیچە دەیەوێ چی بسەلمێنێ؟ نیچە لە ڕێگەی ئاراستەکردنی دوو شێوە بەهای ئەخلاقی لە فەلسەفەی خۆرئاوادا واتە ئەخلاقی کۆیلە و ئەخلاقی سەروەر دەیەوێ هەمدیسانەوە، بەها ئەخلاقییەکان هەڵبسەنگێنێ. نیچە وای بۆ دەچوو بەها ئەخلاقییەکانی خۆرئاوا تووشی نیهیلیزم بووتەوە و هەر بۆیە بەهای خۆیان لە کیس داوە و ئەم بێ بەها بوونە ڕیشەی لە ئەخلاقی، سوقراتی – مەسیحیدایە. نیچە دەیەوێ بڵێ هیچ کات جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوانی ئەخلاقی ڕاستگۆیی، و مەسیحی و ڕۆمیدا نیە، ویستی ڕاستەقینە بەو جۆرەی کەوا مەسیحیەت و فەلسەفە لە هەناویدا قۆراخەی بەستووە، کۆیلەی ئەو ئارمانە زاهێدانەیەن کەوا لایەنگرەکانیان هەوڵدەدەن جۆرێک ویستی هێزی پەست و نەخۆش ئاسا بەسەر تۆخمەکانی ژیاندا بسەپێنن و لە هەمان کاتدا لەگەڵ ویستی فریوداندا ئاوێتەی بکەن (ئێستێرن، ١٣٧٥:١٣٦). دیارە نیچە وای بۆدەچێ ئەخلاقی مەسیحی هەمان ئەخلاقی سوقراتیە و تەنانەت ئایدیۆلۆژیە سیاسیەکانی وەکوو سۆسیالیزم و دیموکراسی بناغەیان لە ئەخلاقی مەسیحدایە و باوەڕیان بە یەکسانخوازیە کە تاکوو ئێستا، جگە لە خەون و خەیاڵ، هیچیان لێ نەکەوتووەتەوە هەر بۆیە هەموو شتێک لە ویستی هیزدایە.

مەسیحیەت و ئایین جگە لە چاندنی تۆخمی ڕق و ترس هیچ کارێکی ئەوتۆیان نەکردەوە. نیهیلیزمی شاراوەی ناو ئایین، کاتێک دەگاتە لووتکە و دەسەڵات هەموو فۆڕمەکانی بیرکردنەوە و تەنانەت ژیان دەسڕێتەوە و شەڕ وەکوو بابەتێکی کۆنکرێتی سەرگوێ ئەم زەویە دەسڕێتەوە و گوێی خۆی لە ئاستی شەڕەکانی جیهان کەڕدەکات. ئایین جیهانێکی دووبەرەکی وەکوو خێڕوشەڕ، ڕەش و سپی، ئیماندار و بێ ئیمان، چاک و خراپ دەخولقێنێ. نیهیلیزمی شاراوەی ناو ئایین هەموو فۆڕمێکی ئازادی و ویستی ژیان دەخنکێنێ و مرۆڤی گێژ و کۆیلە و داماو دەخولقێنێ، مرۆڤێک کەوا هێشتیان لەناو زەبری قەدەردایە و ماتڵی چارەنووسێکی نادیارە و هەروەها خۆلقاندنی ئارمانجی ڕەهایی یان هەمان جیهانی خەیاڵی ئەفلاتوونییە. نیچە دژ بەم ئەخلاقە باس لە ئەخلاقی سەروەر دەکات، ئەو کەسانەی بۆخۆیان خاوەن داهێنان و لەمپەڕێکن لەبەردەم

ئەخلاقی کۆیلە و هەربۆیە سەربەخۆ و ئازادن.

٥- تایبەتمەندی ئەخلاقی کۆیلە

بەڵام کۆیلەکان ئەو کەسانەن، کۆمەڵگای مرۆیی پێکدێنن، ترسنۆک، لاواز و مام ناوەندن و بوونی داسمەن یان ناڕەسەنیان هەیە، ئەو سەردەمەی کەوا سەروەرەکان، دەسەڵاتیان هەبوو و ئەخلاقی کۆمەڵگا لەلایەن ئەوانەوە بناغەی داڕێژرابوو، سەروەر ئەوەی بە چاکە دەزانی، هەر ئەوەش سەریدەگرت. کۆیلەکان لە ژێر ڕکێفی سەروەرەکاندا بوون. سەروەرەکان لە وشەی «خراپ و پەست» کەڵکیان وەردەگرت. بەڵام سەروەرەکان داهێنەر بوون و حەزیان لەوە نەبوو بەهاکانی خۆیان بەسەر کۆیلەکاندا بسەپێنن، ئەوان هونەرمەند بوون و بەهاکانی وەکوو «چاکە و خراپە» بۆ سەروەرەکان لایەنێکی پێهەڵدان و ستایش کردنی هەبوو و هەروەها بەهاکانیان بە سەرهیچ کەسێکدا نەدەسەپاند. لەم قۆناغەدا کۆیلەکان تووشی ڕق و قین یان «resentment» دەبوون، دیارە لەم قۆناغەی بیرکردنەوەی نیچەدا، شوێن پەنجەی هێگلی پێوە دیارە. مەبەستی نیچە لە وشەی resentment لای نیچە ئەوەیە ئەم وشەیە بۆ ئەخلاقی مەسیحی بەکاردێنێ، واتە مرۆڤی ئایینی تۆخمی ڕق و قین و ترسنۆکی نەبێ هیچ شتێکی تر ناچێنێ. بێزار لە ژیانە و چاندنی ئەم بەها کۆیلانە بۆ ئەوەیە، تۆڵە لە مرۆڤی سەروەر بکاتەوە (زەیمەران، ۹۸:۱۳۸۲). ئەوکاتەی کۆمەڵگا پێویستی بە مرۆڤی سەروەر هەبوو، کەڵکی لێ وەردەگرت و ڕێزی لێدەگرت، هەرکە مەترسی نەما، ویستیان سەروەرەکان لە کۆت و بەند بخەن. ئەوسا وشە ئەخلاقییەکانی وەکوو «چاکە و خراپە» باری گۆڕا و لە ئەنجامدا بەهاکانی مرۆڤی کۆیلە ناوبانگی دەکرد. (هەر کۆمەڵگایەک هەندێک یاسا و ڕێسا و بەها بڵاودەکاتەوە، سا لەلایەن دەسەڵاتەوە بێ یان خود ئەوەیکە کۆمەڵگا بڵاوی دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە هەندێک کەس قازانج لەوەدا دەبیننەوە). هەربۆیە بەهاکانی مرۆڤی کۆیلە ناوبانگی دەرکرد بۆ ئەوەیکە مرۆڤی سەروەر لە خشتە بە رن و کرداری وەکوو بێ باکی ، بوێری ، سەرمەستی لای سەروەرەکان بەهای نەما و بزر بوو. خەڵکی مێگەل بۆ پاساو هێنانەوەی لاوازیەکانی خۆیان، کرداری «وشتر[11]» یان دایەپاڵ سەروەرەکان (حەقێقی،۹۹). نیچە لای وابوو، لە ڕوانگەی مێژووییەوە، ئاڵوگۆڕی لە بەها ئەخلاقییەکان لە ڕێگەی ئایینی یەهوودەوە دەستی پێکرد و ئاکاری مەسیحیش پەرەی پێدا. بەڵام ئەم سیستەمە ئەخلاقیە تا ئەو ڕادەیە کاریگەری لە سەر ئەخلاقی ئەورووپی دانا و ئێستاشی لەگەڵ بێ، ئەخلاقی زاڵ بەسەر خۆرئاوادا ئەخلاقی کۆیلایەتیە، بە بۆچوونی نیچە، ئەخلاقی مەسیحی دەمامکێکە بۆ شاردنەوەی ترسی خەڵکی سست و بێ ئیرادە و مێگەل و هەروەها کەرەسەیەکە لە دەس خەڵکی مام ناوەند بۆ لاواز کردنی ورەی مرۆڤی بەرز و کەسایەتی بەهێز، هەربۆیە چەمکەکانی

[11]- مەبەستی نیچە لە وشەی وشتر ئەوەبوو، ئەم وشەیە هێمای ئەخلاقی دواکەوتوو و نەریتیە و ئەخلاقی « شیر» ئەخلاقی مرۆڤی سەروەرە.

وەکوو ویستی ئازاد و بەرپرسیاری لە ڕاستیدا دەربڕی حەزی دەرونی خەڵکی لاواز و کۆیلەیە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە مرۆڤی بەرز، کەواتە ئەخلاقی ئایینی دژ بە ژیان دەوەستێتەوە و ڕقیەتی لە هەر چەشنە غەریزەیەکی شادیهێنەر. هەر بۆیە بەزەییهاتن بە کەسانێکی تر خەملاندنی تۆخمی کۆیلایەتیە، هەر کە بە بەزەییەوە چاو لە کەسێک دەکەیت، ورەی مرۆڤایەتی لێ زەوت دەکەیت و سووکی دەکەیت و ئەخلاقی کۆیلەی بە سەردا دادەسەپێنی، کەواتە ئەخلاقی مەسیحی ڕێگە لە مرۆڤە بەرز و بەهێزەکان دەگرێت و تۆخمی ترسی لە هەنادا پەروەردە دەکات (نیچە،١٣٨٧: ١٠٠-١٠١).

٦- هەڵسەنگاندنی بەها ئەخلاقییەکان لای نیچە

نیچە باس لە دوو جۆر ئۆستووره دەکات و لە ڕێگەی ئەم ئۆستوورانە، ئەخلاقی خۆرئاوا هەڵدەسەنگێنێ. ئۆستوورەی ئاپۆلۆن و دایۆنیسیۆس. ئاپۆلۆن نوێنەری ئەقڵە و سوقرات و ئەفلاتون بناغەی ئەم ئەخلاقەیان داڕشتووە. ئەخلاقی ئاپۆلۆنی چوارچێوەدار و بەڵگەمەندە و یاسا و ڕێسای هەیە و هەموو شتێکی ئەخلاق بنەمایەکی عەقلی هەیە. بەڵام لە ئۆستوورەی دایۆنێسیۆس دا، خودای سەرمەستی و خۆشی، سەما و هەستی ژیانە. نیچە کاتێ باس لە بەهای ئەخلاقی دەکات وەکوو جۆرێک بەرهەمی هونەری کەوا پڕە لە داهێنان چاوی لێدەکات. هونەرمەند داهێنەرە و بە بێ ئەوەی کە بایەخ بە هەڵسەنگاندن بدا، لەوپەڕی چاکە و خراپەدا چاو لە بەها ئەخلاقیەکان دەکات، هەر بۆیە مرۆڤی بەرز نموونەی هونەرمەندێکە، بە هەستی ژیان گۆچکراوە. نیچە هەستی حەقیقەت تێکدەدات وهەستی ژیانی لە باتی دادەنێ و حەقیقەت درۆیەکی گەورەی مێژووە بۆ هەڵفریوانی مرۆڤەکان. تەنیا ژیان بەهای هەیە و بەس، نیچە بەها جوانیناسەکان بەسەر بەها ئەخلاقیەکاندا سەردەخات. هەربۆیە بەهاکانی ئایین ترس و ملکەچی و کۆیلایەتی دەخولقێنن. کەواتە ئەخلاقی دایۆنێسیۆسی نموونەی بەرزی ئەخلاقی سەروەرەکانە و بەهای تایبەتی خۆی هەیە. گەرچی وتەزای ئەخلاقی مەسیحی کە لە ڕەخنەکانی نیچەدایە، بەربڵاوترە لە دیاردەی ئەخلاقی مەسیحی، بەڵام زۆربەی ئایینەکان و تەنانەت ئایدیۆلۆژیە سیاسیەکانیش دەگرێتەوە. بۆ نموونە نیچە ڕەخنە لە ئەخلاقی ئەرەستۆ ناگرێ، مەبەستی نیچە لە ڕەخنەی ئەخلاق، ئەخلاق بە گشتیە. نیچە لە کتێبی «ئەودیوی چاکە و خراپە» دژ بەو ئەخلاقانە دەجووڵێتەوە کەوا لە بەرانبەر سروشتدا ڕادەوەستن. هەربۆیە نیچە دەڵێ: ئەو نیهیلیزمەی یەخەی فەلسەفەی خۆرئاوا بەرنادا، بزربوونی بەها ئەخلاقییەکانە، مەرگی بەها ئەخلاقییەکان «مەرگی خودایە». مەرگی خودا هەمان زاڵ بوونی ئەخلاقی کۆیلەیە و بە گشتی نیچە دەیەوێت فۆرمی شیعر یان ئۆستووره بەسەر ئەقڵدا سەربخات. ڕەخنەکانی نیچە لە بەها ئەخلاقییەکان زۆر بەهێزن، نیچە پێمان دەڵێ ئەوانەی باس لە ئەخلاق دەکەن تەنیا لە ڕوانگەی هێزەوە ئەم کارە دەکەن و دەیانەوێت لە ڕێگەی خولقاندنی تابۆوە مرۆڤ ملکەچ و کۆیلە بار بێنن. سەرجەم ئایین و ئایینزاکان و سیاسەت و

ئایدیۆلۆژییەکان دەیانەوێت ویستی هێز بە سەر کۆمەڵگادا بسەپێنن. سا لە ڕێگەی ترس یان پەروەردە کردنی مرۆڤی دەسەمۆ بێ، یان ئەو هێزەی کەوا خودای پارە و گەندەڵی سیاسی لە دونیادا دەیکات. نیچە مێشکی مرۆڤ تیژ دەکاتەوە و بە وریاییەوە ورەمان پێدەدا چۆن لە دەسەلات و ئایین و فۆڕمەکانی ژیان تێبگەین. چۆن لەو ئەخلاقە گەندەڵانە بکۆڵینەوە دزە دەکەنە ناو مێشک وەک جاڵجاڵۆکە هێلانە دەکـەن و بوتی زەیـن دەخولقێنن!. نیچە کاریگەری لەسەر فەلسەفەی ئەخلاقی پاش خۆی داناوە. بە تایبەت هایدیگەر کەسێکە لە ژێر کاریگەری نیهیلیزمی نیچەدا جل و بەرگی ئەنتۆلۆژیەی بە بەردا کرد، فۆکۆی فەڕانسەیی کەسێکە کاریگەری نیچەی پێوە دیارە. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرینگە، خوێندنەوەیەکی نوێ لە ئەخلاقە، ئەم خوێندنەوە دژ بە ڕەوتی ئەخلاقی باوی فەلسەفیە، واتە هەمان ئەخلاقی سوقراتی – کانتییە. ئەبێ لە نیچەوە فێر ڕەخنە گرتن ببن. بەڵام ڕەخنە بەبێ بنەمای مەعریفی وەکوو تەوسێک وایە هەردەم مرۆڤی کۆیلە دەخولقێنێ، کاتێ نیچە ڕەخنە لە ئەخلاق دەگرێ، دەزانێ پاشخانی ئەم ئەخلاقە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە.

**سەرچاوەکان :**


١- فلسفه اخلاق، فرانكنا ، هادي صادقي ١٣٨٣ طه

٢- درآمـدي به فلسفه اخلاق و آر. اف . اتكينسون، سهراب علوي نيا ١٣٥٨ نشر مركز

٣- تـبار شناسي اخـلاق نيچه ، داريـوش آشوري ١٣٧٩. آگه

٤- فراسوي نيك و بد نيچه ترجمه داريوش آشوري ١٣٨٧ خوارزمي

٥- گـذار از مدرنيته ، شاهـرخ حقيقي ، ١٣٧٨، آگاه

٦- نيچه ، ياسپرس ، ترجمه سياوش جمادي ، ١٣٦٩ ،ققنوس

٧- كليات فلسفه ، پاپكين، مجتبوي ، ١٣٦٩، حكمت

٨- فلسفه مدرن اروپايي ، سولومون ،حنايي كاشاني: قصيده

٩- نـيچه ، اسـترن ، ترجـمه عـزت الله فولادوند : طرح نو

١٠- تـاريـخ فلسفه اخـلاق ، السـايـدر مك اينتاير، انشاءالله رحمتي ، نشر حكمت

١١- Nietzsche. Robert. C. Solomon ٢٠٠٣

# ستایشی «نیتچە» لە هونەرمەند

نووسینی: دکتۆر بابەک ئەحمەدی
و. لە فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد

لەدایکبوونی تراجیدی (زایش تراژدی) بە پێنووسی نیتچە لەواقیعدا هەوەڵین پەرتووکی بایەخدار و گرینگی ئەوە، کە هەرچەند ساڵانێکی زۆر لە پێش چاپکردنی، واتە ساڵی ١٨٨٦ خستیە بەر شاڵاوی ڕەخنەوە، بەڵام بناغە ئەسڵیی و سەرەکییەکانی ئەم پەرتووکەی وەلانەخست و ڕەتی نەکردەوە. بە پێچەوانەیشەوە ئەم بناغە ئەسڵیی و سەرەکییانە هەم لە (ڕەخنەگرتن لە خود) و هەم لە تاقمێکی زۆر لە نووسینەکانی نیتچە دووپـات بونەوە و هەروەتر سەلمێنراون. من لەم وانەیە بە چەشنێکی گشتی باسەکەم لە بەستێنی ئەم کتێبە و ڕوانگەی نیتچە لەمەڕ هونەرمەند چڕ کردۆتەوە. باسێکی ورد و چڕوپڕتر لەبۆ ناسینی لایەنە جیاوازەکانی هزر و تێفکرینی (جوانیناسانە) ئێستاتیکای نیتچە لە بەرهەمەکانی دیکەی ئەو زۆر بە نیاز و پێویستە، بەڵام لە چوارچێوەی مەبەستی ئەم وانەیەدا ناگونجێت و دێتە دەرێ.



بابەک ئەحمەدی

باسەکەی پەرتووکی «لەدایکبوونی تراجیدی» تەواوەن لەمەڕ هونەرە و لەم کتێبە سەرنجدانی قووڵ و بناخەیی فەیلەسووف لە هزری یۆنانی دەکرێت بەدی بکەی. تاقمێکی زۆر لە هزرڤانان و فەیلەسووفانی ئاڵمانیایی لە ژمارەیەک لە گرینگترین نووسینەکانی خۆیان بەردەوام لە یۆنان چەشنی سەرچاوەی هزر و ئەندێشەکانی خۆیان ڕاماون. لێڕوانینی نیتچە لە تراجیدی یۆنانی یا ڕوانگەی هایدگەر لە فەلسەفەی پاش سوکرات، پەیوەندیار و گرێدراو بە داب و نەریتێکی دێرینە لە فەلسەفەی ئاڵمانیدایە. یەکێک لە هەوەڵین دەقگەلێ کە هونەرناسێکی ئاڵمانیایی بە زانیاریی گشتگیر و بەرچاوی فەلسەفی لەمەڕ فەرهەنگی یۆنانی نووسی، کتێبێکە بەناو (هزرگەلێک لەمەڕ لاساییکردنەوە لە هونەری شێوەکاری و پەیکەرتاشی یۆنان) بەرهەمی ((یۆهان یوئاخیم وینکلمان)) ە کە لە ساڵی ١٧٧٥ی زایینی بڵاوکرایەوە. ئەمە پەرتووکێک بوو لەمەڕ هونەرەجوانەکان کە پانتایی بابەت و هەروەتر کارتێکەرییەکەی چەند قات لاسەرووی ئەم قەڵەمڕەوە بەرتەسک و سنووردارە دەبوو. بەڕای (وینکلمان) جوانی فەرمان و هەرامەیەکی خودایی و زۆر پیرۆزە، کە نموونەی پڕ شکۆی ئافراندنی لە هونەری یۆناندا بەدی دەکرێت. لەواقیعدا (وینکلمان) بە ڕوانین و سەرنجدان لە فەرهەنگی هزری یۆنانی جەختی کرد هەتا لەمپەرێک لەبەرامبەر دزەکردنی کلاسیزمی فەرەنسی بۆ نێوان هزری ئاڵمانی بڕخسێنێت. ئەو لەم کاری خۆیدا سەرکەوتوانە هەنگاوی دانا. ئاماژەکانی بۆ زەنجیرە پەیکەرەکانی (لائۆکین) کە لە (ڤاتیکان)دا دەپارێزران، بووە هۆی ئەوەی کە لسینگ وتارنامە گرینگەکەی خۆی داڕێژێت و بنووسێت کە هەر لەم وانەیە قسەم لێکردووە. نرخاندنی (وینکلمان) لە هونەری یۆنانی، زمانی ڕەخنەکارانەی هونەری ئاڵمانی دەوڵەمەندکردووە و زۆربەی ئەو زاراوانەی کە ئەو بەکاری هێناون لە نووسینە فەلسەفییەکانی دواتردا کەڵکی لێ وەرگیراوە. ئایدیال و ئارمانی جوانی یۆنانی کە وینکلمان خستییە ڕوو، دواتر لە بەرهەمەکانی (هیگڵ)، (نیتچە)، تەنانەت (هایدگەر) و (هانا ئارێنت) هاتە گۆڕێ و باسی لێ ساز بوو. لە هەمان کاتیشدا ئاڵمانییەکانی سەدەی هەژدەهەم بەم پەسند و ستایشتە لە یۆنان، وەڕەزبوونی خۆیان لە باروودۆخی ڕامیاری وڵاتەکەیان نیشاندەدا، ئەمە جۆرێک خولیای سازبوون و ڕێخستنی سیستەم و حکومەتێکی سەربەخۆ و ئازاد و پشت بەستوو بە ڕەزامەندی جەماوەر بوو.

وێنەی (هێردێر) و (وینکلمان) لە (ئەسینا) وێنەی شارێکی سەربەخۆ بوو کە لەوێدا جەماوەر، ساخ و سلامەت و سەرخۆش بوون و لە کەرەسەگەلی هاوشانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بەهرەمەند بوون. لەم دەقگەلە ئاماژەیەک بۆ کۆیلەداری ئەسینایی و بەرتەسکبوون و تەنگایی دێمۆکراسیی ئەسینایی نەدەکرا. (گۆتە) و (شیلێر) زۆر واقیع خواز و ڕیالیستانەتر لە یۆنانیان دەڕوانی، بەڵام ئەوانیش لە هەر دەرفەتێک سوودیان وەردەگرت هەتاکوو گرینگی تاکەکەسی و بلیمەتی تاکخوازی لە فەرهەنگی یۆنانی وەبیر بهێننەوە و بە هاوڵاتییانی خۆیان فێرکارییەکی نوێ پێشنیار بکەن. (شیلێر) لە پەرتووکی (لەمەڕ فێرکاری جوانیناسانەی مرۆڤ) لە سیستەم و جەماوەری یۆنانی بە شێوەیەک دواوە کە بتوانێت ئەم ڕوانگە و دیدگا پێشڕەوەی خۆی بهێنێتە گۆڕێ کە نابێت لە نێوان تاک و کۆمەڵ دژایەتییەک بڕەخسێت. هەروا کە لە ئەسینادا هەر تاک و کەسێک چرکەساتێک بوو لە خواست و ویستی هەمووان. وێنایەک لەم هاودەنگیی تاک و کۆمەڵ لە بیروبۆچوونە سۆشیالیستییەکانیشدا ڕخسابوو، هەر خوێنەرێکی بەرهەمە



شیلێر

بەراییەکانی مارکس نموونەگەلێک لەوانە وەبیردەهێنێت. دیمۆکراسی ئەسینا و بە گشتی فەرهەنگی یۆنانی بەلای ڕۆمانتیک خوازانێ وەکو (هۆڵدێرین) و (کلایست) کانگای بایەخگەلی مەعنەوی زانرا و فەیلەسووفانیش بە هەر بۆنەیەکەوە ئاوڕیان لێدەدا و ئەم بەزمە هێندە درێژەی پێدرا و پەرەی سەند هەتا ئەو ڕادەیە کە لە ساڵی ١٨٧٢ پەرتووکی (لەدایکبوونی تراجێدی)ی (نیتچە) بڵاوکرایەوە، کاری داهێنەرێک دەسپێکرد کە ڕادیکاڵترین ڕەخنەکارییەکانی ڕۆژگار و سەردەمی مۆدێرنە.

لە کۆتایی وانەی چوارەمدا ئاماژەم بۆ ڕەخنەی نیتچە لەسەر بڕیارە جوانیناسانەکەی کانت کرد. لەوێ دیمان کە نیتچە، کانت بەو مەسەلە تاوانبار دەکا کە لە فەلسەفەی هونەری خۆیدا لە (خوێنەر-بیسەر) ئاوڕدەداتەوە و نەک لە داهێنەرەکەی، لەواقیعدا لە کتێبی نیتچە واتە (لەدایک بوونی تراجێدی) سەنتەری باس و بنچینەی بڕیارەکان، ئاوڕدانەوە و سەرنجدان لە هونەرمەندە و ئەم بەرهەمە جەختێکە بۆ گوزەردان و تێپەڕین لە چەمکی بلیمەتی و هەروەتر ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە کە هونەرمەندی ئازاد و سەربەست کێیە. بەڵام پەرتووکەکە بە چەمکێکی میتافیزیکی دەسپێدەکا: نەهێنییەک لە ناخی جیهاندایە کە ئەم ژیانە لەبەرچاوی ئێمە خۆفناک و تراجیدک دەکا. سالانێک دوای ئەمە نیتچە لە پەرتووکی (وەهای وت زەردۆشت) هەروا دەنووسێت کە: ژیانی مرۆڤ ترسناکە، و ئێستایش هەر بێمانایە. لەم وشەی (ئێستا)یش واتایەکی قووڵ شاردراوە، لە بێ هیوایی شۆپێنهاوێر دوورکەوتوونیەتەوە و پێمان ناوەتەوە قەڵمرەوی شەک و گومانەوە. نیتچە هەر لە هەوەڵین هەنگاو پێمان دەڵێ دەسی بە (بەڵێ گۆیی، کردووە) لە (لەدایکبوونی تراجێدی) دەخوێنینەوە کە بە یارمەتی گرتن لە هونەر دەتوانین لەم ترسە و لە ئاڕاستەی تراجێدیکی ژیان خۆمان قوتار کەین و تێپەڕین. هەتا ئێرە هێشتا دابڕانێکی ڕادیکاڵ لە هزری شۆپێنهاوێر ناتوانی بەدی بکەی، بەڵام سالانێک دواتر لە (ڕەخنەی لەخود) (١٨٨٦) نیتچە دەڵێ دەشێ هەر لەم کتێبە هێمانەگەلێک لە دژایەتیی هزری شۆپێنهاوێر بەدی بکەی. بەڵام ئەم هێمانەگەلە کامانەن؟ ناوەڕۆکی سەرەکیی کتێبەکەی نیتچە نەک تراجێدی یۆنانی، بەڵکو هونەری ئێستای ئۆروپاییە. نیتچە لە هەوەڵیان زۆر دەدوێت بەڵام باس و خواستەکەی لەگەڵ دووهەمیدا چڕدەکاتەوە. بەڕاستی یۆنانییەکان چیان بووە کە ئەم هزرڤانە لەوان زۆر دواوە؟ نیتچە (وەکو هایدگەر) لەو بیروباوەڕەیە کە یۆنانییەکان بە باشی لە نهێنی ئەو جیهانە شاراوەیە ئاگایاربوون. مەزنایەتی ڕۆحیان ئەوە بوو ملکەچ و فەرمانبەری ئەو جیهانە نەدەبوون، بەڵکو دژایەتیشیان نیشاندەدا و لەبەرامبەری ئەوێستان، هونەر بۆ ئەوان بە واتای (بەڵێ گوتن) بە جیهان بوو. دیۆنیزۆس (بەڵێ گۆ) بووە. دیۆنیزۆس خودای جێژن، شەراب و سەرخۆشییەکان، دەربڕینی ڕووناکی و خۆشی بووە. لە وارسکە (غەریزە) و ویست ئەدوا. بە بێ ئەوەی خۆی ترس و تاتێلی لێ بنیشێت. شۆپێنهاوێر زانیبووی کە (گیان و ڕۆحی جیهان) ویست و خواستە، بەڵام خۆی لەم هێز و توانا ناکۆتایە دەترسا. دیۆنیزۆس ئێمە فێر دەکات کە لە خواست و ویستی خۆمان نابێت تووشی مەترسی بین و تەنانەت تووش شەرمیش

نەبین، بەڵکو بەهۆی گەیشتن بـەوە زۆریـش سەرخۆش و شادومان بین. لە جێگەیەکی تری (لەدایکبوونی تراجێدی) دیۆنیزۆس بە هاوشێوەی بەربەرەکان و تایتانەکان زانراوە. ئەو کەوشەن و سنوور ناناسێت و لە ڕێگاکەیدا لەمپەر و کۆسپێک بە جێ ناهێڵێتەوە. جیهان ترسێنەرە، بەڵام مل نـەدان لەبەر ترس واتـە بە بەڵێ وڵامدانەوەی بانگەهێشتی شەڕی جیهان و لەبەرانبەر هێز و دەسەڵاتیدا و دامەزراندنی هێز و تینی خۆی، دیـارە کـاری مرۆڤێکی سەربەخۆ و ئـازادە. دیۆنیزۆس خۆی بێ ئەنجام بێ کۆتاییییە، دێتە سەما، چوونکا سەما بێ کۆتایی لەش و پەیکەر لە فەزادا ئاشکرا دەکات. شوێن ڕەتدەکاتەوە و خودی (زات) مۆسیقایە. نیتچە لە زاری (شیلێر) ەوە دەگێڕێتەوە کە شاعیر بەر لە ئافراندن، هیچ وێنەیەکی تەکووز لەو شتەی کە دەیهەوێت بیرەخسێنێت، نابینێت بەڵکوو (تەنیا حاڵەتێکی مۆسیقایی) هەست دەکات. سەرەتا ئەم حاڵەتەیە، پاشان شێعر، مۆسیقا هونەری دیۆنیزۆسە، بەڵام هونەری دیداری (وەک شێوەکاری و پەیکەرتاشی) هی ئاپۆلۆنە. ئاپۆلۆن لایەنێکی دیکەی فەرهەنگی یۆنانی دەخاتە ڕوو. نوێنەرایەتی کەوشەن و چوارچێوەکان دەکا. وەکو تیشکە، هەموو شتێک دیاری دەکاو (لە شوێنی خۆیدا دایدەنێت) ئاست و ئەندازە ڕووندەکاتەوە و تیشکی سەردەخات، (هـەروەهـا) شوێنگە و بناغەی تاکمەندیش. هۆنەری یۆنانی بەیانکەری هەردوو هێز و وزەی دیۆنیزۆسی و ئاپۆلۆنییە.

ژیان ترسێنەر و نالەبارە. ئاپۆلۆن سیمای ژیان بە ڕووبەندێکی ئێستاتێکی (جوانیناسانە) دادەپۆشێت و لەبەر ئەوەی کە جەخت دەکا هەتاکو دزێوییەکان بشارێتەوە، ڕووبەندێک کە ساز دەکات ڕەوشتی و



ئاکارییشە. ئاپۆلۆن لە ئایدیالەکان و بنچینەکان دێتە پەیڤەوە و بە هەموو شتێک ئەگەر بێتوو بە پێچەوانەی بناغەکانی ژیان بن، تەنانەت بە ژیانیش (نا) دەڵێت، لە پەیکەرتاشی و چیرۆکە پاڵەوانییەکانی هۆمێریدا نیتچە دەڵێت: (( لەو ساکارییە زێدەڕۆییانەی هۆمێرییە)) ورەی ئاپۆلۆنی زاڵە. لە تابلۆ شێوەکارییەکانی (ڕافائێل) و لە ملکەچی و فەرمانبەری ئایینی ئەویشدا هەمیسان ئەمە وزەی ئاپۆلۆنییە کە چشتەکان یەک لا دەکاتەوە. ژیان ترسێنەرە، بەڵام لەویش ناحەزتر و خۆفناکتر وازهێنان و ویستی ژیانە. کەواتە دیۆنیزۆس ڕێگەیەکی تر دەگرێتە بەر، بۆ ژیان ئامێز دەکاتەوە لەبەر ئەوەی گۆڕانکاری بەسەردا بێنێت. بە تەواوی دڵ و گیانییەوە ئەوە دەخوازێ لەبەر ئەوەی گیانی بکێشێت و نیتچە ستایشتی ژیان لەهەر شتێک کە لەگەڵ ویست، هێز و خواست هاوهەنگاو بێت، دەکات. ئەو ئاماژە بۆ ئاوازە ئۆستوورەییەکان (هەڵقەی نیبلونگەکان) دەکات و ستایشتی (واگنێر) دەکات چوونکە نهێنی گرێدانی ئۆستوورە، مۆسیقا و ژیانی دەرککردووە و پێی زانیوە. چەند ساڵ دواتر ئۆپێرای (پارسیڤال) بە وەرەزبوونەوە وەلا دەخات. چوونکا پێی وابوو (واگنێر) بووەتە فەرمانبەر و ملکەچی ڕۆح و ورەی ئایینی. دیۆنیزۆس لە بناغەکان هیچ ناڵێت، بەڵکوو ژیان دەرەخسێنێت. لە هەڵات و کۆچ نشینی دوورە پەرێزانە هەڵدەگەڕێتەوە و ڕێگەی چارەی درێژخایەنی شۆپێنهاوێر ستایشت ناکات. بەڵام نیچە پەسەند و باوەر دەکات کە ڕێگایەکی دیکەش هەیە، کە ئەویش تەنها هونەرە کە دوا قسە دەکات. هونەر واتە ڕوخساری ترسێنەری ژیان دەرئەخات و دەیخاتە ڕوو و بە ڕووبەند دایناپۆشێت. چەند ساڵ دواتر نیتچە لە دەقی (لەسەرووی چاکە و خراپە) دەڵێت:« هەرچیی قووڵ بێت، حەزی لە ڕووبەندە، بەڵام قووڵترین شتەکان لە وێنە و تەمسیل وەڕەزن». کات لە نێوان ئێمە و کەتوار مـەودا دادەنـێت، نیتچە شاعیران چەشنی هەموو بەکاربەرانی زمان بە لافزەن و درۆزن دەژمێرێت، بەڵام بەم بیرە پشتی ئەستوورە کە شاعیران خاوەنی ئەم هێژایەن کە «خـۆیـان دەزانـن ڕاسـت ناڵێن و ئەمەش ناشارنەوە». هونەرمەند کەسێکی ڕوو و زۆر ڕاشکاو بێ پێچ و پەنا و بێ گیر و گرفتە، قووڵ تێدەهزرێ و بوێری ئەوەی هەیە بە ژیان (بەڵێ) بڵێت، بە جیهانێک کە چاک نییە (کە ئەگەر چاک ببوایە ئیدی بەڵێ وتن پێویستی بە بوێری نەدەبوو و هێندەش گەمژانە دەکەوتە بەرچاو). هونەری دیۆنیزۆسی ویست و وارسکە (غەریزە) و حەز و خولیای لاسار بۆ ئازادی و سەربەستی و شادومانی دەهێنێتە گۆڕێ و ستایشتی دەکات، لەبەر ئەوەی کە عەوداڵی چێژ و لەزەتێکی سەرترە و خوازیاری سەرخۆشبوونێکی گشتیترە. لە نێو ئەم سەرخۆشبوونە دیۆنیزۆسی و مەسیحییەت هیچ دەلاقەیەک لەبۆ ئاشتی وەدیارنەکەوتووە. نیتچە شێوە و ڕەوشتی کۆیلەکان بە سووک دەژمێرێت و جیهانێک کە کاری خودایەکی ناقس و ناتەواو و لانەواز و ئێشکێشە بە هیچ دەزانێت. دابڕانێکی وەها لە بزاڤی کۆیلەیی، وا لە نیتچە دەکات کە بڵێت: (لە ساتەوەختی جیابوونەوە لە ژیان دەبێت چەشنی ئۆلیس لە نائۆسیکا جیاببینەوە ((واتە، پتر نزابێژی بوو هەتا ئەڤینداری بێت)). لە خودای سامی کە نیتچە بە دوژمنی خۆی داینابوو گەڕێین، بەلای جیهانی یۆنانی بگەڕێینەوە کە نیتچە



زۆری تامەزرۆیی دەکرد. دەیوت یۆنانیان زۆر بە شیاوی و چاکی بۆیان دەرکەوتبوو کە فەرهەنگ ئاوێتەیەکە لە هێمانەگەلی دیۆنیزۆسی ئاپۆلۆنی. ڕەنگە بکرێ ئەمەیش بدرکێنین هاونیهادەیەکە لە هێزی ژیان (دیۆنیزۆس) و ئەڤین (ئاپۆلۆن) کە بە هەر چەشن تین و وزەی خەیاڵپەروەرییە. بەڵام نیتچە ئەڤین بەلاوە نانێت و لە شێوەیەکی نوێی ئەڤینداری دەدوێت. ئێستا بەو گیانە سەربەستە دەگەین کە هێزی ژیان و خۆشویستنی بە یەکەوە گرێدەدا: هونەرمەند، بلیمەت، ئەو کەسەی کە چەشنی دیۆنیزۆس دەڵێت: (بەڵێ). سەرەڕۆیی، جیابوون لە کۆمەڵ و نیتچە پێی دەڵێ: (دەجالی). کەسێک کە (خولیای مسیانیک) لادەخات، بۆ ئەوەی کە خۆی هەیە و ئەمەش بۆ ئەو بەسە. کەسێکە کە ئارمانجی بەرەکان و گەلەکان بەلاوە دەنێت، چوونکە خۆی لە پلەوپایەی تاکەکەسیدا هەیە و ئەمەش بۆ ئەو بەسە. لەبەر ئەمەیە نیتچە دەبێتە دوژمنی سەرسەختی دیمۆکراسی و سۆشیالیزم، نیتچە هەوەڵین پێغەمبەرێکە لە کۆمەڵ بێزارە، ئەمە یەکەم فەیلەسووفەی داهاتوو، دەیەوێت هاورێیانێک بۆ خۆی پەیدا بکات: «داهێنەری پەیجۆری هاوڕێیانە، نەک کەلاکەکان و گاگەلەکان و ئیمانداران».

نیتچە (بە شەک و ئەگەرەوە) بڕیارەکەی (شلگێل) ستایشت دەکات کە لە تراجێدیای ئەسینایی هاوچڕان هەمان بینەرگەلی ئادیالن، پتر شایانی ڕووداوەکانن تا کایەگێڕانی چالاک. نیتچە لە جێگایەکی تر لەگەڵ (شیلێر) دا هاودەنگ دەبێت کە دەیوت هاوچڕان وەکوو لەمپەر و بەربەستێکن لە بەرامبەر هێرشی کەتوار (واقیع). ئەوان، هەمیشە ئێمەیان لە جیهانی تراجێدیا ڕاگرتووە. نیتچە لەم دیدگا و ڕوانگە ئەمڕوییە خۆی نزیک دەکاتەوە کە هاوچڕان خاوەنانی ڕاستەکیی دوونیای خەیاڵین و بەم پێیە هەم شایەتن و هەم بینەری ئایدیالین. یەک تایبەتمەندیی گرینگی (لەدایکبوونی تراجێدی) نزیکایەتیی لە چەمکی(جیهانی دەق)ە . بەڵام لەمەڕ ئەم شتەوە نابێت ئێمە زێدەگۆییش بکەین،

چوونکە کۆسپ و لەمپەرێکی گەورە لەبەردەمی نیتچە داچەقابوو: ( قەست و نیازی داهێنەر). ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە نیتچە بەردەوام جیهانی دەق و دوونیای زەینی گەورە بە یەک شێوە لە قەڵەم بات و هونەرمەند بە بەیانگەری ڕاستەقینەی ژیان پێناسە بکات. بەڵام هەمیسان حەز دەکەم هەوڵ لەسەر لایەنی پێشڕەوی باسەکەی نیتچە بکەم. هونەرمەند بەیانکەری زندەگییە. لە حاڵێکدا مۆدێڕنیتە ژیان بە هەزاران فێڵ و کەڵەک دەشارێتەوە. لە ژیاری مۆدێڕندا کە زانست و ئەزبەنیگەری هاوشان و هاودەنگن (و نیتچە یەکەم هزرڤان بوو کە لە پێکبەستراویی زانین و دەسەڵات دواوە)، نهێنییەک حەشاردراوە. لە ناخدا، جێیەک کە نیتچە بەردەوام لێی دواوە، شتێک ڕوودەدا کە لە ئاکام ئەم ژیارە دەتەقێنێتەوە .

هێزێکی دڕننە و کێویلە، وارسکەیی، کرچ و کاڵ، گەنج. کێ لەمە تێدەگات؟ هونەرمەند - فەیلەسووف، زەردەشت. لە (لەدایکبوونی تراجێدی) هەتا دوایین بەرهەمەکانی نیتچە، ئەم هونەرمەند - فەیلەسووفە (کە زۆر جار نیتچە بە فەیلەسووفی داهاتوو ناوزەدی کردووە) هەروەک داوەری ژیان و داهێنەری بایەخە نوێیاوەکان دەرئەکەوێت. هاوڕێکانی ئەو هەڵۆ و مارن ((لە خۆبایی ترین و وشیارترین گیانلەبەران لە ژێر تیشکی هەتاودا».

بەڵام لە واقیعدا هونەرمەند، ئەم مژدەدەری نوێیاوەکان هەمیشە تەنیایە: «ئەو کاتەی کە لە ترۆپکدام ، بەردەوام خۆم بەتەنیا دەبینم».

زەردەشت هەر کە دەگاتە ماڵێک دەڵێت:

«ئەی تەنهایی! ئەی خانووەکەم، تەنهایی دەنگت چەن خۆش و خەمڕەوێنانە لەگەڵمدا دەدوێت. لەلای تۆ هەرچی هەیە ئاواڵەیی و ڕووناکییە. لێرەدا کاتژمێر و ساتەکانیش بە شێنەیی بەسەر دەچن و تێدەپەڕن».

ژێدەر:
حقیقت و زیبایی، ( درسهای فلسفه هنر)، نوشته دکتر بابک احمدی، درس هفتم ( نیچه)، صحص ١٥٠ تا ١٥٦، انتشارات مرکز، چاپ اول: ١٣٧٤

پەراوێزەکان:

١- لەم بابەتە بڕوانە ئەم پەرتووکە سەرنجڕاکێشە: J. Young, Nietzsches Philosophy of Art, Cambridge Up, ١٩٩٢.

٢- بڕوانە بەشی «لسینگ و پێشینیانی ئەو» لە: رنە ولک، مێژووی ڕەخنەی نوێ، وەرگێڕانی ئەرباب شیرانی، تاران، ١٣٧٣، لاپەرەکانی ٢٠١ تا ٢٣٤، بەتایبەت لاپەڕەکانی ٢٠٦ تا ٢٠٨

٣- j. Patocka, L art et le temps, tra. E. Abrams, Paris, ١٩٩٢, p ١٨٩.

٤- ف. نیتچە، وەهای وت زەردۆشت، وەرگێڕانی داریووش ئاشووری، تاران، ١٣٧٢، لاپەڕەی ١٩.

٥- F. Nietsche , the Birth of Tragedy, tra. W. Kaufmann, New York, ١٩٦٧, p ٢٤.

٦- ibid , p ٤٦.

٧- ibid, p ٤٩.

٨- ibid , p ٣٦ , p ٤٥.

٩- ibid, p ٣٨.

١٠- ibid, p ٤٦.

# دەربارەی سلاڤۆی ژیژەک

نووسینی: ویلیام دێل و تیمۆتی بێل
و. لە ئینگلیزییەوە: پێشڕەو محەمەد

سلاڤۆی ژیـژەک (١٩٤٩) توێژەری پێشکەوتووە لە پەیمانگای سۆسیۆلۆژیی لە زانکۆی لوبلیانا، سلۆڤینیا، شوێنی لەدایکبوونی. هەروەها پرۆفیسۆری میوان بووە لە چەندین زانکۆی ئەمەریکادا.

دوای خوێندنە ڕەسمییەکەی، ژیژەک نەیتوانیبوو پۆستێکی ئەکادیمی وەربگرێت (لەبەر ئەوەی بەڕواڵەت پێدەچوو بە ئەندازەیەکی تەواو مارکسیست نەبووە) و لەبەر ئەوە وەکو وەرگێڕێک دەستی بەکارکردن کرد. لە ١٩٧٠دا، ژیژەک کۆمەکی بە دامەزراندنی لاکانییە لوبلیانییەکان کرد، ئەم گروپە لە کۆمەڵە ڕۆشنبیرێکی گەنج پێکهاتبوو، کە پەیوەندییان بە لاکانەوە هەبوو. (خودی ژیژەک ماوەیەک لە پاریس لەگەڵ لاکان و ژاک ئالن میلەر کاریدەکرد). ئەم گروپە گۆڤاری «Problemi» دەردەکرد، بەشداریکردنەکانی ژیژەک لەم گۆڤارەدا زێتر ڕەهەندی شیعری یاخود لایەنی نوکتەییانەیان



سلاڤۆی ژیژەک

هەبوو. جارێکیان بەناوێکی خوازراوەوە تێڕوانینێکی نێگەتیڤانەی ئاراستەی کتێبێکی خۆی نووسی، کە دەربارەی لاکان بوو. ئەمجۆرە یاریکردنانە لە بەرهەمەکانی دواتریشیدا دەبینرێن.

زێتر ژیژەک بەهۆی ئەو تەفسیرانەوە دەناسن، کە بۆ کولتووری ئاپۆرە (عامە)، بەتایبەت فیلم و تەلەفزیۆن کردوونی (لە فیلمەکانی ئەلفرێد هیچکۆکەوە بیگرە تا دەگاتە ماتریکس و بەرنامەی ئۆپێرای ڤینفرای)، لەم نووسینانەیدا، زێتر بە ڕوانگەی کۆمەڵێک لە بەرهەمە تیۆرییەکانی مارکس و لاکان و چەندانێکی دیکە، ڕوودەکاتە





ئەم لایەنانە. بەم هۆیەوە، هەندێک کەس، زۆرترین کارەکانی ئەو بە درێژدادڕی و ئاستێکی نزم دادەنێن. هەڵبەت ئەمە بەم جۆرە نییە. لە هەموو بەرهەمەکانیدا، ژیژەک هەوڵدەدات بۆ ئەوەی تیۆریی کولتووریی بەرەوپێشەوە بەرێت، کە چەمکە دەروونشیکارییەکان -بەتایبەت لاکانی- چەمکی سووژە لەگەڵ چەمکە مارکسییەکانی وەکو ئیدیۆلۆژیی و مێژووی سیاسیی بەیەکەوە گرێ بدات. لەو زنجیرە کتێبەی لە دەزگای ڤێرشۆ بڵاویکردوونەتەوە بەناوونیشانی («لەوێ بوو» Where it was)، وەسفێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەو ڕیسکە سیاسییە دەکات، کە لە کایەی ناڕوونی مەترسیداری ڕۆشنبیرانەدا بوونی هەیە: «لێکگرێدانی تەقینەوەئاسای دەروونشیکاری لاکانی و نەریتی فکری مارکسیستی دەبێتە هۆی ڕزگاربوونێکی دینامیکی و بەردەوام، کە ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت تاوەکو پێشگریمانەکانی خولگەیی سەرمایە بخەینە ژێر پرسیارەوە». ژیژەک دەروونشیکاری لاکانی بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە تێگەیشتنێکی تایبەتی سووژە بگات، ئەو سووژەیەی لەنێو خودی ڕێکێتی شتەکاندا دەژیت و کاردەکات، کە بەچەند ڕێگەیەک لۆژیکی ئەم دواییەی کەپیتالیزم دیاردەخات و هەڵیدەگەڕێنێتەوە - خولگەی سەرمایەی دواتر لەنێو دەبات- کەواتە چەند ئەگەری نوێی هەبوون دەهێنێتە ئاراوە، ئەو

هەبوونەی لەم جیهانەدایە و پەیوەندی بەوانیدیکەوە گرتووە.

ژیـــژەک رەخـنــە لـە تـیـۆریـی سـووژەیـەتـی (Subjectivity) و وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی (Social Transformation) جودیت بەتلەر دەگرێت، ژیژەک باوەڕی وایە ئەم تیۆرییەی بەتلەر ناتوانێت خۆی لە سەنگەری پانتای سیمبولی ڕزگار بکات. بەدیدی ژیژەک، ئەو ڕوانگانەی وێرانکارانەن و ئازاری جێندەرێتی دەدەن و بەتلەر بە زەرووری دەیانبینێت، «سەرەنجام پشتگیری لـەو شتە دەکەن، کە بڕیاربووە وێرانی بکەن»، لەبەر ئەوەی پانتای سیمبولی «پێشتر دەرفەت و توانستی بەم بوارەی 'سەرپێچییەکان' داوە»؛ ژیژەک بەمجۆرە وەسفی پانتای سیمبولی دەکـات: «بریتییە لە ماتریکسێکی سیمبولی گەورە، کە لە نێو کۆمەڵێکی بـەربـڵاوی دامـەزراوەکـان و ڕیتوال و پراکتیسە

L

A

C O M

A

N



ئیدیۆلۆژییکییەکاندا بەرجەستە بووەتەوە». ئەم پانتایە «لەبەر ئەوەی بە قوڵی ڕیشەی داکوتاوە و هەبوویەکی زاتی و جەوهەرییە، بۆیە ناتوانێت لەلایەن ژێستە پەراوێزییەکان و بێدەستەڵاتەکانی جێگرەوەی جێبەجێکارەوە، لاواز بکرێت و لەنێو ببرێت»، کە بەتلەر وەسفی کردوون (سووژەی هەستیار، ل٢٠٨).

ژیژەک بۆ لاکان دەگەڕێتەوە تاوەکو پەرە بە تیۆرییەک بدات دەربارەی کردەی سیاسیی، کە لەو تیۆرییەدا هەرچەند سووژە ناتوانێت شوێنێکی یونیڤێرسەل و گشتگیر فەراهەم بکات تاوەکو لە بەرانبەریدا بووەستێت و بچێتە دەرەوەی سنووری دەستووریی سیمبولییەوە، بەڵام لە بەرانبەردا توانستی ئەوەی هەیە بە چەشنێک کردار بنوێنێت، کە «هێزی هیپۆنۆتیک»ی ئەو دەستوور و پانتایە بشکێنێت و لەناوی بەرێت. ئەم «کردە ڕەسەنە» "authentic act" بە سانایی یەکێک نییە لە چەند ئۆپشن (هەڵبژاردن)ێکی باوی نێو دەستووری شتەکان، بەڵکو لە ڕاستیدا، ئەو کردارەیە، کە فێڵ و گزی ئەو دەستوورە ئاشکرا دەکات و ئەو دەستەڵاتەش بەرەو نەمان دەبات، کە هەیمەنە بەسەر سووژەدا دەکات، لەم ڕووەوە، ڕێگە بۆ فەزایەکی نوێی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە. بەمجۆرە، ژیژەک جەخت لەسەر ئیمکانی نوێنەرایەتییەکی ڕادیکاڵی حەقیقی بۆ ئەو سووژانە دەکاتەوە، کە گرفتاری دەستووری کەپیتالیزمی دوایین هاتوون، تەنانەت هەندێکجار جەخت دەکاتەوە، کە ناتوانین بنەمایەکی پتەو بۆ ئەم هۆکارێتی و نوێنەرایەتییە بونیاد بنێین. بە مانایەک، کردەیەکی ڕەسەن بریتییە لە باوەڕێکی خز (leap of faith)، واتا مرۆڤ لە شوێنێکی بێ متمانەوە هەنگاو بەرەو دەرەوە هەڵدەنێت، بەڵام بەبێ ئەوەی بزانێت بەرەو کام زەوی وەردەچەرخێت.

هەندێک دەروونشیکاری، بەتایبەت دەروونشیکاری لاکانی، لە بنەڕەتدا وەکو دەروونشیکارییەکی کۆنزەرڤاتیڤانە سەیر دەکەن، واتا بەو هەنگاوەی دەزانن، کە ئامانجی لە شیکارکردن، بریتییە لە کۆمەککردن بە ئاشتکردنەوەی تاکی شیکارکراو لەگەڵ دەستووری سیمبولیدا - کارەکەی لە شیکارکردندا ئەوەیە، کە هێرشەکانی ناخودئاگا بەجۆرێک بهێنێتە ژێر دەستی خۆیەوە بۆ ئەوەی ئەوانە خۆ ویستانە بخاتە نێو دەستووری شتەکانەوە و یەکسانیان بکات، تەنانەت ئەگەر ئەم دەستوورە بریتی بێت لە وەهمێکیش. لە بەرانبەردا، ژیژەک جەخت لەوە دەکاتەوە، کە دەروونشیکاری بۆ لاکان، دەبێت ئەو توانستە بە تاکی دەروونشیکارکراو بدات بۆ ئەوەی تێبگات، کە ئەم دەستوورە «ساختە»یە (fake)، و هەروەها بتوانێت هەیمەنەی ئەم ساختەیە لەسەر ژیانی خۆی لەنێو بەرێت (موتڵەقی ناسک، ل١١٤-١١٥). ژیژەک لەم ڕووەوە و بە پشت بەستن بەم ڕوانگە دەروونشیکارییانەی دەستووری سیمبولی و پەیوەندی سووژانە، کە بەم ڕێگایەی مەسەلەی مارکسی دەگات: چۆن بتوانین لە شەڕی خولگەیی کەپیتالیزم ڕزگارمان بێت؟

ژیژەک لە کتێبی «موتڵەقی ناسک» (The Fragile Absolute) یان «بۆچی میراتی مەسیحیەت بەهای خەباتکردنی هەیە؟ (٢٠٠٠) و لە کتێبی «دەربارەی باوەڕ» (٢٠٠١)دا، نزیکییەک لەنێوان چەمکی «کردەی ڕەسەن»ی خۆی و تیۆلۆژیی مەسیحایەتی، بەتایبەت لەگەڵ تیۆلۆژیی سانت پاول و ئایدیا پاولییەکانی «هەستانەوە» و «ئەگاپێ» (عەشقی یەزدانی) یان «ڕەحمەت»ی مەسیحایەتیدا دەدۆزێتەوە. بەو جۆرەی ژیژەک چەمکی «عەشقی مەسیحی» هێناوە و لە

نووسینەکانی «پەیمانی نـوێ»ی سانت پاول تێیدەگات، ئەوا ئەم چەمکە لە خزمەتی دەستووری سیمبولیدا نییە، بەڵکو بە ساختەزانینی دەستووری سیمبولی و لەنێوبردنی ئەو دەستوورە و کردنەوەی بەسەر «ئەویدیکە»، نزیک بە «کردەی ڕەسەن»ی خۆی دەزانێت. «ئەمە خودی عەشقە، کە فەرمانمان پێدەکات تاوەکو خۆمان لەو کۆمەڵە ئۆرگانیکەی تێیدا لەدایکبووین، «بخەینە دەرەوە». (موتڵەقی ناسک، ل١٢١). ئینجیلی مەسیحی، کە وەحیانییە، ڕووداوێکی تراوماتیکە دژ بە ئیمراتۆریەتی جیهانی ڕۆمانی و «ئایانی پاگانی» (کافرانە). تراوماکەی لەم بانگەشە ڕەها و موتڵەقەدا وەستاوە، کە هەموو خەڵکی دەتوانن بەم جیهانە یونیڤێرسەلە بگەن. واتا، هەموو خەڵکی، بەچاوپۆشین لە چینی کۆمەڵایەتی، جێندەر، و ئەتنیک و پێگەیان لەنێو دەستووری کۆمەڵایەتی و گەردوونی، کە ئیمپراتۆر و ئیدیۆلۆژییە ئایینییەکەی دیاریکردووە، دەتوانن ڕاستەوخۆ بگەن بە وەحی یەزدانی و ڕەحمەتی خودایی، و تەنانەت دەتوانن ببن بە منداڵی خوداوەندیش.

ئەمە مانـای ئـەوە نییە، کە ژیـژەک دەیـەوێت ببێتە مەسیحی. ئەو لایەنە مارکسیستییە توند و دەروونشیکارییانەی ئەو هەیەتی، هەرگیز ڕێگە نادات ئەو مەسیحایەتی وەربگرێت یاخود مل بداتە قبوڵکردنی هەر بانگەشەیەکی تیۆلۆژیی دیکە بۆ باوەڕهێنان بە شتێکی دەرنشین (ترانسێدێنت) یان ڕزگاربوون بەڕێی کەفارەدانی ئیلاهییەوە. سەرباری ئەمە، ژیـژەک لەنێو ئەم فۆرمەی مەسیحایەتی پۆلسیدا، ئینتیما و هێزێکی ڕادیکاڵی بەرچاو دەبینێت بۆ شکاندنی خولگەیی دەستووری سیمبولی ڕۆمانی.

ژیژەک ئەم هێزەکییە ڕادیکاڵە - ئەم کرانەوەیە بـەرەو کـردەی ڕەســەن، کـە دەتـوانـێت هێزی












هیپۆنۆتیکی دەستووری سیمبولی بشکێنێت- تەنها لە مەسیحایەتی پۆلسیدا نابینێتەوە، بەڵکو لە بودایی‌زمی بەرایی‌شدا، واتا هەمان فێرکارییەکانی بودادا، دەبینێتەوە: دەتوانم بەچاوپۆشین لەو پێگە تایبەتییەی لەنێو دەستووری کۆمەڵایەتی جیهانیدا هەمە، ڕاستەوخۆ [لە نیرڤانا]، لەنێو ئەم ڕەهەندە یونیڤێرسەلەدا هاوبەش و بەشدار بم. بەم هۆیەوەیە، کە پەیڕەوانی بودا فۆرمێکی کۆمەڵایەتییان بە خەڵک داوە، کە بە جۆرێک ئەم پێگەی دەستووری کۆمەڵایەتییە دەشکێنێت و وەکو شتێکی ناپەیوەند باسی دەکات: بودا لە هەڵبژاردنی بنەماکانی، ئاگامەندانە کاستەکان [چینە کۆمەڵایەتییەکان] و (پاش کەمێک ڕامان) تەنانەت جیاوازیی ڕەگەزیش فەرامۆش دەکات («موتڵەقی ناسک» ل١٢٢).

ژیژەک جەخت لەوە دەکاتەوە، کە ڕەتکراوە کۆمەڵایەتییەکان یان هەمان ئەو کۆمەڵانەی، کە لە دەوری مەسیح و بودا کۆبووبوونەوە، هەوڵیاندا ئەو هیرارشییەتە کۆمەڵایەتییە هەڵپەسێرن و خۆیان بخەنە «دەرەوە»ی خولگەی ئەم هیرارشیەتە یان خۆیانی لێ «جیا» بکەنەوە. کەواتە ژیژەک

لەنێوان تیۆلۆژیی مەسیحایەتی پۆلسی و ئەو مەیلەی خـۆی بۆ دروستکردنی «پێکهاتەیەکی تەقینەوەئاسا»ی مارکسیزم و فیکری دەروونشیکاری لاکانیی نزیکایەتییەک دەبینێت، و دەڵێت ئەم پێکهاتە تەقینەوەئاسایە «دەتوانێت ئەو توانایەمان پێبدات تاوەکو پێشگریمانەکانی خولگەی سەرمایە بخەینە ژێر پرسیارەوە».


Further Reading

By Žižek

The Ticklish Subject: The Absent Centre of Political Ontology. London and New York: Verso Books, 1999.

Enjoy Your Symptom! Jacques Lacan in Hollywood and Out. New York and London: Routledge, 2001.

On Belief. London and New York: Roudedge, 2001.

*The Fragile Absolute or, Why Is the Christian Legacy Worth Fighting For? London and New York: Verso Books, 2000.

About Žižek

Hart, William D. “Slavoj Žižek and the Imperial/Colonial Model of Religion,” in Nepantla: Views from South 3:3 (2002) <muse.jhu.edu/journals/nepantla>.

Pizzino, Christopher. “A Legacy of Freaks.” Postmodern Culture 12, no. 2 (2002). <muse.jhu.edu/ournals/postmodern_culture>.

Santner, Eric. On the Psychotheology of Everyday Life. Chicago: University of Chicago Press, 2001.

Thomassen, Lasse. “The Politics of Lack,” Postmodern Culture 11, no. 3 (2001). <muse.jhu.edu/journals/postmodern_culture>.


سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:

William E. Deal and Timothy K. Beal: THEORY FOR RELIGIOUS STUDIES, ROUTLEDGE New York • London, 2005, pp. 127129-.









# خوێنەرێ باش و نووسەرێ باش

ڤلادیمێر ناباکۆف

و. لە فارسییەوە: سەروەر عومەر

**ئاماژە**

**ڤلادیمێر ناباکۆف (١٨٩٩-١٩٧٧) لە ڕوسییەی تزاری و لە خێزانێکی خانەدان و ڕۆشنبیر هاتۆتە دونیاوە و لە ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە. باوکی لە وەزیرەکانی دەوڵەتی کرنسکی بوو، و لە ١٩١٩دا ناچار بە کۆچکردن بوو. و تا ١٩٤٠ لەئینگلتەرا و ئەڵمانیا و فەڕەنسا ژیا. لەم ساڵەدا بەمەبەستی وانە وتنەوە لە زانکۆکاندا چوو بۆ ئەمەریکا. لەساڵی ١٩٥٦دا بە بڵاوبونەوەی «لولیتا» گەیشتە لوتکەی بەناوبانگی خۆی و وازی لە وانە وتنەوە هێنا وخانەنشین بوو، و پاشان لە ١٩٧٧دا کۆچی دوایکرد ئەمە کورتەی ژیانی نووسەرێکە کە هەندێک لە ئاستی «جویس « و «پرۆست» دایئەنێن. ئەوەی لە خوارەوە دێت پێشەکی زنجیرەیەک وانەیە لەبارەی ئەو بەرهەمانەوە کە بۆ وانە وتنەوە هەڵیئەبژێرن. ئەو بەرهەمانەی زۆرجار لە پۆلەکانیدا ئەیخستە بەر باس ئەمانە بوون:**

**«ئاناکارنینا» و «مەرگی ئیسقان ئیلیچ» بەرهەمی تۆلستۆی، «دەرونە مردوەکان» و «پاڵتۆ»ی بەرهەمی گوگل، «باوکان و دایکان» بەرهەمی تۆرگنێف، «مادام**



ڤلادیمێر ناباکۆڤ

بۆڤاری» بەرهەمی فلۆبێر، «پارک مانسفلید» بەرهەمی جین ئوستن، «بلیک هاوس» بەرهەمی دیکنز، «ڕوداوە سەیرەکانی دکتر جکیل و بەڕێز هاید» بەرهەمی ستیڤنسن، «مەسخ» ی کافکا، «گەران بەدوای زەمەنی لەدەستچودا» بەرهەمی پرۆست، «یولیسز» بەرهەمی جویس.

جگە لەم بەرهەمانەش بە قسەی ژنەکەی هەندێکجاریش چیرۆکەکانی چیخۆفی ئەکردە بەشێک لە وانەکانی. بەڵام ئەمە هەمیشە نەبووە.

بە گشتین ئەوەی بۆ ئێمە فێرکاریە یەکەم ئاستی وانە و وانەوتنەوەی ئەدەبیاتە لەم پۆلانەیە. ئەویش لەم چەند دەیەی پێشودا کە ئێستا ئەکرێت بە وەرگێڕانی هەندێک بەشی ئەم کۆمەڵە وتارە، نمونەیەک بخەینە بەردەست عاشقانی لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکان. بەڵام ئەبێت بەر لەهەر شتێک ئەوەمان لەبیر بێت کە نابۆکۆف لەگەڵ هەر بەرهەمێکدا وەک نووسەرێکی داهێنەر ڕوبەڕوی ئەبێتەوە، سەرەتا کێشەکانی وەرگێڕان و ناوردبینی وەرگێڕان بە گوێدا ئەدات و پاشان باسی بەش بە بەشی بەرهەمەکە ئەکات. وتاری خوێنەری باش و نووسەری باش، پێشەکیەکە بەرامبەر ئەم وانانە.

فەرزانە تاهیری

ناونیشانگەلی وەک: «چۆن دەتوانین ببینە خوێنەرێکی باش»، یان «میهرەبانی لەگەڵ نووسەران» دەکرێت وەک کۆمەڵێک ناونیشانی لاوەکیی چەندان لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر سەبارەت بە نووسەرانی جۆراوجۆر دابنرێت. پلانی بابەتەکەم ئەمەیە کە بە عەشقەوە و بە وردەکارییەکی عاشقانە و تێروتەسەلەوە، باس لە چەند شاکارێکی ئەوروپایی بکەم. سەد ساڵ لەمەوبەر، فلۆبێر لە نامەیەکدا بۆ ئەڤیندارەکەی ئاوا دەنووسێت: «ئەگەر مرۆڤ لانی کەم چەند کتێبێکی بە باشی بناسیایە، چ لێکۆڵەرێکی باشی لێدەردەچوو.»

لەکاتی خوێندنەوەدا، مرۆڤ دەبێت سەرنج لە وردەکارییەکان بدات و خۆشەویستییان بۆ دەرببڕێت. هەڵبەتە هیچ کێشەیەک نییە دوای ئەوەی وردەکاریە (هەتاوییەکان)ی کتێبەکە بە عەشقەوە کۆکرانەوە، (تریفە) وێنەی گشتیش بدرەوشێتەوە. ئەگەر مرۆڤ کارەکەی بە گشتاندنێکی لە پێشەوە ئامادەکراو دەستپێبکات، بەهەڵە بە ڕێگەکەدا ڕۆیشتووە و بەر لەوەی لە کتێبەکە تێبگات لێی دووردەکەوێتەوە. هیچ شتێک لەوە وەڕسکەرتر

و لەمەڕ نووسەری کتێبەکەش ناڕەواتر نییە کە کەسێک بۆ نموونە خوێندنەوەی (مادام بۆڤاری) بەو وێنا پێشتر ئامادەکراوەوە دەستپێبکات کە کتێبێکە، باس لە هێرشکردنە سەر بۆرژوازی دەکات. دەبێت هەمیشە لەیادمان بێت، بەرهەمی هونەری بێگومان بەدیهێنانی جیهانێکی تازەیە، کەواتە یەکەم کار کە دەبێت بیکەین ئەمەیە ئەم جیهانە تازەیە بە وردەکاری هەرچی زیاترەوە بخوێنینەوە. جۆرێک لێی نزیک ببینەوە وەک بڵێی هەر ئێستا دروستبووە و هیچ پەیوەندییەکی بەو جیهانانەوە نیە کە پێشتر ناسیومانە. کاتێک ئەم جیهانە تازەیەمان بە وردی خوێندەوە، ئەوکات و تەنها ئەوکاتەیە کە دەتوانین لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیهانەکانی دی، لەگەڵ بەشەکانی دیکەی زانست بکۆڵینەوە. پرسیارێکی دیکە، ئایا دەکرێت لە ڕۆمانێکدا زانیاری سەبارەت بە شوێن و کاتەکان کۆبکرێتەوە؟ مەگەر دەکرێت کەسێک ئەوەندە ساوێلکە بێت کە پێی وابێت دەتوانین لە کتێبە پڕفرۆش و تێروپڕەکان، کە ناوەندەکانی بڵاوکردنەوە، بە هەراو زەنا دەیانخەنە ڕیزی ڕۆمانە مێژووییەکانەوە؛ شتێک سەبارەت بە ڕابردوو فێر ببین؟ بەڵام ئەرکی سەرشانی شاکارە ئەدەبییەکان چییە؟ ئایا دەتوانین متمانە بەو وێنەیەی «جین ئۆستین» بکەین کە لەبارەی ئینگلتەرای سەردەمانی دەرەبەگایەتی بە بارۆنێتەکان و دیمەنەکانییەوە پێشکەشی کردووە، لەکاتێکدا ئەو تەنها ئاشنایەتی لەگەڵ ژووری دانیشتنی قەشەیەکدا هەبوو؟ ئایا دەتوانین ڕۆمانی «بلەیک هاوس»ی دیکنز، ئەم



مارسل پرۆست

ڕۆمانسە فەنتازییە کە لە لەندەنی فەنتازیدا ڕوودەدات، بە لێکۆڵینەوەی لەندەنی سەد ساڵ لەمەوپێش دابنێین؟ بەدڵنیاییەوە ناتوانین. سەبارەت بە ڕۆمانە گەورەکانی دیکەش هەر وایە. ڕاستییەکە ئەمەیە کە ڕۆمانە گەورەکان چیرۆکە مەزنەکانی پەرییان، و ڕۆمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە لەبەزرترین چیرۆکی پەریەکانن.
کات، شوێن، ڕەنگی وەرزەکان، جووڵەی ماسوولکەکان و زیهن، هەموو ئەمانە تایبەتمەندیی نووسەرانی بلیمەتن (تا

ئەوشوێنەی کە ئێمە پێشبینی دەکەین و بەگومانی من پێشبینییەکەشمان دروستە) ئەو چەمکە نەریتیانە نین کە بکرێت لە کتێبخانە گشتییەکان بە ئەمانەت وەریانبگرین، کۆمەڵەیەکن لە غافڵگیرییە تایبەتەکان، کە مامۆستایانی هونەرمەند فێربوون، بەشێوازی تایبەتی خۆیان وەسفی بکەن. بۆ نووسەرانی لاوەکی، ئەوەی دەمێنێتەوە ڕازاندنەوەی شتە باوەکانە. ئەم نووسەرانە هەرگیز زەحمەتی دروستکردنەوەی جیهان نادەنە بەرخۆیان، تەنها هەوڵ دەدەن تا ئەو شوێنەی دەتوانن باشترینەکان لە کۆمەڵەیەکی تایبەتی شتەکان، لە شێوازە دێرینەکانی چیرۆک بهێننەدەرەوە. ئەو تێکەڵە جۆراوجۆرەی ئەم نووسەرە لاوەکییانە دەتوانن لەم سنوورە تایبەتەدا پێشکەشی بکەن، ڕەنگە بتوانێت بە شێوەیەکی نەرم و زووتێپەڕ، زۆریش سەرگەرمکەر و سەرنجڕاکێش بێت. چونکە خوێنەرانی لاوەکییش حەز دەکەن بیرۆکەکانی خۆیان لە بەرگێکی ساختە و ڕازاوەدا بناسنەوە. بەڵام نووسەری ڕاستەقینە، ئەو مرۆڤەی هەسارەکان دەسووڕێنێت و مرۆڤێک لەخەوندا دروستئەکات و بە جۆشوخرۆشەوە چاوئەبڕێتە ئەم مرۆڤە خەوتووە، لەبەردەستی نووسەرێکی ئاوادا هیچ بەهایەکی دیاریکراو بوونی نییە، دەبێت خۆی ئەم بەهایانە بئافرێنێت. نووسین کارێکی بێهوودەیە، ئەگەر لەسەرەتای کاردا هونەری بینینی جیهان وەک چیرۆکێکی بەزەبر (بالقوة)، بەخێرایی نەیەت بە بیردا. کەرەسەی خاوی ئەم جیهانە ڕەنگە بە ئەندازەی پێویست واقیعی بێت (تا ئەو جێگەیەی کە بکرێت بە واقیعی ناوی بەرین)، بەڵام هەرگیز وەک گشتێکی قەبوڵکراو بوونی نییە. بێسەرەوبەرەییە، و نووسەر بەم بێسەرەوبەرەییە دەڵێت «بڕۆ!» و بەمشێوەیە ڕێگە بە جیهان دەدات تا بجووڵێت و تێکەڵبێت و ئەوکاتەیە کە دەبینین یەک بە یەکی ئەتومەکانی جیهان سەرلەنوێ پێکهاتونەوتەوە، ئەم گۆرانەش تەنها بەشە ڕوکەشی و دیارەکانی ناگرێتەوە. نووسەر یەکەم کەسە کە نەخشەی جیهان دەکێشێت و ناو لە دانە دانەی شتە سروشتییەکانی دەنێت. میوەکانی درەختی جیهانەکەی ئەو بەتامن. ئەو بوونەوەرە خاڵدارەی لەبەردەمی منەوە هەڵات، دەکرێت ڕام بکرێت. ئەو دەریاچەیەی بە ناو ئەو درەختانەدا دەڕوات، دەکرێت پێی بوترێت دەریاچەی شیری، یان هونەرمەندانەتر بڵێم دەریاچەی ئاوی سابوون. ئەو تەمە، کێوێکە و ئەو کێوە دەبێ بگیرێت. مامۆستای هونەرمەند بە بنارێکی بێ ڕێگەدا سەردەکەوێت، لە لووتکەدا، لە دووندی کێوەکەدا، پێتان وایە چ کەسێک دەبینێت؟ خوێنەرێکی هەناسەبڕاوی خۆشحاڵ. لەوێدا لەناکاو یەکدی لە ئامێز دەگرن و ئەگەر کتێبەکە تا هەمیشە بمێنێتەوە، ئەوانیش تا هەتایە پێکەوە لەپەیوەندیدا دەبن. ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ لە زانکۆیەک لە شارۆچکەیەکی دوورەدەست کە بەڕێکەوت بۆ زنجیرە وتارێک بۆ ئەوێ ڕۆیشتبووم، پێشنیازم بۆ خوێندکارەکان کرد تاقیکردنەوەیەکی کورت ئەنجام بدەن، دە جۆر پێناسەی خوێنەر دیاریکرابوو و خوێندکارەکان دەبوو لەم دە پێناسەیە چوار دانەیان هەڵبژێرن تا بەشێوەیەکی گشتی ببنە خەسڵەتەکانی خوێنەرێکی باش؛




ئەوەی لەیادمە پێناسەکان ئەمانە بوون: چوار وەڵام بۆ ئەم پرسیارە هەڵبژێرە، خوێنەرێکی باش پێویستە چ تایبەتمەندییەکی هەبێت:

١- خوێنەرێکی باش دەبێت ئەندامی کتێبخانەیەک بێت.

٢- خوێنەر دەبێت خۆی لەگەڵ پاڵەوانێکی ژن یان پیاوی ناو ڕۆمانەکە وەک یەک ببینێت.

٣- خوێنەر دەبێت هەستەکانی خۆی لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی – ئابووری چیرۆکەکە کۆبکاتەوە.

٤- خوێنەر دەبێت چیرۆکێک کە ڕووداو و گفتوگۆی تێدایە لە چیرۆکێک کە ئەمانەی تێدا نییە، بە باشتر بزانێت.

٥- خوێنەر دەبێت ئەو فیلمەی لەسەر کتێبەکە دروستکراوە، بینیبێت.

٦- خوێنەر دەبێت کەسێک بێت، کە ئامادەگیی بوونە نووسەر لەودا گەشە بکات.

٧- خوێنەر دەبێت خەیاڵی فراوان بێت.

٨- خوێنەر دەبێت یادگەیەکی باشی هەبێت.

٩- خوێنەر دەبێت قامووسی زمانەکان بەکار بهێنێت.

١٠- خوێنەر دەبێت تا ڕادەیەک دەرکی هونەری هەبێت.

خوێندکارەکان زیاتر جەختیان لەسەر یەکبوونی سۆزداری، کرداری کۆمەڵایەتی - ئابووری یان مێژوویی چیرۆکەکە کردبوویەوە. هەڵبەتە هەر بەو شێوەیەی ئێوە بۆی چوون خوێنەری باش کەسێکە خەیاڵ، یادەگەیەکی باش، قامووسی زمانەکان و کەمێک دەرکی هونەری هەبێت. ئەم دەرکە هەرکات دەرفەتێک بێتە پێشەوە

لە خۆماندا پەروەردەی دەکەین و پێشنیاز بۆ ئەوانی دیکەش دەکەین هەمان کار بکەن.
من بەڕێکەوت وشەی خوێنەر زۆر خەمساردانە بەکار دەهێنم. سەیرە! بەڵام مرۆڤ ناتوانێت کتێب بخوێنێتەوە: تەنها ئەتوانێت پێیدا دەچێتەوە. خوێنەرێکی باش، خوێنەرێکی گرنگ، خوێنەرێکی چالاک و ئەفرێنەر کەسێکە کە پێیدادەچێتەوە. پێتان دەڵێم بۆچی. کاتێک بۆ یەکەمجار کتێبێک دەخوێنینەوە، هەر ئەم پرۆسە دژوارەی جووڵەی چاوەکان لە ڕاستەوە بۆ چەپ، دێڕ لەدوای دێڕ، پەڕە دوای پەڕە، ئەم کارە جەستەییە ئاڵۆزە لەگەڵ کتێبدا، هەر ئەم پرۆسەی تێگەیشتنە لە بابەتی کتێبەکە لەمەودای کات و شوێندا، لەنێوان ئێمە و ستایشی هونەرمەندانەدا دەوەستێت. کاتێک تەماشای نیگارێک دەکەین، تەنانەت ئەگەر وەک کتێب ڕەگەزەکانی قووڵی و گۆڕانکاری لەخۆبگرێت، ناچار نین چاوەکانمان بەشێوەیەکی تایبەت بجووڵێنین. لەڕاستیدا ڕەگەزی کات لەهەمان بەریەککەوتنی سەرەتا لەگەڵ نیگارێکدا، پێ نانێتە ناو مەیدانەوە. لەکاتی خوێندنەوەی کتێبێکدا دەبێت کاتمان هەبێت تا پێی ئاشنا ببین. هیچ ئەندامێکمان نییە (وەک چۆن لەکاتی ڕوانین بۆ تابلۆیەکدا چاومان هەیە.) لەجەستەدا کە بتوانێت لەهەموو وێنەکە تێبگات و هاوکات لە وردەکارییەکانیشی چێژ وەربگرێت. بەڵام کاتێک بۆ جاری دووەم، یان سێهەم، یان چوارەم کتێبێک دەخوێنینەوە، لەڕاستیدا هەمان کار لەگەڵ کتێبەکەدا دەکەین کە لەگەڵ نیگارەکەدا دەیکەین. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا باشترە ئەندامی چاو، ئەم شاکارە دێوئاسایە لەگەڵ مێشک، کە دەستکەوتێکی دێوئاساترە، تێکەڵ نەکەین. کتێبێک، جا کتێبەکە هەرچییەک بێت، بەرهەمێکی ئەدەبی بێت یان زانستی (کە سنووری نێوانیان بەو ڕوونییەش نییە کە هەمووان باوەڕیان پێیەتی.) سەرەتا بەرەو لای زیهن دەڕوات. زەین، مێشک، لە سەرەوەی ستوونی بڕبڕەکان، تەنها ئامرازێکە یان دەبێت تەنها ئامرازێک بێت، لەکاتی خوێندنەوەی کتێبدا بخرێتەکار.
ئێستا کەوایە، دەبێت سەرقاڵی ئەم پرسیارە بین کاتێک خوێنەریکی ڕوگرژ ڕووبەڕووی کتێبیکی هەتاوی ئەبێتەوە، مێشک چۆن کار دەکات؟. سەرەتا و بەر لەهەرشتێک خووی ڕووگرژی لەناودەچێت و خوێنەر، باش یان خراپ، پێدەنێتە ناو گۆڕەپانەکەوە. هەوڵدان بۆ دەستکردن بە خوێندنەوەی کتێبێک، بە تایبەتی کاتێک کەسانێک بە کتێبەکەیاندا هەڵداوە کە خوێنەری گەنج لە دەرونی خۆیدا ئەوانی زۆرتر لە خەم بەجدی وەرگرتووە، هەوڵێکی زۆرجار دژوارە، بەڵام هەر کە دەستپێکرد، پاداشتی جۆراوجۆر و فراوانی بە دوادا دێت. لەبەرئەوەی مامۆستای هونەرمەند بۆ ئەفراندنی کتێبەکەی خەیاڵی خۆی بەکارهێناوە. کاری سروشتی و ڕاست ئەوەیە خوێنەری کتێبەکەش خەیاڵی خۆی بەکاربهێنێت.
خوێنەر لانی کەم دەتوانێت دوو جۆر خەیاڵی هەبێت. کەواتە وەرن بزانین کام لەم دوو خەیاڵە بۆ خوێندنەوەی کتێبێک گونجاون. یەکەمیان ئەوجۆرە خەیاڵە تاڕادەیەک نزمەیە کە چنگ بە سۆزە سادەکانەوە دەگرێت و سروشتێکی تەواو تاکەکەسی هەیە. ئێمە شوێنێکی تایبەت

لە کتێبەکەدا زۆر بە توندی هەستپێدەکەین، چونکە دەمانخاتەوە یادی ڕووداوێک کە بەسەر خۆمان یان کەسێک کە دەیناسین یان دەماننناسی هاتووە. یان بۆ نموونە خوێنەرێک زۆر ڕێز لە کتێبێک دەگرێت، تەنها بەو هۆیەی کە وڵات، دیمەن، یان ئەو شێوازی ژیانە زیندوو دەکاتەوە کە بە خەمەوە دەیخاتەوە یادی ڕابردووی. یان خۆی لەگەڵ کارەکتەرێکی ناو کتێبەکەدا وەک یەک دەبینێت. ئەمە یەکێکە

لە خراپترین ئەو کارانەی خوێنەر دەتوانێت بیکات. ئەم جۆرە نزمە، ئەو جۆرە خەیاڵە نییە کە من بۆ خوێنەرانی دەخوازم.
کەواتە خوێنەر دەبێت سود لەکام ئامرازی جێگەی متمانە وەربگرێت؟ ئامرازی خەیاڵی ناتاکەکەسی و خۆشنودی هونەرمەندانە. بە ڕای من دەبێت پەیوەندییەکی هارمۆنی و هونەرمەندانە لە نێوان زەینی خوێنەر و زەینی نووسەردا بەرقەرار ببێت. دەبێت کەمێک



دوور بکەوینەوە و لەم دوورکەوتنەوەیە چێژ وەربگرین. و لە هەمانکاتدا چێژێکی قوڵ لە چنینی دەرونی شاکارەکە وەربگرین. چێژێکی پەڕگیر. چێژێک هاوکات لەگەڵ فرمیسک و لەرزیندا. مانەوە لە دەرەوەی ئەم ناوچانە ئەستەمە. هەرشتێک کە شایەنی ئەوە بێت، تا ڕادەیەک زیهنییە. بۆ نموونە ئێوە کە لێرەدا دانیشتوون ڕەنگە تەنها خەونی من بن و منیش ڕەنگە مۆتەکەی ئێوەبم. بەڵام مەبەستی من ئەوەیە خوێنەر دەبێت بزانێت کەی و لەکوێدا خەیاڵی جڵەو بکات و ئەم کارە دەبێت بە هەوڵدان بۆ ناسینی وردی ئەو جیهانە تایبەتە ئەنجام بدات کە نووسەر خستویەتییە بەردەستی. دەبێت شتەکان ببینین و ببیستین، دەبێت ژوورەکان، جل و بەرگەکان، جووڵە و ڕەفتاری کەسایەتییەکانی نووسەر بەرجەستە بکەین. ڕەنگی چاوی «فانی پرایس» لە «مانسفێڵد پارک»دا و کەلوپەلی ژووره بچووک و ساردەکەی گرنگن.

هەموومان خولقوخووی جیاوازمان هەیە و دەتوانم هەر ئێستا پێتان بڵێم کە باشترین خولقوخوو بۆ خوێنەرێک، تێکەڵەی خولقوخووی هونەرمەندانە و زانستییانەیە. ئەگەر وەها خولقوخوویەک بوونی نەبێت، پێویستە لەخۆماندا دروستیبکەین. هونەرمەندی تامەزرۆ، خۆی لەبەردەم تێڕوانینێکی زۆر زەینیدایە سەبارەت بە بەرهەمەکەی، لەبەرئەوە خوێنساردی زانستی لە هەڵسەنگاندندا، ئەم سۆزە ناعەقڵانیانە چاک ئەکاتەوە. بەڵام ئەگەر کەسێک بڕیارە ببێتە خوێنەر، بەهیچ شێوەیەک جۆشوخرۆش و سەبر و خۆڕاگری تێدا نەبێت

— جۆشوخرۆشی هونەرمەندێک و خۆڕاگریی زانایەک — بەدووری دەزانم بەباشی چێژ لە ئەدەبیاتی مەزن وەربگرێت.

ئەدەبیات ئەو ڕۆژە لەدایک نەبوو کە کوڕیژگەیەک هاواری کرد گورگ، گورگ، لەکاتێکدا بە دۆڵێکی نیاندەرتاڵیدا ڕایدەکرد و گورگێکی گەورەی ڕەنگ خۆڵەمێشیش دوای کەوتبوو: ئەدەبیات ئەو ڕۆژە لەدایک بوو کە کوڕیژگەیەک هاواری کرد گورگ هات، گورگ هات و هیچ گورگێکیش بەدوایەوە نەبوو. ئەوەی کە دواجار ئەم کوڕە بچووکە داماوە بەهۆی درۆ زۆرەکانییەوە بوویە خۆراکی گیانلەبەرە دڕندەکە، بە تەواوی ڕێکەوتە. ئەوەی لێرەدا گرنگە، لەنێوان گورگی گیاجاڕەکە و گورگی چیرۆکەکەدا پەیوەندییەکی کەمڕەنگ هەیە. ئەو هێڵی پەیوەندییە، ئەو ئاوێزەی ڕەنگە، هونەری ئەدەبیاتە.

ئەدەبیات واتە داهێنان، واتە چیرۆک. ئەگەر چیرۆکێک بە چیرۆکێکی ڕاستەقینە ناوبەرین، هەم سووکایەتیمان بە هونەر کردووە هەم بە ڕاستی. هەموو نووسەرێکی مەزن فریودەرێکی مەزنە، بەڵام ئەو فریودەرە مەزنەش واتە سروشت، هەر وایە. سروشت هەمیشە فریومان دەدات. لە فریوی سادەی بەدیهێنانی هاوشێوەی خۆمانەوە بیگرە، تا وەهمی نائاسایی و ئاڵۆزی ڕەنگە پارێزەرەکانی باڵی پەپوولەکان یان باڵندەکان. لە سروشتدا سیستمێکی نائاسایی لە ئەفسوون و فریو بوونی هەیە. نووسەری چیرۆک تەنها بە شوێن پێی سروشتدا هەنگاو دەنێت.

با دیسان بچینەوە بۆلای ئەو کوڕە بچووکە

توکنەی دارستان، کە هاواری دەکرد گورگ، گورگ. دەتوانین بڵێین جادووی هونەر لەسایەی ئەو گورگەدا بوو کە بێ دوودڵی ئەو دروستی کردبوو، خەونی گورگەکەی ئەو و پاشان چیرۆکی فێڵەکانی، چیرۆکێکی باشیان پێکهێنابوو. کاتێکیش لە دونیا دەرچوو، ئەو چیرۆکەی لەبارەیەوە دەیانگێڕایەوە، لەتاریکی چواردەوری ئاگردا بوویە وانەیەکی باش، بەڵام ئەو جادووگەرێکی بچووک بوو، داهێنەر بوو.

دەتوانین لە سێ دیدگاوە لە نووسەر بکۆڵینەوە، دەتوانین ئەو بە داستانبێژ، مامۆستا و ئەفسوونگەر ناوبەرین. نووسەرێکی گەورە پێکهاتەیەکە لەم سیانە — داستانبێژ، مامۆستا و ئەفسوونگەر. بەڵام ئەوە ئەفسوونگەری ناخییەتی کە زاڵ دەبێت و ئەو دەکاتە نووسەرێکی مەزن.

ئێمە بۆ سەرگەرم بوون، بۆ سادەترین جۆری ورووژانی زەینی، بۆ هاوبەشی سۆزداری، بۆ چێژی سەفەر لە ناوچەیەکی دوورەدەستی کات یان شوێندا، بۆلای داستانبێژ دەڕۆین. زەینێک کە برێک جیاوازە و مەرج نیە لە ئاستێکی باڵاتردا بێت، لە نووسەردا بەدوای فێرکارێکدا ئەگەڕێت. ئەوەی بەدوای ئەمەدا دێت ڕاگەیەندکارە، مۆڕالیست، پەیامبەر ڕەنگە سەرەڕای فیرکاری ئەخلاقی، بۆ زانینی ڕاستەوخۆ و واقعی سادەش بۆلای مامۆستا بڕۆین.. بەداخەوە، کەسانێکم دیوە مەبەستیان لە خوێندنەوەی ڕۆماننووسە فەڕەنسی و ڕوسییەکان، بەدەستهێنانی زانیاری بووە سەبارەت بە ژیان لە پاریسی سەرخۆش و ڕوسیای غەمگین. دواجار لەسەروو هەموو ئەمانەوە، نووسەرێکی گەورە هەمیشە ئەفسوونگەرێکی گەورەیە، لێرەدایە کە بەڕاستی بە ورووژێنەرترین بەشی کارەکە دەگەین، واتە کاتێک هەوڵ دەدەین لە جادووی تاکەکەسیی ئەم بلیمەتە تێبگەین و لە شێواز، وێنەسازی و شێوەی ڕۆمان یان شیعرەکانی بکۆڵینەوە.

ئەم سێ ڕەهەندەی نووسەرێکی مەزن — جادوو، داستان، وانە — ئامادەی یەکبوونن تا نمایەکی تاقانەی درەوشاوە، تایبەت بەخۆ و یەکتا بسازێنن. چونکە ڕەنگە جادووی هونەر هەر لەهەمان ئێسکوپرووسکەکانی بیرکردنەوەدا ئامادەبێت. شاکارگەلێک هەن، هزری وشک، ڕوون و ڕێکخراویان هەیە و لەرزەیەکی هونەرمەندانەمان تێدا دروستئەکەن. تەواو بەهێز وەک ئەوەی ڕۆمانی «مانسفێڵد پارک»، یان هەریەک لە ڕێبازە دەوڵەمەندەکانی وێنەسازی هەستیارانەی دیکنزی، لەگەڵمان دەیکەن. بەڕای من، یەکێک لە ڕێسا باشەکان بۆ تاقیکردنەوەی ئاستی ڕۆمانێک لە درێژماوەدا، تێکەڵکردنی وردەکاریی شیعر و پێشبینی زانستییە. بۆ چێژ وەرگرتن لەو جادووە، خوێنەری ژیر کتێبی نووسەرە بلیمەتەکە نەک بە دڵ و مێشک، بەڵکو بە بڕبڕەکانی پشتی دەخوێنێتەوە. لەوێدایە کە ئەو موچورکەیە بەگیانماندا دێت، گەرچی لەکاتی خوێندنەوەدا دەبێت کەمێک مەودا وەربگرین، کەمێک دوور بکەوینەوە، پاشان بە چێژێکەوە کە هەم هەستییە و هەم عەقڵی، تەماشای هونەرمەند بکەین کە قەڵا مقەباییەکەی چێدەکات و ببینین چۆن قەڵا کارتۆنییەکەی، دەبێتە قەڵایەکی جوان لە پۆڵا و شووشە.

### سەرچاوە:

سایتی «مد و مە«، وەرگێڕانی بۆ فارسی «فەرزانە تاهیری»

# دەوڵەتی دینی و دەوڵەتی مەدەنی: بەراوردکارییەکی مێژوویی

نووسینی: محەمەد حبیدە
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

تا سنووری سەدەی پانزەهەم، هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان لەسەر کشتوکاڵ دەژیان و بەشێوەیەکی ڕەها ملکەچی ڕێنماییە دینییەکان بوون. سا ئەو ملکەچوبوونە پەیوەندی بە ئاینە ئاسمانییەکانەوە بێت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، یان پەیوەندی بە شێوە جیاوازەکانی دیکەی بیروڕای دینییەوە بێت لە ناوچەکانی تری جیهان.

لەگەڵ هاتنی سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم، کە لە ئەورووپا هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی ڕێنیسانس، بە ئاشکرا پرۆسەیەکی جیاواز، لەلایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و فیکرییەوە، لەنێوان کۆمەڵگای ئەورووپی کە لە قۆناغی وەرچەرخاندابوو، دەرگاکانی بەڕووی سەردەمێکی تازەدا کردبووەوە، لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دیکەی جیهان هاتەئارا کە بونیادی مادیی و فیکرییان وەک خۆی بە جێگیری مابوەوە

و نەیاندەتوانی لە تونێلی سەدەکانی ناوەڕاست بێنەدەرەوە. لەسەرەتای سەردەمە تازەکەدا، وەرچەرخانە ئەوروپییەکان، لەمانەی خوارەوەدا ڕەنگیاندایەوە:

*وەرچەرخان لە ئابوری کشتوکاڵەوە بۆ ئابوری میرکانتیلی*.

*وەرچەرخان لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتییەوە بۆ کۆمەڵگای بۆرجوازی.

*وەرچەرخان لە تەسلیمبوون بە میرات و ملکەچبوون بۆ کۆمەڵ، بۆ هەستی ڕەخنەگرتن و مەیلی تاکگەرایی.

*وەرچەرخان لە بیرکردنەوەیەکی ئاینی، کڵێسایی، بۆ بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی، عەقڵانی.

لەم ڕێیەوەدا ئەوروپا وردە وردە پێی دەخستە نێو مۆدێرنەوە و بە چەمکە هەرە سەرەکییەکانی ئاشنادەبوو: لەوانە کاری عەقڵانی: (ڕێنیسانس، پاشان ڕۆشنگەری)، ڕیفۆرمی ئاینی (پرۆتستانتیەت)، جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت (فەلسەفەکەی سپینۆزا). ئەم چەمکانە چینی بۆرجوازییەت هەڵگریبوون، ڕۆڵی ئەم چینە تەنها لە بازرگانیدا کورتنەببوەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی بەهێز و کاریگەر بەشداربوو لە لەدایکبوونی نوخبەیەک لە بیرمەندان، ئەوانەی تیۆریزەیان بۆ چەمکە سەنتراڵەکانی بواری ژیانی سیاسی و فیکری ئەنجامدا و کاریگەری لەسەر واقعی کۆمەڵایەتی دانا و ئەو واقیعەی گۆڕی. بۆرجوازیەت بە درێژایی مێژوی مۆدێرنە، توانی دەزگا دینی و سیاسییەکان بروخێنێت کە لە ڕابردووەوە بە میرات مابوونەوە و دەوڵەتێکی مەدەنی لەسەر بنەمای عەقڵ و ئازادی و یاسا دامەزرێنێت. ئەوروپییەکان لە پرۆسەی بونیادی فیکری و سیاسی بۆ دامەزراندنی دەوڵەت، بە دوو قۆناغی گەورەدا تێپەڕین.

قۆناغی یەکەم: ڕووبەڕووبوونەوەی کێڵسا.

قۆناغی دووەم: ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵات.

لە ڕاستیدا وەرگرتنەوەی (داماڵین)ی پیرۆزی لە دەسەڵاتی ئاینی، پرۆسەی داماڵینی پیرۆزی لە دەسەڵاتی سیاسی ئاسانتر کرد، چونکە ئەمەی دوایان، واتە دەسەڵاتی سیاسی، تادەهات مۆرکێکی دنیایی وەردەگرت، ئەمەش یارمەتی جیاکردنەوەی نێوان دین و دەوڵەتی دا. پاشان پرۆتستانتیەت و هەموو ئەو دەرهاویشتە فیکرییە جیاواز جیاوازانەی کە لێیکەوتەوە و لەگەڵ ناوەندی ئاینی تەقلیدی باودا ناتەبابوو، ڕێگای فرەیی لە فیکر و بیروڕادەربڕیندا لەبەردەم خەڵکیدا کردەوە. ئەم ئەڵقەیەی وەرچەرخان لە دروستکردنی دەوڵەتدا، لەگەڵ بیروڕاکانی فەیلەسوف و سیاسی ئینگلیزی «جۆن لۆک» تەواوتر دەبێت. جۆن لۆک توانی تیۆرەکەی تۆماس هۆبز سەبارەت بە حوکمی ڕەها تێپەڕێنێت کە لە رووی فەلسەفییەوە پاساوی بۆ سیاسەتی دەسەڵاتی (مۆنارشیزم)ی خودایانە لە ئەوروپا دەهێنایەوە**. جۆن لۆک لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (الحکم المدنی) تیۆرەی لیبرالیزمی گەڵاڵەکرد، ئەم تیۆرەیە بووە قاڵبێکی سیاسی بۆ شۆڕشە پیرۆزەکەی ئینگلتەرە لە ساڵی ١٦٨٩ و بۆ ئەو شۆڕشە بۆرجوازیانەی دیکە کە لە ناوچەکانی تری ئەوروپا و لە میانەی هەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەمدا بەرپابوون و ئەوروپییەکانی لە ستمگەری ڕزگارکرد، هەر هەموو ئەو ڕوداوانەش لە کەشوهەوای ئەو بزاوتە عەقڵانییەتەدا ڕویاندا کە ناسراوە بە ڕۆشنگەری.

بەم شێوەیە و لە ڕێگەی دەسەڵاتی یاسادانانەوە کە ئەندامانی پەرلەمان خاوەنیبوون و لە چوارچێوەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکتر یان لە چوارچێوەی (دابەشکردنی دەسەڵاتەکان) وەک ئەوەی لەو سەردەمەدا پێیدەگوترا، وەرچەرخانێکی سیاسی گەورە و مەزن هاتەئاراوە. لەم وەرچەرخانەدا ئەوروپییەکان لە مێگەلەوە بوون بە هاوڵاتی و لە چوارچێوەی یەکسانی کۆمەڵایەتی و لێپرسینەوە لەبەردەم یاسا و یەکسانی لە وەرگرتنی دەرفەتی کار، هەمان ماف و هەمان ئەرکیان لەسەرشان بوو. هەرچی کڵێسا بوو، ئەوا ناچارکرا خۆی لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەمی مۆدێرنە بگونجێنێت، چونکە ئامرازەکانی مۆدێرنە ئامرازگەلێکی ڕاماڵەر و ناچاری بوون. لێرەوە دەسەڵاتی کڵێسا کەمبووەوە و گۆڕا بۆ شوێنەوارێک لە شوێنەوارە مێژووییەکانی کەلتوور و هونەر.

کەچی لە جیهانی ئیسلامیدا، بونیادی فیکری و ماددیی هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەبینی شایەنی باسکردن بێت. سیستەمی گشتی بەردەوام لەسەر هەمان بونیادی کۆمەڵایەتی تەقلیدی دەڕۆشت بەڕێوە و دەسەڵات بەشێوەیەکی ستوونی لەسەرەوە بۆ خوارەوە پراکتیز دەکرا. ڕەوتی فیکر، بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست تا ئەو ڕاچەنینەی ئیمپرایالیزمی ئەوروپی ئەنجامیدا، چوارچێوەیەکی ڕەهای بەخشیبوو بە ئاین و ئاینی لەنێو ئەو چوارچێوە ڕەهایەدا دانابوو. بەڵام هاتنی ئیمپریالیزمی ئەوروپی ئەم بونیادەی بەشێوەیەک هێنایە لەرزین کە پێشتر لەرزینی لەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەبینی بوو.

لای عەرەب و موسڵمانەکان، تیۆرەی سیاسەت و پراکتیزەکردنی سیاسەت لەسەرزەمینی واقع، لە دەورەی چەمکی خەلافەت و بنەما سەرەکییەکەی دەسوڕایەوە کە بریتییە لەمەی خوارەوە: ملکەچبوون بۆ وەلی ئەمر. لە سەدەی یازدەهەمی زایینیدا، قازی بەغداد «ئەبو ئەلحەسن ئەلماوردی» خاوەنی کتێبی (الاحکام السلطانیە و الولایات الدینیە)، کۆمەڵێ فیکر و بیروڕای بەرهەمهێنا کە بوونە چوارچێوەیەکی دیاری ئەو مەسەلەی ملکەچبوونە. ئەو لەوێدا باس لەو بنەما سەرەکییانە دەکات کە دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت. ئەو بنەمایانە خۆیان لە مەسەلەی ئیمامەت و ملکەچبوون بۆ وەلی ئەمر دەبیننەوە. دوای ئەویش هەمان ئەو بنەمایانە لەلایەن ژمارەیەکی زۆری فوقەهاکانەوە بەردەوامی پێدرا و کاریان پێکرا. ئەم حاڵەتە لەگەڵ ئەو چەقبەستنە کۆمەڵایەتی و فیکرییەی چەندین سەدە بوو لەئارادابوو، پارێزگاری لە سیاقێکی سیاسی کرد، سیاقێک بە پشتبەستن و بە کۆمەکی ئاین، هەموانی ملکەچی یەک دەسەڵات دەکرد. لێرەوە کۆمەڵگای عەرەبی و ئیسلامی بە درێژایی مێژووەکەیان، لە هێنانەئارای دینامیکییەتێکی کۆمەڵایەتی کە هەڵگری گۆڕانی فیکری بێت، شکستیهێنا. ئەو ڕوناکییە فیکرییانەی کە ئیبن ڕوشد و فەیلەسوفەکانی دیکە نوێنەرایەتیان دەکرد، سەرکەوتوو نەبوون لەوەی بەڕووی کەلتوری نەقڵ و تەقلید دا بووەستنەوە کە فوقەهاکان و ئەمیرەکان زۆر بە توندی بەرگرییان لێدەکرد. هەر بۆیە بەردەوامبوونی ستەمگەری، وەک ئەوەی «ئەبو ئەلحەسن ئەلماوەردی» کە لە هەردوو دیوەکەیەوە: ئاینی و سیاسی، لێیدەڕوانی، بۆ ڕەتکردنەوەی فیتنەیە، ئەم جۆرە تێگەشتنە لە ستمگەری، چوارچێوەیەکی سیاسی کرا بەبەردا

و بۆ ماوەیەکی دوور و درێـژ ژیانی خەڵکی داگیرکردبوو، لەو چوارچێوە سیاسییەدا مانەوەی حاکمێکی زاڵم، بۆ ڕێگەنەدانە لە دروستبوونی فیتنە.

دوای ڕاچەنینەکەی ئیمپریالیزم و دوای هەموو ئەو گۆڕانکارییە هەمەلایەن و جیاواز جیاوازانەی لە بـوارە کۆمەڵایەتی و ئـابوری و سیاسی و کەلتوریەکاندا هاتەئارا، کۆمەڵگا پێینایە نێو ڕێخستنێکی ئاوێتەییەوە، ڕێخستنێک لە چەندین ڕێگای ئاڵۆز دروستکراوە و بە چەندین دیاردەی جـۆراوجـۆروی دووفاقی و دژ بەیەک تنراوە و چەندین ئاراستەی فرە ڕەهەندی لەخۆگرتووە. لێرەوە دەوڵەت بوو بە دەوڵەتێک نە ئەوەتا بە تەواوی ئاینی بێت و نە ئەوەتا تەواو مەدەنی بێت. ڕژێمە عەرەبییەکان، لە قۆناغی ڕزگاربوون لە ئیمپریالیزم و گەیشتن بە سەربەخۆیی، کاریان لەسەر شێواندنی وێنەی سیاسەت و کەلتوور کـرد، گرەویان لەسەر تەمومژکردنی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی سیاسەت و دین کرد. بۆ دڵنیابوون لە مانەوەیان، یارییان بە ناکۆکییەکان دەکـرد و سەرقاڵی بە گژدادانی ڕەوتێک بوون دژ بە ڕەوتێکی دیکە و ئەو ڕەوتانەیان دەکرد بە دوژمنی یەکتر. ئەم ڕژێمانە بەرژەوەندیان لـەوەدابـوو ئەو ڕەوتانە بکەن بەگژ یەکتردا و یەک لەوی دیکە بترسێت، بەمەش خۆیان لەو هەڕەشەیە دەپاراست کە لەوانەیە لەم یان لەو ڕەوتەوە بکرێتە سەر دەسەڵاتەکەیان و لەوانەیە لە دەسەڵات دووریانبخەنەوە. واتە لە هەڕەشەی ڕژێمی دەوڵەتی ئاینی لەسەر شێوازی (خەلافەت) یان لە هەڕەشەی ڕژێمی دەوڵەتی مەدەنی لەسەر شێوازی دەوڵەتی (دیموکراسی).

لەمڕۆدا و بەو پێودانگەی بارودۆخی (بەهاری عەرەبی) پێیدا تێدەپەڕێت – وەک ئـەوەی لە ئەدەبیاتی میدیایی و سیاسیدا ناویان لێناوە بەهاری عەرەبی- گفتوگۆ و مشتومڕێکی گەرم دەربارەی سروشت و خەسڵەتی دەوڵەت، پانتایی سیاسی و فیکری داگیرکردووە. مەسەلەکان بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەنێوان دوو ڕەوتی دیار و ناسراودا، دێن و دەچن، ئەوانیش: لەلایەکەوە ڕەوتـی ئیسلامی کە پێیوایە دەوڵـەتـی دینی، بە پشتبەستن بە (شەرعییەتی ڕابـردووخـواز) و میراتی ئاینی و کەلتووری (سەلەفی ساڵح)، چوارچێوەیەکی سروشتییە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی. لەلایەکی ترەوە ڕەوتی عەلمانی کە پێیوایە دەوڵەتی مەدەنی، بە پشتبەستن بە (شەرعیەتی گەردونی) و بەهاکانی مۆدێرنە، ئەو چوارچێوە گونجاوەیە بۆ ژیانی خەڵک.

لە ڕووی لۆژیکییەوە، مـرۆڤ گەر ئیمانداربێت یان بێئیمان و هوشیاربێ بەو وەرچەرخانانەی لە زەمەنی ئێستادا جیهانی گرتووەتەوە، ئەوا پێیوایە دەوڵەتی مەدەنی، چوارچێوەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی گونجاوە بۆ هەموان. چونکە شێوازی ئیشکردنی دەوڵەتی مەدەنی لە ڕووی یاساییەوە، دەتوانێ هەموان لە ئامێز بگرێت و ئـازادی بۆ هەموان دابینبکات. دەوڵەتی مەدەنی جێگای هەموو ئاینەکان و باوەڕەکان و ئێتنییەکانی تێدادەبێتەوە و ئازادی بە هەموو ڕەنگە جیاوازەکانییەوە بۆ هەموو خەڵک فەراهەم دەکات، لە ئازادی پەرستنەوە بۆ ئازادی دەستاودەستکردنی دەسەڵات، بە تێپەڕین بە ئازادی بیروڕا دەربڕیندا، چ سیاسی بێت یان ئاینی. ئەم ئازادییە کە بەردی بناغەی دەوڵەتی مەدەنییە، وەک ئـەوەی لە فیکری جـۆن لۆک

دا دیارە، یاسا دەیپارێزێت و زەمانەتی دەکات. پاشان دەوڵەتی مەدەنی یان ئەوەی پێیدەوترێت عەلمانییەت، وەک ئەوەی لە گفتوگۆ و مشتومڕە گشتییەکانی ئەمڕۆدا لەئارادایە، مانای نکوڵیکردن یان ڕەتکردنەوەی ئاین نییە، بەڵکو مانای زامنکردنی پیادەکردنی ئاینە یان پیادەنەکردنی، بێ ڕق و کینە و بێ سوکایەتیپێکردن و بێ مۆجیاری کەسێک بۆ کەسێکی دیکە.

بەڵام لە وڵاتانی عەرەبیدا، بەدیهێنانی دەوڵەتی مەدەنی لەسەر زەمینی واقیع، تابڵێی سەختە، ئەویش لەبەر دوو فاکتەر کە پەیوەستن بەیەکەوە: فاکتەری یەکەم سیاسییە، لەبەر ئەوەی گەمەی دیموکراتی کە پەنا دەباتە بەر سندوقەکانی دەنگدان، بە حوکمی واقیعی کۆمەڵگا و ئاستە فیکرییەکەی، زۆرینە دەبەخشێت بەوانەی نوێنەرایەتی عامەی خەڵک دەکەن، لەم حاڵەتەدا ئەو خەڵکانە دینداری و تەقلید زاڵە بەسەریاندا و دەکەونە دوای گوتارە ئاینییە ئینفیعالییەکانەوە. هەرچی فاکتەری دووەمە، ئەوا فاکتەرێکی دیماگۆگییە، چونکە ئەم قوتابخانەیە هاوڵاتییانێک بەرهەم ناهێنێت بە ڕێگایەک بیربکەنەوە تێیدا پەنا بۆ عەقڵ و هەستی جیاوازی و بەهای ئازادی ببات. ئەم بێنەوبەردەیەی هەنووکە لەنێوان ئەو دوو ڕەوتەدایە، هەرچۆنێکبێت لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا و لەسەر ئاستی نزیک یان دوور، لەبەرژەوەندی ئوسوڵییەکان بێت یان بەرژەوەندی عەلمانییەکان، کۆتاییپێدێت، ئەمەش پەیوەستە بە دینامیکییەتی هەر لایەنێک و بە توانا و وزەی هەر یەکێکیان بۆ بەگەڕخستن و بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو و ماڵپەڕە ئەلەکترۆنییەکان، تاکو قەناعەت بەخەڵکی بێنن و وایانلێبکەن بەم یان بەو ئاراستەدا هەڵوێست وەرگرن.

مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، ئەوەی ئاگاداری ئەم مەسەلانەبێت و بەدواداچۆنی بۆ کردبێت، هەست بەوە دەکات دین، بەهۆی کۆمەڵێ هۆکاری جۆراوجۆرەوە کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیان نییە، بەشێوەیەکی بەهێز گەڕاوەتەوە بۆ نێو توێژە کۆمەڵایەتییە جیاواز جیاوازەکان. لێرەدا دەتوانین تەنها هەر ئەوەندە بڵێین دین بەهۆی سروشتی پەروەردە و فێرکردنەوە، هەروەها بەهۆی پەرچەکرداری خەڵکی بەرامبەر بە خۆبەزلزانینی خۆرئاوا و لوتبەرزییە دەمامکدارەکەی، لەو هۆکارە سەرەکییانەن وایکردووە دین بەو شێوە بەهێزەی بگەڕێتەوە.

بەڵام لەسەر ئاستی دوورمەودا و بەپێی لۆژیکی (هیگڵی)، ئەم حاڵەتی دیندارییە، دەبێتە هۆی ڕوودانی حاڵەتێکی (پێچەوانە) یان (دژە حاڵەت) دێنێتەئاراوە و بە حوکمی لۆژیکی شتەکان، قوفڵەکانی مەنزومەی دینی دەکرێنەوە و لێک هەڵدەوەشێنرێنەوە. چونکە نەوەکان تازەدەبنەوە و گومان لە پێداگری و دەستپێوەگرتنی باوباپیرانیان دەکەن بە جۆرێک بیرکردنەوەوە کە لەگەڵ ڕێڕەوی مۆدێرنەی گەردونیدا نایەتەوە و لەگەڵ دامەزراندنی سیستمێکدا ناتەبایە کە ڕێگە بە فرەیی فیکر و سیاسەت دەدات، سیستمێک تێیدا پێویست دەکات دین خۆی لەگەڵ دەرهاویشتەکانی سەردەمی مۆدێرنە بگونجێنێت. لێرەوە زەمەن درێژبێت یان کورت، ئاسۆی ئەم ناوچەیە، سا لە خۆرئاوای وڵاتانی عەرەبی ئیسلامییەوە بێت یان لە خۆرهەڵاتییەوە، بریتییە لە دامەزراندنی دەوڵەتی مەدەنی، چونکە لۆژیکی مێژوو ئەوەی دەوێت. خۆ ئەگەر مەسەلەکان لە مەودای دووردا وەک ئەوەی

هەنووکە دەیبینین و تێیدا دەژین مانەوە، ئەوە مانای وایە ئێمە تا ئەبەد هەر لە پەراوێزی مێژوودا دەمێنینەوە.

## پەراوێز

*ئابوری میرکانتیلی: (ڕێبازێک یان ڕەوتێکی ئابورییە و لەسەردەمی ڕێنیسانسدا هاتووەتەئاراوە.
لە دیارترین خەسڵەتەکانی ئەمانەی خوارەوەیە:
١-ڕێبازێکی ڕەخنەییە: ئەم ڕێبازە یان ڕەوتە ئابورییە پێیوایە کانزا بەنرخەکانی وەک زێڕ و زیو، کۆڵەکەی سەروەت و سامانن. ئامانجی چالاکوانی ئابوری بریتییە لە بەدیهێنانی گەورەترین بڕ لەم سەروەت و سامانە کە لە شێوەی دراوی دروستکراو لەو کانزا بەنرخانەدا خۆیدەبینێتەوە.
٢-ڕێبازێکی نیشتیمانییە: ڕێبازی میرکانتیلی پێش ئەوەی بایەخ بە بەرژەوەندی تاکەکان بدات، بایەخی بە بەرژەوەندنی وڵات دەدا.
٣-ڕێبازێکی دەستوەردانییە: میرکانتیلییەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێ دەوڵەت دەستوەربداتە ئابورییەوە، ئەمەش بە ئامانجی زیادکردنی سەروەرت و سامان لە ڕێگەی بازرگانی دەرەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم سیاسەتەش، پێویستە لەسەر دەوڵەت هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست و گونجاو بۆ هاندانی زیادکردنی بڕی ئەو کەلوپەلانەی دەینێرێتە دەرەوە بۆ وڵاتانی دیکەی بیانی بگرێتەبەر، هاوکات پێویستە هەموو جۆرە بەربەست و تەگەرەیەک دابنێ بۆ هاوردەکردنی کەلوپەلی وڵاتانی بیانی بۆ ناوەوەی وڵات. بەمەش زیادەباییەک لە میزانییەی بازرگانی دێتەئاراوە)
٤-ڕێبازێکی شمولییە: ئەم ڕێبازە بایەخی بە هەڵسوکەوتی تاکەکان نەدەدا، یان بایەخی بەو کێشە ئابورییانە نەدەدا کە لە ئاستی یەکە بچووکەکاندا دەهاتەئاراوە. بەڵکو بایەخی بە واقیعی نەتەوە و بە ئابوری هەمەکی (کلی) دەدا.

** مۆنارشیزم (monarchism) سیستمێکی سیاسییە لەسەر ئەو بڕوایە ڕاوەستاوە کە دەسەڵاتی سیاسی پێویستە لە دەستی تەنها یەک کەسدا کۆببێتەوە

(ئەو دوو پەراوێزەی سەرەوە، لەلایەن وەرگێڕی کوردییەوە، بۆ تێگەشتنی خوێنەر لە مۆرنارشیزم و ڕێبازی میرکانتیلی زیادکراوە و لەم ماڵپەڕەوە وەرگیراوە: www.dz-blanche)

**سەرچاوەی بابەتەکە:** الاوان، ٢٠١٣/٦/٣٠

# جەنگ و ئاشتی.. ئەفسانەی ئەدەبی ڕوسی و جیهانی

نووسینی: ڕەشا ئەلمالح
و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی ڕۆماننووسی ڕوسی (لیۆ تۆڵستۆی ١٨٣٨ - ١٩١٠)، لە ساتەوەختی بڵاوبوونەوەی لە ساڵی ١٨٦٩ تا ڕۆژی ئەمڕۆ، بە یەکێک لە شاکارەکانی ئەدەبی کلاسیکی دادەنرێت و نموونەیە بۆ ئەفسانەی ئەدەبی ڕوسی و جیهانی. ئەم شاکارە کارێکی داستانئامێزە، لە دیدگای پێنج خێزانی ئەرستۆکراتەوە، بەوردی باس لە ڕووداوەکانی داگیرکردنی ڕوسیا لەلایەن فەرەنسا و کاریگەرییەکانی سەردەمی ناپلیۆن و کۆمەڵگای قەیسەری، دەکات.
ئەم ڕۆمانە سەرەتا لە نێوان ساڵانی ١٨٦٥ و ١٨٦٧، لەژێر ناونیشانی (ساڵی ١٨٠٥) بە شێوەی زنجیرە لە گۆڤاری (المراسل الروسی) بڵاوکراوەتەوە، بەیەکێک لەو ڕۆمانە دوور و درێژانە دادەنرێت کە لە مێژوودا نووسراون. هەروەها ئەم ڕۆمانە لە چوارچێوەی ئەو ڕۆمانانەی بە پیتی لاتینی نووسراون، بە حەوتەم

ڕۆمانی درێژ دادەنرێت و لە چوار بەرگ پێکهاتووە. تۆڵستۆی ئـاوا وەسـفـی ئـەم ڕۆمـانـەی دەکـات: (ئەمە ڕۆمان نییە، بگرە تەنانەت قەسیدەیەک یان زنجیرەیەکی مێژوویی نییە). تۆڵستۆی پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە دیارترین کارەکان لە ئەدەبی ڕوسـیـدا، لەگەڵ پێودانگە تەقلیدییە باوەکاندا ناگونجێن. تایبەتمەندی بەشەکانی کۆتایی ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی، لەوەدایە گێڕانەوە دەگۆڕرێت بۆ گفتوگۆی فەلسەفی.

ڕوداوەکانی ڕۆمانەکە، باس لە زەمەنێک دەکات کە دەکەوێتە پێش شەست ساڵ لە نووسینی زەمەنی ڕۆمانەکە. لە ڕۆمانەکەدا قسە لەگەڵ ئەو باپیرانەدا دەکرێت کە لەسەردەمی جەنگدا ژیاون، سەردەمی داگیرکردنی فەرەنسییەکان بۆ ڕوسیا ساڵی ١٨١٢. لێرەوە، ڕۆمانەکە هەڵگری مۆرکی حەقیقەتێکی مێژووییە لە چوارچێوەی خەیاڵی ئەدەبیدا. تۆڵستۆی لە ئەنجامی خوێندنەوە و توێژینەوەکانیەوە، ژمارەی کارەکتەرەکانی نێو ڕۆمانەکەی گەیاندووەتەوە نزیکەی ١٦٠ کارەکتەر. ئەم ڕۆمانە تەنها لە زمانی ئینگلیزیدا، زیاد لە یانزە جار کاری وەرگێڕانی بۆ ئەنجامدراوە.

## داگـیـرکـردنـی مۆسکۆ و پەیوەندییە خێزانییەکان

ئەوەی لەم ڕۆمانەدا جێگای سەرنجە، ئەوەیە تۆڵستۆی ڕۆمانەکەی بە هـەردوو زمانی ڕوسی و فەرەنسی نووسیوەتەوە، سا لە گێڕانەوەدا بێت یاخود لە گفتوگۆکاندا. کارەکتەرەکان لە قسەکردنیاندا لەنێوان هـەردوو زمانی ڕوسی و فەرەنسیدا دێن و دەچن. ئەم لایەنەی ڕۆمانەکە، ڕەنگدانەوەی واقیعی ژیانی کۆمەڵگای ئەرستۆکراتی ڕوسی سەدەی نۆزدەهەم دەردەخـات. لەو سـەردەمـەدا بەکارهێنانی زمانی فەرەنسی، پیشاندانی هەیبەتی کەسەکە و بەرزی پلە و پایەکەی بووە.

لە ڕۆمانەکەدا ئەوەمان بۆ دەردەکـەوێـت لەگەڵ گەرمبوون و تاوسەندنی جەنگەکە و داگیرکردنی مۆسکۆ لەلایەن فەرەنسییەکانەوە و سوتاندنی، زاراوە فەرەنسییەکان وەردە وردە بەرەو کەمبوونەوە دەچن و مەودای بەکارهێنانیان بەرتەسکدەبێتەوە. ئەمە گەڕانەوەی ڕوسەکان بۆ کەلتووری خۆیان و دەربازبوونیان لەژێر هەژمونی کەلتووری بیانی دەردەخـات. ڕوداوەکانی ڕۆمانەکە بە ساڵی ١٨٠٥ دەستپێدەکات و باس لەسەردەمی فەرمانڕەوایی قەیسەر ئەسکەندەری یەکەم، کوڕەزای کاترینی مەزن دەکات، تا سەردەمی ناپلیۆن کە تێیدا ساڵی ١٨١٢ ڕوسیا لەلایەن فەرەنسییەکانەوە داگیرکرا. خوێنەر لە میانەی وردەکاری بەیکداچونی پەیوەندی نێوان پێنج خێزانی ئەرستۆکراتی، ئاشنای ڕووداوە مێژووییەکان و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت، خێزانەکان بریتین لە: ئال برۆخۆف، ئال بۆلکۆنسکی، ئال رۆستۆف، ئال کۆراجین، ئال درۆبیتسکوی.

خێزانی ئال برۆخۆف بەوە جیادەکرێتەوە کە زۆر دەوڵەمەندە و پەیوەندییە خێزانییەکانی لەبەریەک هەڵوەشاوەتەوە. بەڵام خێزانی ئال بۆلکۆنسکی جگە لە دەوڵەمەندبوونیان، لە کۆشکی کاترین-ی مەزن پێگەیان هەبووە و کاریانکردووە. کەچی دەوڵەمەندی خێزانی ئال رۆستۆف لە مۆسکۆ، لەڕێگەی کڕین و فرۆشتنی خانوبەرە و زەوی و زارەوەیـە، بەبێ ئـەوەی پارەیەکی ئەوتۆ پاشەکەوت بکەن، وەلێ پەیوەندییەکی خێزانی توندوتۆڵ و بەهێزیان هەیە، گەرچی ئەوان سات بە ساتی ژیان دەژیان و گوێیان بە داهاتەکانیان نەدەدا. سێ ئەندامەکەی خێزانی ئال کۆراجین بەردەوام سەرقاڵی وروژاندنی پرسیارگەلێکی زۆر بوون. دواجار خێزانی ئال درۆبیتسکوی دێت، ئەمان خێزانێکبوون ڕەچەڵەکە خانەدانییەکەیان لەگەڵ دەستکورتی پێکەوە کۆکردبووەوە.




## خاڵی دەستپێکردن

ڕۆمانەکە لە شاری سان پترسبۆرگ و لە ساڵی ١٨٠٥ دەستپێدەکات، لەگەڵ سەرەتای داگیرکردنی ناپلیۆن بۆ خۆرئاوای ئەوروپا، پاشان ترسی ڕوسیا لەو کارەی ناپلیۆن. لە ئاهەنگێکی کۆمەڵایەتیدا، چەندین کارەکتەری نێو ڕۆمانەکە دەخرێنەڕوو. لەو ئاهەنگەدا کارەکتەرە بەرژەوەندخواز و هەلپەرست و چاوچنۆکەکانی هەر خێزانێک دەناسرێن.

لە ڕۆمانەکەدا جووڵەی هێزەکانی سوپای ڕوسیا، لەگەڵ هاوپەیمانەکەی ئەو سەردەمەی، ئیمپراتۆریەتی نەمسا، دەبینین. هەر یەکە لە «ئەندرۆ بۆلکۆنسکی» کە گەنجێکی پڕ هیوا و ئاوات و زیرەکە، لەگەڵ «نیکۆلاس ڕۆستۆف» کە لاوێکی سەرەڕۆیە، دەبینین بەرەو گۆڕەپانی جەنگ بەڕێدەکەون. لەکاتێکدا «ئەندرۆ» بریندار دەبێت و خێزانەکەی هیچ هەواڵێکیان لەبارەیەوە دەستناکەوێت و پێیان

وایە کوژراوە. براکەی «بییر بزۆخۆف» کە گەنجێکی ئاڵۆز و هەڵسوکەوت سەیرە، دەبێتە میراتگری شەرعی باوکە دەوڵەمەندەکەی و بەخێرایی «هێلین گۆراگین»ی شۆخ و شەنگ دەهێنێت. پاش ماوەیەکی کەم «بییر» ناپاکی هاوسەرەکەی بۆ دەردەکەوێت و داوا لە دۆستی هاوسەرەکەی دەکات شەڕەشیر بکەن. «بییر» هەوڵدەدات لەڕێگەی پەیوەندیکردنی بە (ماسۆنییەتەوە) لەو شکست و نەهامەتییەی تێیکەوتووە ڕزگاری ببێت.

هـاوزەمـان لەگەڵ گـەڕانـەوەی «ئـەنـدرۆ» بۆ لای خێزانەکەی لە مۆسکۆ، هاوسەرەکەی کە ناوی «لیزا»یە منداڵی دەبێت، هەر هێندەی منداڵەکەی دەبێت، خۆی گیان لەدەستدەدا. ئیدی ئەندرۆ کاتی خۆی بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەی و بۆ بەڕێوەبردنی کڕین و فرۆشتنی خانوبەرە و زەوی و زار تەرخاندەکات. هەروەها «هێلین»یش هەوڵدەدا «بییر»ی هاوسەری لێیخۆش ببێت، پاشان تێپەڕینی ماوەیەک، لێیخۆش دەبێت.

«ئەندرۆ» کاتێ دەڕوات بۆ سان پترسبۆرگ، تاکو چاوی بە ئیمپراتۆر بکەوێت و ئەو پلانە سەربازییەی بخاتەبەردەست کە داینابوو، هەست بە بێهودەیی و پوچگەرایی بیرۆکەکەی دەکات. بەڵام لەوێ لە سان پترسبۆرگ، لە خێزانی ڕۆستۆف «ناتاشا» دەناسێت و پێی خۆشحاڵ دەبێت و بەخێرایی داوای هاوسەریگری لەگەڵ دەکـات، «ناتاشا»ش بەخێرایی ڕەزامـەنـدی دەردەبـڕێـت. بـەڵام باوکی «ئەندرۆ» بەو هاوسەرگیرییە ناڕازییە. لەبەر ئەوە ئەندرۆ بۆ مـاوەی ساڵێک دەڕوات بۆ دەرەوەی وڵات. لێرەوە بەسەرهاتەکان بەناویەکدادەچن و چنینی پیلانگێڕییەکان لێرە و لەوێ، لەنێوان خزم و ناسیاوەکاندا و هەریەکەی بەپێی بەرژەوەندی و سود و قازانجی خۆی، دەستپێدەکات.

## بۆردینۆ

لە سیاقی ڕووداوەکانی بەشی سێیەمی ڕۆمانەکەدا، سەرەتای جەنگی بۆردینۆی ساڵی ١٨١٢ دەست پێدەکات کە تێیدا ناپلیۆن مۆسکۆ داگیر دەکات، لەگەڵ زەرەر و زیانێکی ماڵ و ڕۆحـی گـەورە لە هەردوولا. هێزەکانی فەرەنسا بۆردومانی خانوبەرە و زەوی و زاری شازادە بۆلکۆنسکی دەکات، بەمەش دووچاری جەڵتەیەکی دەماغ دەبێت و بەو هۆیەوە کۆچی دوایـی دەکـات. هەر لەم سیاقەدا خوێنەر کاراکتەری ناپلیۆن دەناسێت کە کاراکتەرێکی لەخۆبایی و ملهوڕ و نەرجسییە و لەگەڵ ژمارەیەک لە جەنەڕاڵە سەرسەختەکانی، جەنگەکە بەڕێوەدەبات.

چەندین لاپەڕەی ڕۆمانەکە بۆ گێڕانەوەی سروشتی جەنگەکەی بۆردینۆ تەرخانکراوە، دوای گەڕانەوەی بییر بۆ سوپا و بینینی گۆڕەپانی جەنگەکە کە بە لاشەی کوژراوی هەردولا داپۆشرابوو، گۆڕەپانەکەی وەک قەسابخانەیەک دێتەبەرچاو، دواتر هەر هێندەی ناپلیۆن پێ دەخاتە ناو شاری مۆسکۆ، بییر دەست دەکات بە داڕشتنی پیلانی کوشتنی ناپلیۆن. ئێمە لە ڕێگەی دیدگای «ئەندرۆ»وە، کە لە خێمەیەکی فریاگوزاریدا شەهید دەکرێت، بە جۆرێکی دیکە لە ماهییەتی جەنگ و وێرانکارییەکانی جەنگ و ئێش و ئازاری سەربازەکان تێدەگەین. ئێمە لەگەڵ «ئەندرۆ» چرکەساتێکی مرۆڤدۆستانە دەژیـن، چرکەساتێک لێیەوە تێدەگەین ئەم سەربازە چ خۆشەویستییەکی مرۆڤدۆستانەی بۆ هەموان هەبووە، تەنانەت بۆ دوژمنەکانیشی.

لە ساتەوەختی چاوەڕوانیکردنی «بییر» بۆ دەرکەوتنی ناپلیۆن، بەهۆی ئـەو ئـاگـرەی نیوەی مۆسکۆی خاپورکردبوو، ئەفسەرێکی فەرەنسی و منداڵێک لە مـەرگ ڕزگـاردەکـات. هەروەها کچێکی گەنج ڕزگار دەکات کە لەلایەن سەربازێکی فەرەنسییەوە هەوڵی

لاقەكردنی دەدرا، دواجار مەسەلەكە بەوە كۆتایی پێدێت بییر لەلایەن هێزەكانی ڕوسیاوە بە تۆمەتی هۆكاری كەوتنەوەی ئاگرەكە، دەستگیر دەكرێت. بییر لەكاتی بردنیدا بۆ گرتوخانەكە، «بلاتۆن»ی جوتیاری لەگەڵدایە كە ئەویش یەكێكە لە گیراوەكان، لەو كاتەدا بییر هەست دەكات بەهای ژیان بریتییە لە بەخشینێكی مرۆڤدۆستانە. چەكدارەكان لە ڕزگاركردنی لە گرتوخانەكە هاوكاری دەكەن. لەلایەكی دیكەوە ئەندرۆ دوای ئەوەی چاوی بە ناتاشا دەكەوێت و لەمیانەی بوونی لەگەڵ هێزەكانی بەرگریدا، شەهید دەكرێت.

ڕووداوەكانی ڕۆمانەكە لەگەڵ جەنگدا بەرەوپێشەوە دەڕوات و گەشەدەكات، هاوتەریب بە مەرگی زۆرێك لە خەڵك، مۆسكۆ سەرلەنوێ نۆژەندەكرێتەوە. جەنگ وادەكات بیركردنەوەی ژمارەیەك لە كارەكتەرە سەرەكییەكانی ڕۆمانەكە، سەرلەنوێ گۆڕانی بەسەردابێت، وەك بییر كە پەیوەندییەكی خۆشەویستی لەگەڵ «ناتاشا» دروستدەكات. ڕۆمانەكە بە مشتومڕی نێوان بییر و نیكۆلای كۆتایی پێدێت، دەربارەی كارە نێگەتیڤەكانی ئەسكەندەری ئیمپراتۆر كە نوقمی ئاین ببوو، وڵاتی لە دەست كۆمەڵێ بەرژەوەندخوازدا جێهێشتبوو. بییر داوا دەكات ئیمپراتۆر كۆمەڵێ گۆڕانكاری لە ڕژێمەكەیدا بكات، كەچی نیكۆلای سوورە لەسەر ئەوەی بەرگری لە ئیمپراتۆر بكات و بە شێوەیەكی كوێرانە وەلائی خۆی بۆ دووپات بكاتەوە.

**١٨٠٥**

تۆڵستۆی لە میانەی خزمەتكردنی لە جەنگی (قرم) دا، دەستیكرد بە نووسین لەسەر جەنگ، سەرەتا لە ڕێگەی كۆمەڵێ لە چیرۆك و ڕۆمانی كورت كورتەوە. هەرچی ڕۆمانی جەنگ و ئاشتییە، دوای ژنهێنانی و جێگیربوونی لە ماڵەكەیدا، دەستی كرد بە نووسینی. تۆڵستۆی نیوەی بەرگی یەكەمی ئەم ڕۆمانەی لەژێر ناونیشانی ١٨٠٥ نووسیوە. یەكەم دەستنووسی ڕۆمانەكەی لە ساڵی ١٨٦٣ تەواوكردووە. پاشان لە دوو ساڵی دواتردا هەندێ بەشی لەوەی نووسیبووی بڵاوكردوەتەوە. لە میانەی نووسینی نیوەی دووەمی ڕۆمانەكە، بە شێوەیەكی چڕ و قووڵ دەستیكرد بە خوێندنەوەی كارەكانی فەیلەسوفی ئەڵمانی (شۆبنهاوەر ١٧٨٨ - ١٨٦٠)، لەو خوێندنەوەیەدا شێوازی گێڕانەوەی مێژویی و گێڕانەوەی ڕۆمان-ی پێكەوە بەستەوە.

## ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی لە سینەمادا

ساڵی ١٩١٥ یەكەم فیلمی ڕوسی دەربارەی ڕۆمانەكە، لە دەرهێنانی ڤلادیمێر گاردین و نواندنی گاردن و سەماكاری باڵێ خانم «ڤیرا» پێشكەشكرا. ساڵی ١٩٥٦ فیلمێكی ئەمریكی بە هەمان ناونیشانی ڕۆمانەكە، لەدەرهێنانی گینگ ڤیدرۆ و نواندی ئۆدری هیبۆرن و هنری فۆندا و میلی ڤیریر پێشكەشكرا. ساڵی ١٩٦٦ دیسانەوە فیلمێكی ڕوسی دەربارەی ڕۆمانەكە، لە دەرهێنانی سێرگی بۆندارشۆ پێشكەشكرا، لەم فیلمەدا لیۆدمیلا سافیلییا ڕۆڵی ناتاشا بۆلكۆنسكی گێڕا.

## ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی لە تەلەفزیۆن

ساڵی ١٩٧٢ وێستگەی پەخشی بی بی سی بەریتانی، زنجیرەیەكی تەلەفزیۆنی كە لە ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی وەرگیرابوو، بەرهەمهێنا. ئەم زنجیرەیە لە نواندنی ئەنتۆنی هۆبكنز و ڕۆبرت دیفیس و دەرهێنانی جۆن دیفیس بوو. ساڵی ٢٠٠٠ تەلەفزیۆنی فەرەنسی فیلمێكی لەسەر جەنگ و ئاشتی بەرهەمهێنا، لە دەرهێنانی فرانسوا ڕۆسیلۆن و ڕۆبرت برۆبیكر ڕۆڵی بیتر-ی بینی. ساڵی ٢٠٠٧ تەلەفزیۆنی ئیتالی، ڕۆمانی جەنگ و ئاشتی وەك حەڵقەی كورت كورت بەرهەمهێنا، ڕۆبرت دومهیلم كاری دەرهێنانی بۆ ئەنجامدابوو.

**سەرچاوە:** بیان الكتب، ٢٠١٣/٦/٧

# گفتوگۆ و بێدەنگی لە کەلتووری خۆرهەڵاتدا

نووسینی: مەسعود محمود حسن
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئایا لە کەلتوری هاوچەرخی خۆرهەڵاتدا بەهایەک بۆ گفتوگۆ هەیە؟ پانتاییەکەی چەندە؟ بەربەستەکانی کامانەن؟ ئەی دەرئەنجامەکانی چین؟ ئەو ناکۆکی و ململانێیانەی لە خۆرهەڵات و باکوری ئەفریقادا سەرهەڵدەدەن، شکستی بەشی هەرە زۆری سیستمەکانی ناوچەکە لە پێکەوەژیانیان لەگەڵ میللەتانی خۆیان یاخود لەگەڵ یەکتردا، شکستی دەستەبژێری ڕۆشنبیر لە وردوخاشکردن و لەناوبردنی دومەڵە کەلتوورییەکان کە لە هۆشمەندی مرۆڤی خۆرهەڵاتیدا دەرکەوتووە، وەک ستمگەری و تایفەگەری و کەمایەتی و قاعیدە و تیرۆر، دواجار ئەو بێ دەسەڵاتییەی گەلانی خۆرهەڵات سەبارەت بە بەشداریکردنیان لە بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیاندا دووچاریهاتوون، هەروەها گەلانی خۆرهەڵات لەلایەن ڕژێمەکانیانەوە لە وەرگرتنی

بڕیارە نیشتیمانی و چارەنوسسازەکاندا، نە پرسوڕایان پێدەکرێت و نە گوێیان لێدەگیرێت نە داوای کۆمەک و هاوکارییان لێدەکرێت. هەر هەموو ئەوانە سیمایەکە لە سیماکانی نەبوونی پرنسیپی گفتوگۆ لە ژینگە کەلتوورییەکەدا، خۆ ئەگەر ئەم گفتوگۆیە هەبێت و لەئارادابێت، ئەوا هێشتا لە زهنیەتی خۆرهەڵاتیدا خونچەیەکی بچووکە.

## بەربەستی یەکەم

ئەوەی لەبەردەم گفتوگۆدا ڕێگرە، ئەو شتەیە کە پێیدەوترێت دوانەی حەق و ناحەق (باتڵ)، یان ڕاست و هەڵە کە عەقڵیەتی خۆرهەڵاتی لەسەر دامەزراوە. کێشەکە لە خودی ئەو (دوانەییەدا) نییە، چونکە ئەوە لای هەمو مرۆڤەکان هەیە. بەڵام مرۆڤ لە خۆرهەڵاتدا، لەوەدا شکستیهێناوە کە نازانێ چۆن و بە چ شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ ئەو دوانەدا بکات. عەقڵی خۆرهەڵاتی بیرۆکەی لابردنی هەڵە و ناحەق لە ڕێگەی کوشتنەوە پیادە دەکات! بۆ نموونە دەرهاویشتەکانی ئەو بیرۆکەیە لە سوریا و لیبیا و عێراق و یەمەن و سۆماڵ و سودان دەبینین.

حاڵەتەکە لە تۆمەتبارکردنی تیمی بەرامبەر بە هەڵە و بە باتڵ دەستپێدەکات، پاشان هەوڵدان بۆ سڕینەوەی لە ڕێگەی هێز و کوشتنەوە. کوڕوکاڵی خۆرهەڵات، ئەوانەیان باوەڕیان بە زانست هەیە، لە بیرکردنەوەیاندا سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەو خاڵە دەڵێن: بیروڕای ڕاست ئەگەری هەڵەی هەیە، بیروڕا هەڵەکەی تۆش، ئەگەری ڕاستی هەیە. لێرەوە هەڵە و ڕاست دەبنە حاڵەتێکی ڕێژەیی. جیاوازی لە بیروڕادا پێویست بە ناکۆکینانەوە ناکات و لایەنە جیاواز و ناکۆکەکان دەکرێ پێکەوە بژین و هەڵبکەن. چونکە خاڵی هاوبەشی بەرفراوان لەنێوان مرۆڤەکاندا هەیە، هەڵە ناکوژرێت بەڵکو ڕاست دەکرێتەوە.

## بەربەستی دووەم

دووەم بەربەست لەبەردەم دەرکەوتنی گفتوگۆدا، بریتییە لەو مەیلە دەسەڵاتخوازییەی لای گەلانی ناوچەکە هەیە، ئەم مەیلە گروپ و دەستە و پێکهاتەکانی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی، بەشێوەیەکی هەندەسی ستوونی داڕشتووە. بەجۆرێک هەمیشە چینێکی دەوڵەمەند و چینێکی هەژار، چینێکی بەرز و چینێکی نزم لەئارادایە. لە خێزاندا، لە قوتابخانەدا، لە گەڕەکدا، لە پەرلەماندا و بەشێوەیەکی گشتی لە دەوڵەتدا ئەم دابەشکردنە ئەندازەییە دەبینین. هەمیشە فەرماندە و فەرمانبەر هەیە و هیچ دەرفەتێکیش بۆ گفتوگۆ و لێکتێگەشتن نییە. ڕیفۆرمخوازەکان پێشنیاری گۆڕینی هەندەسە شاقوڵییەکە بۆ هەندەسەیەکی ئاسۆیی دەکەن، بەجۆرێک فەرماندە و فەرمانبەر، ناوبەناو شوێنەکانیان بگۆڕنەوە و ببن بە نێرەر و وەرگر.

## بەربەستی سێیەم

ڕەتکردنەوەی ئەویتر، ئەویترێک کە چەندین وێنەی هەیە، لەوانە ڕەتکردنەوەی زۆرینە بۆ کەمینە، ڕەتکردنەوەی دەستەی فەرمانڕەوا بۆ دەستەی ئۆپۆزسیۆن، ڕەتکردنەوەی تایفی و نەتەوەیی و ئیتنی و ئاینی. ڕێگا بۆ ڕیشەکێشکردن و لابردنی ئەم جۆرە ڕەتکردنەوانە، لە گۆڕانکاری کەلتووریدا دێتەدی، گۆڕانکارییەک پێویستە جەخت لەسەر دەوڵەمەندی فرەیی و هەمەڕەنگی بکات: و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا (الحجرات ١٣).

## بەربەستی چوارەم

بریتییە لە چاندنی کەلتووری ترس لە زهنیەتی گەلانی خۆرهەڵاتدا. سەرچاوەی ئەم ترسە، سەرەتا لە ڕژێمەکان و دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەواوە هات، کە بەدرێژایی چەندین دەیە، بە ئاگر و ئاسن و سەرکوتکردن و گرتن و دوورخستنەوە، مامەڵەیان لەگەڵ ئۆپۆزسیۆندا دەکرد. ئەمە وایکرد هەندێ لە بەرهەڵستکاران بە هەمان شێوەی ئەوان وەڵامیان بدەنەوە. ئیدی لێرەوە ئەوە هاتە ئارا کە پێیدەوترێت ترس و ترسی پێچەوانە، بەمەش هیچ متمانەیەک لەنێوان ڕژێمەکان و کۆمەڵگاکاندا نەما.

هەندێ لە ڕیفۆرمخواز و ڕۆشنبیرانی گەلانی خۆرهەڵات، بەتایبەت هەندێ لە بەرهەڵستکاران، بانگەشەی گەڕانەوەی متمانە لەیەک لاوە دەکەن و بانگەشەی پابەندبوون بە کەلتووری (هابیل) ەوە دەکەن: (ئەگەر دەستت بۆ من درێژ کرد تا بمکوژیت، ئەوا من دەستت بۆ درێژ ناکەم تا بتکوژم، من لە خودا دەترسم – المائده ٢٨).

هەروەها دوژمنایەتی و ڕق و کینە، هۆکارن بۆ بەرتەسکردنەوەی گفتوگۆ لە خۆرهەڵاتدا. لە ڕاستیدا کەلتووری هاوچەرخی خۆرهەڵات، میکانیزمی چاندنی خۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکاندا نییە، گەرچی ئیرادەیەکی بەپەرۆش بۆ خۆشەویستی هەیە، بەڵام لە بەرامبەردا، پەککەوتنێک لە تواناکانی خۆرهەڵاتدا بۆ دروستکردنی خۆشەویستی هەیە. گەلێک وەعز و ئامۆژگاری بەم ئاراستەیە هەیە، وەلێ لەسەر ئەرزی واقیع ئەنجامەکان ناگۆڕدرێن. ئەو هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکە، هەموویان پێکەوە و دەست لەناو دەست، هاتوهاوارییانە بۆ نەهێشتنی پانتایی گفتوگۆ لە کەلتووری خۆرهەڵاتدا.

نەبوونی گفتوگۆ لە کەلتووری خۆرهەڵاتدا، لەدایکبوونی بێدەنگی بەرهەمدەهێنێت. بێدەنگی لە خۆرهەڵاتدا حاڵەتێکی کەلتووری نێگەتیڤە. دەرکەوتەکانی ئەو بێدەنگییە لەسەر ئاستی میللی، بریتییە لە گوێنەدان بە کێشەکانی کۆمەڵگا، هەستکردن بە لەدەستدانی توانای گۆڕانکاری، بێ هیوای و نائومێدبوون، قووڵبوونەوەی (تاکگەرایی- فەردانییەت) لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا و بوونیان بە چەند دورگەیەکی دوورەپەرێز، بڵاوبوونەوەی دیاردەی نامۆبوون بە خود و بە کۆمەڵگا. هەندێ لە دەزگا ڕۆشنبیریی و کەلتوورییەکانی خۆرهەڵات، وەک جۆرێک لە نەمری مامەڵە لەگەڵ ئەو بێدەنگییەدا دەکەن. بەتایبەت دەزگای خێزان و دەزگای قوتابخانە. خێزان و قوتابخانە پێیان وایە بێدەنگی قوتابی، دیاردەیەکی پۆزەتیڤە و گوزارشتە لە عەقڵانییەت کە خەریکە لەدایکدەبێت.

لەم جۆرە هۆشیارییەوە، ئەو دوو دەزگایە، خێزان و قوتابخانە، دەیانەوێت دیاردەی بێدەنگی بەسەر هەمو منداڵەکاندا بسەپێنن و لە عورف و عاداتی پەروەردەیی و ڕۆشنبیریدا جێگیری بکەن. ئەوانە نازانن بەو کارەیان ڕۆحی گفتوگۆ لەنێو نەوەکانماندا دەکوژن و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکانمان دوادەخەن. چونکە نەبوونی گفتوگۆ واتای مانەوەی کێشەکان، بەردەوامی کوشتن و دوورخستنەوە و سڕینەوە، قووڵکردنەوەی کەسێتی نێگەتیڤ، نامۆبوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە مرۆڤی خۆرهەڵاتیدا.

**سەرچاوە:** الاوان، ٢٢نیسان، ٢٠١٣

شتێكی ئاشكرایە كە بڵاوكردنەوەی نامەكانی سامۆێیل بێكێت تا ئاستێكی بەرز ڕووداوێكی گرینگە و شتێكی بە بەهاو گەورەیە. مرۆڤ چاوەڕوانی ئەوەی دەكرد و لەو بڕوایەدا بوو، كە ئەو شتانەی زیاتر لە هەموو شتێكی تری نووسەر خۆیین، بە تایبەتی، كە نامەكانی بەوپەڕی تواناوە، هەموو جۆرە پێشنیارێک سەبارەت بە بڵاوكردنەوەیان ڕەت بكرێتەوە. بەڵام بێكێت تا ئاستێكی باڵای سنووردار و بەوپەڕی پارێزییەوە، ئەو ڕەزامەندییەی دەربڕیووە: تەنها ئەو نامانە بڵاوبكرێنەوە، كە وەكوو نووسەرێک گوزارشت لەو دەكەن و پەیوەندی بەوەوە هەیە. ئەم مەرجەش یەكڕاست ئەم پرسیارە دەخوڵقێنێت، ئایا چ جیاوازییەک، چ سنوورێک لە نێوان كەسایەتی نووسەر و كارە ئەدەبیەكانیدا هەیە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش، بەشێوەیەكی بێ لایەنانە و دەست نیشان كردنی جیاوازییەكانیان، زۆر سەختە؛ هەمیشە و بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ، سنووردانان لە نێوان كەسایەتی نووسەر و بەرهەمە ئەدەبیەكانیدا، جۆرە نابابەتیبوونێک لەخۆدەگرێت. بێگومان لە كۆتایشدا، تا ئاستێكی بەرز بەرپرسیاریەتی و هەڵبژاردنی نامەكان و بڕیارەكە دەكەوێتە سەر شانی ئەو كەسەی/كەسانەی نامەكان هەڵدەبژێرن. <١>

ڕێكخەر و سەرپەرشتیاری كۆكردنەوەی ئەم نامانەی بێكێت، دووپاتی ئەوە دەكەنەوە، بێكێت لەو نامانەیدا كە باسی ڕەوشی تەندروستی خۆی دەكات، بۆ نموونە ئازاری قاچەكانی، ئاستی ترپەی دڵی، هەڵئاوساویی و سووربوونەوەی پێستی، لەسەر ئاستێكی گەورە و گرینگی پێ دان هەڵگری ئاماژەكانی ئەون، وەک نووسەرێک. ئەو كەسانەشی، كە مافی چاپ و بڵاوكردنەوەی بەرهەمەكانی نووسەریان هەیە، بیروبۆچوونێكی تریان هەیە، بە ڕای ئەوان ئێمە بۆمان نییە سەبارەت بە تەندروستی و گرژییەكانی جەستەی نووسەر، هیچ شتێک بخوێنینەوە. هەروەها بۆشمان نییە هیچ شتێک سەبارەت بە نهێنی و پەیوەندییە دڵدارییەكانی و دونیای ئافرەتەوە بزانیین. ئەمەش شتێكی سەیرە، بەتایبەتی یەكێک لە بنەماڵەی بێكێت، بە ئارەزوی خۆی و بەبێ مۆڵەت بەوپەڕی سەربەستییەوە نموونە لە نامەكانی دەهێنێتەوە، بەكارییان دەهێنێت و بڵاویان دەكاتەوە. بۆ نموونە نابێت سەبارەت بەو پەیوەندییە دژوار و پڕ لە كێشەو دەردی سەرییەی بێكێت لەگەڵ «لویسا» كچەكەی جێمس جۆیس هەی بووە، لەوە زیاتر بزانیین كە بێكێت هەستی بە ئازاری ویژدان كردووە، لەبەر ئەوەی هەرگیز سەردانی نەكردووە، ئەو لەو بڕوایەدا بووە، كە سەردانی كردنی «لویسا» زیاتر بۆتە هۆی توڕەیی و بێزاركردنی. <٢>

بەڵام چیتر قسەكردن لەسەر (نامەكانی سامۆێیل بێكێت ١٩٤١-١٩٥٦ لە ئامادەكردنی: جۆرج كرەیگ، ماتا دا و فەیسن فێلد، دان جوون و لۆویس مۆر ئۆڤەێیک، لە بڵاوكراوەكانی زانكۆی كەیمبریج یونیڤێرستیی پرێس، ٨٨٤ لاپەرە) كەڵكی نییە. <٣>

ئێمە ژمارەیەكی ئێجگار زۆر، نزیكەی پانزە هەزار نامەی ترمان دۆزیووەتەوە، كە لەلایەن سەرپەرشتیار و دەستەی نووسەرانێكی تایبەتمەندەوە، بە ڕەنج و تەقەلایەكی زۆر دەبێت سەرلەنوێ بنووسرێنەوە. ئەم دەستەیە دووپاتی ئەوە دەكەنەوە، كە لەگەڵ ڕۆژگاردا دەست و خەتی بێكێت گۆڕانكارییەكی وەهای بەسەردا هاتووە، كە زۆر زەحمەتە بخوێندرێتەوە. لەم چاپەدا هەڵبژاردەیەک لە نامەكانی، كە نزیكەی دوو هەزار و پێنج سەد نامە و ڕستەی كورت لە خۆدەگرێت، بڵاودەكرێنەوە.

نامەكان، لێک دانەوە، ڕەوانبێژی و ڕوون كردنەوەیەكی تەواوی، ورد و هەمەلایەنەش لە خۆدەگرێت، بۆ نموونە: كە بێكێت دەنووسێت ئەو دڵی زۆر بەوە خۆشە «شوگە ڕێی» بردوویەتییەوە، خوێنەر خێرا دەزانێت مەبەستی بێكێت لەم دڵ خۆشییەی چییە، كە ئەو یاریزانە، مەبەست «شوگە ڕێی»یە لە نۆی مانگی دوانزەی ساڵی

١٩٥٥دا، لە پێشبڕکێیەکدا دەبێتە پاڵەوانی جیهانی لە کێشی ناوەند، بەوەی بە بۆکسێک «کارل بۆب ئۆڵسن» دەبەزێنێت.<٤> بەشێکی زۆری نامەکانی ئەم قۆناخە بە زمانی فەڕەنسی نووسراون؛ لەم چاپەدا ئەو نامانەی کە لە بنچینەدا بە فەڕەنسی نووسراون، وەرگێردراویشن بۆ سەر زمانی ئینگلیزی و پێکەوە بە فەڕەنسی/ ئینگلیزی بڵاودەکرێنەوە.

بەرگی یەکەم، کە نامەکانی نێوان ساڵانی ١٩٢٩-١٩٤٠ لە خۆدەگرێت، لە مانگی دوانزەی ساڵی ٢٠٠٩ دا بڵاوکراونەتەوە، ئێستاش کاتی بڵاوکردنەوەی بەرگی دووهەمە، کۆی نامەکانیش لە چوار بەرگدا کۆکراونەتەوە.

بەرگی دووهەمی نامەکان لە ساڵی ١٩٤٠ەوە دەست پێ دەکات و لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆتاییان پێ دێت — ئەو ساڵەی، کە بێکێت پەنجا ساڵەی تەمەنی پڕ دەکاتەوە. بێکێت بەم شێوە کورتە گوزارشتی لە پەنجا ساڵەی تەمەنی خۆی کردووە: «هەژدە هەزار ڕۆژ، بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆم نییە پێشانی بدەم.»

ئەم بەرگەی نامەکان تەنها لە ڕووی تیئۆرییەوە لە ساڵی ١٩٤٠ەوە دەست پێ دەکات، لەبەر ئەوەی لە کاتی ساڵانی شەڕی جیهانی دووەمدا، بێکێت پەیوەندی لەگەڵ جووڵانەوەی ڕزگاری خوازی فەڕەنسی، دژی نازییەکان هەبووە؛ بۆیە هیچ نامەیەک لەم قۆناخە و لەو ڕۆژگارەی ژیانیدا بەردەست نەکەوتووە، ئەوەی هەش بووە لە ناوچووە. لەبەر ئەوە بە ڕاستی کتێبەکە، لە دەوروبەری ١٧ی مانگی یەکی ساڵی ١٩٤٥ەوە دەست پێ دەکات، ئەو دەمەی بێکێت گەڕاوەتەوە بۆ ئەپارتمانەکەی خۆی لە پاریس، لە ناوچەی rue des Favorites.<٥>

بێکێت لە ساڵی ١٩٤٥دا تا ئاستێکی سنووردار و لە ناو گروپێکی بچوکی ئەدەبی، کە تەنها چەند کەسێکی دەستەبژێر «نوخبە» دەبن، ناسرابوو. لەو دەمەدا بێکێت دوو ڕۆمانی نووسی بوو: «وات» Watt و «مۆرفی» Murphy، هەروەها چەند پارچە شیعرێک و باسێکی کورت سەبارەت بە «مارسێل پرۆست» گەرنا لە ناوەندە ئەدەبی و هونەرییەکەدا، بەشێوەیەکی گشتی کەسێکی نەناسراو بووە.<٦> بەڵام لە پڕ لە ساڵی ١٩٥٦دا دەبێتە شانۆنامەنووسێکی بەناوبانگ و جیهانی؛ هەر لەم کاتانەشدا بڕوانامەیەکی ئەکادیمی لەسەر کارەکانی نووسرا بوون. هەر لێرەوە بێکێت کتووپڕ بانگهێشتی ئەکادیمیە و ئاهەنگە فەرمییە گەورەکان، لە هەموو جیهانەوە دەکرا. لەم قۆناخەدا، بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی هەبووە، ئەوەی کە بێکێت -ی پێ ناسرابوو، تەنها بێکێتی شانۆنامەنووس بووە، بێکێت وەکوو نووسەری دەقە شانۆییەکانی «بەدەم چاوەڕوانی گۆدۆ» و «کۆتایی گەمە» و «ڕۆژە بەختیارەکان» ناوبانگی بڵاوبووبووەوە.<٧>

لەگەڵ ئەوەشدا، من دەمەوێت لێرەدا و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دووپاتی ئەوە بکەمەوە، کە ناوبانگە گەورە پرشنگدارەکەی بێکێت، وەکوو بلیمەتێکی مەزنی ئەدەبی سەدەی ڕابردوو، بە پلەی یەکەم ناگەڕێتەوە بۆ دەقە شانۆییەکانی، بەڵکو بۆ ڕۆمانەکانی یان بۆ ئەوەی، کە دەکرێت ئەمڕۆ بە سێینە ئاماژەی بۆ بکرێت، دەگەڕێتەوە.

ئەو دەقە لیریکیانەی، کە بێکێت لە ماوەی ئەو ساڵانەدا بڵاوی کردبوونەوە، بریتی بوون لە: «مۆلۆی»، «مالۆن دەمرێت» و «ئەوەی ناو نانرێت».<٨> بێکێت لەم سێینەیەدا قۆناخ بە قۆناخ، پلە پلە هەموو جۆرە کەل و پەلە دەرەکی و ئێکسسوارەکانی هونەری ڕۆمان، کە بە تەکنیک ئاماژەی بۆ دەکرێت، وەلاوە ناوە، لە کۆتایدا تەنها دەنگێک ماوەتەوە کە زیاتر بەرەو تاریکی ڕۆیشتووە و لەناو بێ دەنگیدا منگە منگی کردووە تا بەتەواوی بزر بووە. ئەم نووسەرە، لە ساڵی ١٩٦١ بە شاکارێکی پەخشان ئامێزی گەورە، بەناوی «ئەوە چۆنە» زیاتر لەم جۆرە تەکنیکە و فۆرمەکانی سێینەکەی نزیک دەبێتەوە.

بە بۆچونی من و لەو مێژووی ئەدەبە تایبەتییەی، کە من خۆم ڕێکم خستووە، بێکێت و خۆرخێ لویس بۆرخێس



دوو نووسەری دانسقەو بێ هاوتان. <٩>

هەر لەم قۆناخەدا بێکێت سەرپەرشتیار و خاوەنی دەزگای چاپەمەنییە فەرەنسییەکەی «ژیرۆم لیندۆن» لە «ئێدیتیون دێ مینوی» Editions de Minuit دەبینێت، لیندۆن دەست بەجێ هەست بە گەورەیی بێکێت دەکات، هەر لیندۆن خۆشی هەموو پەیوەندییەکانی دەرەوەی بۆ دەبات بەڕێوە، هەوڵی ئەوەش ئەدات، کە بەرهەمەکانی بەشێوەیەکی بەربڵاو، بەهەموو ئامرازە بەکارهێنراوەکان بڵاوبکاتەوە. لەهەمان کاتدا ئەم دەزگایە بێکێت لە هەموو جۆرە کەناڵە دەرەکییەکان بە دونیای دەرەوە دەپارێزێت، کە بێکێت بە هیچ شێوەیەک نەی دەوویست هیچ لە بارەیانەوە بزانێت، لەوانەشە کە بێکێت هەر نەشی توانیبێت مامەڵەیان لەگەڵ بکات و ڕێکیان بخات.

ئەو بوونەوەرانەی لەم نامانەدا دەردەکەون و ئەو کەسانەشی، کە نامەکانی بۆ نووسیون، کەسانێکی تایبەتمەند و نزیکی بوون، دەرگاکانی ژیانی بۆ چەند کەسێکی نزیک و خۆشەویستی خۆی کردۆتەوە، بەڵام



لە هەمان کاتدا بە هەموو شێوەیەک کەسانێکی تری لە دەرەوەی ئەو پەیوەندییانەوە هێشتۆتەوە.

لەم بەرگەدا سنووری هاوڕێیەتییەکەی لەگەڵ لیندۆن و بەرپرسی دەزگای چاپەمەنییە ئەمەریکییەکەی «بارنێ ڕوسێ» گەورە و بەربڵاو دەبێت، هەروەها چەند کەسێک لە شانۆکاران و جیهانی هونەر و چەند هاوڕێیەکی دێرینی ڕۆژانی دبلن، تا ئەوکاتەش پەیوەندی پێیانەوە ماوە. هەر لەم ساڵانەدا بێکێت بە تەواوی هەموو پەیوەندییەکانی خۆی بە زێدی باو و باپیرانییەوە «ئێرلەندە» دەپچڕێنێت. بێکێت هەر بەر لەم پەیوەندی پچڕانەوە، بە وڵاتەکە خۆیەوە دەست بەرداری زمانەکەی دەبێت، کە زمانی ئینگلیزی بووە، بۆ ئەوەی لەبری ئەوە زمانی فەرەنسی بکاتە زمانی پەیڤ و نووسینەکانی.<١٠>

هەر لەم کاتەشدا، براکەی لەسەرەمەرگدا دەبێت، بێکێت لە دبلنەوە نامەیەکی ناردووە و دەڵێت: «بەم زوانە من تەنها کەسێک دەبم لە خێزانەکەمان، کە لە ژیاندا مابێت، هیوادارم هەرگیز پێویست نەکات جارێکی تر بگەڕێمەوە.»<١١> بێکێت تێگەیشتنی بۆ بەرهەمەکانی

فره واتا و پەرش و بڵاوە، خۆی دووپاتی ئەوە دەکاتەوە، کە قێزی لێیان دەبێتەوە، بەمەش مەبەستی ئەوەیە، کە لەدوای پەنجا ساڵ تەمەنییەوە لەسەر ئەم گۆی زەوییەمان، هیچ شتێکی ئەوتۆی نەنووسیوە، کە شایانی پێشان دان بێت. خودا لەو کەسانە خۆشبێت، کە بەبێ ئەوەی داوای مۆڵەت بکەن پەنجەیان لە کارەکانییەوە ژندووە و گۆڕیویانە. بەڵام لە کاتێکدا «سیمۆن دی بۆڤوار» و دەزگای «لێی دۆ مۆدێغنا» —واتە زەمەنی سەردەم– کە دەزگایەکی فەرەنسییە، دەیانەوێت تەنها نیوەی یەکەمی «سویت» Suite بڵاوبکەنەوە، بێکێت نائومێد و بێزار دەبێت؛ جارێکی تر بە تەواوی تووڕە و شێتگیر دەبێت، کە دەزگایەک بەبێ مۆڵەتی ئەو گۆڕانکارییان لە تێکستەکەیدا کردووە. بێکێت دەیەوێت ئەو دەزگایە بدات بە دادگا، لەم بارەشدا، هەر دەبێت «لیندۆن» بە هەموو شێوەیەک ئارامی بکاتەوە. ئەم دوو جارە، تەنها ڕووداوێکە، بە لایەنی کەمەوە کە بێکێت لەم ساڵانەدا، بە تەواوی لە نامەکانیدا تووڕە و بێزاری دەردەبڕێت، گەرنا لە زۆربەی نامەکاندا، وەکوو کەسێکی نەرم و ڕەشبین دەردەکەوێت. دەبێت مرۆڤ هیچ چاوەڕوانییەکی سەبارەت بەم نامانە نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا تووشی نائومێدی دەبین، لە کاتێکدا «ڕوبێرت پینییەت» کە نووسەرێکی هاوڕێ و هاوکاری بووە، دەیەوێت ڕاوێژی پێ بکات، بێکێت بەم شێوەیە وەڵامی ئەداتەوە: «خۆت بڕیار بدە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانیت، کە هەر چارەسەرێک هەڵبژێریت و هەر بڕیارێک بدەیت، لە کۆتاییدا هەر پەشیمان دەبیتەوە». سەرکەوتن و نەهاتیی لەسەر ئاستی جیهان، بەهیچ جۆرێک کاری لە کەسایەتی بێکێت نەکردووە. ئەوەی ڕاستیش بێت، ئەو زیاتر لە ناو ئەو کەسانەدا هەستی بە ئارامی کردووە، کە تووشی نەهامەتی هاتوون و لە خوارەوەی هەرەم و ئاستەکانی کۆمەڵگادا بوون؛ سەرکەوتنەکانی «بەدەم چاوەڕوانی گۆدۆ» وەش، بەڕای ئەو تەنها ڕەوشێکی هەڵە و بە هەڵە حاڵی بوونە. یەکێک لە هاوڕێکانی پێی دەڵێت «تۆ هەرگیز وشەیەکی خۆش و باشت نییە، کە بە کەسانی تری بڵێیت، جگە لەوانە نەبێت کە کەسانی سەرکەوتوونین.»

ڕەنگە خوێندنەوەی نامەکانی نووسەرێک، جێگای بیۆگرافیاکەیمان بۆ نەگرێتەوە، بەڵام ئەو نامانە هەستێکی بەهێزی ئامادەبوونمان پێ دەبەخشن، کە زۆر کەم یان ستەمە، بیۆگرافیاکان بتوانێت ئەو بەرئەنجامە بەدەست بهێنێت. ئێمە نامەکان بە دزی بێکێتەوە، تا ڕادەیەک لە زەمەنی ڕاستەقینەی خۆیاندا دەخوێنینەوە، بەم شێوەیەش مرۆڤ ڕاستەوخۆ دەچێتە ژیانی بێکێتەوە، کە هەرگیز ئەو بوارەمان بۆ نارەخسێت.

وەک لەوەوبەر گووتمان بێکێت هەموو چاوەڕونییەکانی دونیای دەرەوە کپ دەکـات و دەیەوێت بەوپەڕی تواناوە، دونیای دەرەوە بە ڕووی خۆیدا، بەبێ ئەوەی بە تەواوی دوور بکەوێتەوە لە هەندێک لە پەیوەندییە نزیکە کۆمەڵایەتییەکانییەوە دابخات؛ هەر لەم ڕووەوە بەم شێوەیە باسی خۆی دەکات: «زۆر ماندوو، گێل، پیس، پیر و بێ ویست.» جار لە دوای جار، لە کۆتایی ئەم قۆناخەی، کە نامەکانی دەگرێتەخۆ ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە ئەو بۆ چەندین ساڵە هیچ شتێکی نەنووسیووە، بیریش لـەوە دەکـاتـەوە، کە نازانێت ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرلەنوێ توانای نووسینی دەبێت. کە ئەو دەنووسێت، بۆ ئەوە نییە مەبەستی شتێک بووە: «مەبەست لەو وشانەیە، کە ئەرکی سەرەکییان گەیاندنی مانایەک نییە، بەڵکو– بەد هیواخوازم– شەڕ کردنێکی بێ ئاکامە دژی ئەو بێ دەنگییە.»

لە کار و بەرهەمەکانی بێکێت دا، هیچ جۆرە هێماگەلییەک نییە؛ ئەو ئەوە دەڵێت کە مەبەستییەتی، نە زیاد و نە کەم. <١٢> ئەو کورتبینییەی، کە بۆ توانای زمانەکەی و ئێستاتیکا خەڵوەتگەرانەکەی هەیەتی، یەکێکن لەو هۆکارانەی کە ئەو بە هیچ شێوەیەک مل بۆ ئاوازدانان

و ئاوازاندنی دراماکانی نەدا. بێکێت بۆ چەندین جار گوزارشتی لەوە کردووە، کە ئەو بە هەموو شێوەیەک دوورەپەرێزە لە هەموو جۆرە هەوڵێکی تێکەڵاوکردن یان پێکەوە بەستنی هونەرە جۆراوجۆرەکان. بۆ ئەو دراما تەنها و تەنها وشە و کردارە. جارێکیان بێکێت، کە بە ڕادیۆ گوێی لە «ئەندرۆماک»ی ڕاسین دەبێت، دەڵێت تەنها وشەیە، بەڵام چ وشەیەک! دەکرێت بەم شێوەیەش، لەسەر ئاستێکی بەرز ئاماژە بۆ تێکستەکانی بێکێت خۆشی بکرێت، زۆرجار بۆ ئەوەی چەمکێک بەکاربهێنین، کە زۆر کەم پابەندە بە بەرهەمەکانییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بێ کۆتا و تا ئاستێکی باڵا جوانە. ئەمە بەشێک لە نامەکانیشی دەگرێتەوە، کە لە فۆرمێکی سادەی پەیڤی ڕۆژانەوە، سەبارەت بە کاروباری ژیانی ڕۆژانەوە، دەپەڕێتەوە بۆ سەر جۆرێک لە ئاخاوتنێکی فرە نایابی، فرە مانای مینیماڵی. بەشێکی گرینگی نامەکان سەبارەت بە نمایشە جۆراوجۆرەکانی شانۆنامەی «بەدەم چاوەڕوانیی گۆدۆ» و چۆنییەتی دابەش کردنی ڕۆڵەکانییەتی، هەروەها لە هەندێک لە نامەکاندا باسی پلانی نەمایشەکەی «باستەر کیتین» و «مارلۆن براندۆ» دەکرێت کە لە نیویۆرک دەبوایە نمایش بکرایە، بەڵام ناگەنە هیچ ئەنجامێک و نمایشەکەش پێشکەش ناکرێت. لە لەندەنیش هەمان چارەنووس ڕووبەڕووی پلانەکانی «ئاڵێک گینیس»یش دەبێتەوە، بەڵام لە نێو ئەم نامانەدا باسی نمایشێکی ئەڵمانی «بەدەم چاوەڕوانیی گۆدۆ»وە دەکات، کە لە یەکێک لە بەندیخانەکاندا و لەلایەن بەندەکانەوە بینراوە، دڵ خۆشییەکی ئێجگار گەورە بە بێکێت دەبەخشێت.<١٣> لەم نمایشەدا ئەکتەرە گەورە و بە نازەکان ڕۆڵی پۆزۆ و لەکی و ئێستراگۆن و ڤلادیمیر نابینن، بەڵکو لە زۆر ڕووەوە، بە تایبەتی ئەو کەسانە ڕۆڵەکانییان بینییووە، کە خەڵکانی خواری خوارەوەی کۆمەڵگا و کەسە پەراوێزخراوەکان بوون، کە بێکێت بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە خۆی لە واندا بینییەوەتەوە. هەروەها بێکێت نەمایشێکی تر لە نیۆیۆرک زۆر سەرنجی ڕادەکێشێت، کە هەموو ڕۆڵەکان لەلایەن ئەکتەری ڕەش پێستەوە بینراون: «پیاوی گەورەی ڕەش... تەماشاکەن (لەکی)یەکی دوو مەتر و دوانزە سانتیمەتری!»

زۆر بڵێییەک لە نامەکاندا هەیە، بە تایبەتی کە باس دێتە سەر گفتوگۆی یەکەم هەنگاو و یەکەم نەمایشەکانی «گۆدۆ» لە سەر شانۆکانی جیهان. لەلایەکی ترەوە ئەم زیادە ڕۆییە ئەو هەستە بە خوێنەران دەبەخشێت، کە ئامادەی خوڵقاندنی مێژووی شانۆ-و ئەدەب بین.<١٤>

بێکێت لەگەڵ «سوزان دیشوڤۆ دومینیل» دەژیا، کە لە هەفتاکاندا، لە کاتە سەختەکانی ژیانی دا بە کاری بەرگ درویی یارمەتی بژێویی ژیانی دەدا، کە بێکێت چەند ساڵێک دوای بەرگی دووەمی نامەکان، بە تەواوی هاوسەرگیری لەگەڵ دا دەکات. هەروەها ئەم ئافرەتە هەمیشە لە بەرەکانی پێشەوەی ئەو جەنگەدا بووە، کە بێکێت ڕەزامەندی بۆ هیچ جۆرە چاوپێکەوتنێک دەرنەبڕیووە. دواتر «سوزان دیشوڤۆ دومینیل» پاداشتی نۆبڵی ئەدەبی، کە بێکێت لە ساڵی ١٩٦٩دا وەری گرت، بە «کارەسات» ناوزەد دەکات، چونکە ئەو پاداشتە بێکێت-ی کردە کەسێکی ناودار و جۆرە فەرمییەکی جیهانی پێ بەخشی، ڕۆڵێک کە بێکێت بە هەموو توانایەکییەوە ڕەتی دەکردەوە و هەرگیز ئامادە نەبوو ئەو ڕۆڵە ببینێت.<١٥>

هەروەها هەر لەم ساڵانەدا، کە هێشتا ناو و ناوبانگە گەورەکەی بە تەواوی ئەوی بێزار نەکردبوو، بەوپەڕی تواناوە خۆی لە چاوی میدیا و ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان دەشاریتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش خانوویەکی بچوک و ساکار، چەند میلێک لە دەرەوەی پاریس بە کرێ دەگرێت. لە «قوڕاوی کەنار ڕووباری مارن»دا، کە لەوێ هەموو کاتەکانی خۆی بۆ کێڵانی زەوی و چاڵ هەڵکەنن تەرخان کردبوو، بە درێژایی ڕۆژ و بەوپەڕی

خۆشحاڵییەوە، لەبری ئەوەی باسی پرۆسە و دەقە شانۆییەکانی بکات، کە ڕۆژ بە ڕۆژ ناوبانگیان بە هەموو جیهاندا بڵاودەبووەوە، باسی ئەو چاڵانە دەکات کە هەڵی کەندوون و باسی ئەو زەویانە دەکات کە کێڵاونی.<١٦>

بێکێت لە نامەیەکی دا بۆ هونەرمەند «برام فان فیلْدا» بە تایبەتی کە زۆر ستایشتی کارەکانی ئەوی کردووە، دەڵێت: «من بە دوای ڕێگایەکدا دەگەڕێم تا کۆڵ بدەم، بەبێ ئەوەی بە تەواوی بێ دەنگ بم.» لەوانەیە ئەمە گوزارشتێکی تەواو بێت لە پرۆژە ئەدەبییەکەی بێکێت.<١٧>

گەر مرۆڤ نەیزانیبایە بێکێت بەردەوامە لە نووسیندا، بە تایبەتی لەو فۆرمە چڕ و کورت و داماڵراوەدا، ئەوە لەو برِوایەدا دەبووین، کە هەر لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا کۆتایی بە کاری نووسین هاتبوو، بێکێت هەر لەم ڕۆژگارانەدا، سەبارەت بە خۆی گوتوویەتی: «هیلاکییەکی زۆر و پێویستی بە تاریکی و تەختە نووستنێکی باریک و هێدی هێدی دەست بەردار بوونی هەموو شتێک.» یان تاکە ئاواتی ئەوەیە لە دەرەوە خۆی بخاتە ناو قوڕوچڵپاوەکانەوە و ڕوو لە مانگ بلوورێنێت.

هەندێک جار هەر لە فیگورێکی بەرجەستەکراوی ناو ڕۆمانێک دەچێت. «وات» و «مۆرفی» دەکرێت زۆر بە ئاسانی، شتێک لەم ستایلە بڵێن: «من بەشێوەیەکی ترسناک ماندوو و سڕم، بەڵام هێشتا بە تەواوی ماندوو و سڕ نەبووم. نووسین شتێکی هەر زۆر نەشیاوە، بەڵام هێشتا هێندە نەشیاو نییە.» مرۆڤ لێرەدا تا ئاستێکی باڵا، هەست بە دوا وشەکانی لە «ئەوەی ناو نانرێت» دەکات: «من ناتوانم بەردەوام بم، من بەردەوام دەبم.»

لەوانەیە هەندێک کەس وا بیر بکەنەوە، کە خوێندنەوەی ئەم نامانە هەست و سۆزێکی پڕ لە دڵە ڕاوکێ و ڕەش بینی دروست دەکات، هیچ شتێک هێندەی ئەم بیر و بۆچوونە هەڵە نییە، لەلای بێکێت جۆرە مەودا و دوورە پەرێزییەک و جۆرە تیژبینی و هۆشمەندییەک هەیە، کە ئاسوودەیی دەبەخشێت و ئارام گیرە. ئەدەبێکی گەورە و مەزن هەرگیز دڵ پەشێو و خەمگین نییە، با چەندە ڕەش بینیش بێت.

شتێکی ئاشکرایە بێکێت جیهان وەکوو جۆرە گەمەی مەیموون-ێک دەبینێت، کە بەبێ ویستی خۆی ناچار دەکرێت بەشداری تیا بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە هەموو ئەو کەسە داماو و بێ ویستانە دەکات و بەرگریشیان لێ دەکات، کە ناچار دەکرێن بەشداری بکەن، هەر وەک بەزەیی بەو کرمانەشدا دێتەوە، کە لە کاتی چاڵ هەڵکەندندا، بە هەموو شێوەیەک هەوڵ ئەدات ئازاریان پێ نەگەیەنێت. بێکێت ئازار و پەژارەکانی مرۆڤی ئەدی.

لە ڕوانگەی ئەو تێ گەیشتنەیەوە، هەر لە ساڵی ١٩٤٩ دا، چل ساڵ بەر لە مردنی، بەرجەستەی پرۆژە موراڵی و ئێستاتیکییەکەی خۆی کردووە: «من چیتر مل بۆ هیچ کردارێک نادەم، کردارێک نەبێت بەتاڵ لە هیوا و قابیل بە لەعنەتی خۆی.»

### سەرچاوە:


SvD, Understrecket. Becketts brev offentliggor ensligt skapande av Carl Rudbeck. 2012


پەراوێزەکانی وەرگێڕ

١- سامۆێیل بێکێت لە ساڵی ١٩٠٦ لە دایک بووە، خێزانەکەی دەوڵەمەند و ناسراو بوون و ژیانییان لە ناوچەی «فۆکس ڕۆک» لە دەرەوەی شاری دبلن بەسەر بردووە، خانەوادەکەی، چ دایکی و چ باوکی سەر بە بنەماڵەیەکی ئێرلەندی پرۆتستانتی بوون. بێکێت لە باشترین قوتابخانە و زانکۆکانی ئەوکاتەی دبلن خوێندوویەتی، لە ساڵی ١٩٢٦دا بۆ یەکمجار لە ڕێگای زانکۆکەیانەوە سەردانی پاریس دەکات. بێکێت

لە زانکۆی ترینیتی لە دبلن، گرینگییەکی زۆر بە زمانە مۆدێرنەکان ئەدات و هەر لەم زانکۆیەدا زمانی فەڕەنسی و ئیتاڵی خوێندووە. بێکێت لەسەرەتای تەمەنیدا نووسینەکانی (دانتی) کاریگەری زۆری تێ دەکەن، دواتر ئەو کاریگەرییە لە هەموو نووسینەکانیدا، بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕەنگ ئەدەنەوە. بێکێت بە نۆڤێلت، شیعر، لێکۆڵینەوەی ڕەخنەی ئەدەبی و دواتر بە ڕۆمان دەستی کردووە بە نووسین، هەرچەندە ڕۆمانەکانی گەلێک گرینگن و جێگای سەرنج و تێڕوانینن، بەڵام بێکێت زیاتر بە شانۆنامەکانی ناوبانگی جیهانی بە دەست دەهێنێت.

٢- لویسای کچی جێمس جۆیس هونەرمەندێکی بەهرەمەند و بەسەلیقە بووە، زۆر نزیک بووە لە ڕۆحی باوکییەوە و جۆیس بەها و خۆشەویستییەکی تایبەتمەندی پێ بەخشیوە. بەڵام لویسا تەوازنی هەست و مێشک لەدەست ئەدات و تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە نەخۆشخانەی دەروونی دەمێنێتەوە. ئەم بار و ڕەوشەی لویسا جێمس جۆیسی توشی پەژارە و بارێکی خراپی دەروونی کردووە.

٣- بەرگی یەکەمی نامەکانی بێکێت، ئەو نامانە دەگرێتەخۆ کە لە نێوان ساڵانی ١٩٤١-١٩٥٦دا نووسیونی.

٤- مەبەست لەم پێشبڕکێییە «شەڕە بۆکسێنە» کە بێکێت زۆر ئارەزووی لێ بووە. بێکێت حەزێکی زۆری بۆ یاری هەبووە و خۆی لە مەلەکردن، بۆکسێن و تێنسدا گەلێک بەتوانا بووە، ئەم بەهرەیەشی لە فرانکی برا گەورەی و باوکییەوە بۆ ماوەتەوە.

٥- کە جەنگی دووەمی جیهانی هەڵ دەگیرسێت، بێکێت و سوزان لە دبلن دەبن، بێکێت ڕاستەوخۆ بڕیاری گەڕانەوە بۆ فەڕەنسا ئەدات، دوای ئەویش بە چەند ڕۆژێک سوزانیش دەگەڕێتەوە بۆ پاریس. بێکێت لەم ڕووەوە وتویەتی (فەڕەنسام لە کاتی جەنگدا زۆر لەلا خۆشترە وەک لە ئێرلەندا لە کاتی ئاشتیدا.) دوای کەوتنی پاریس، بێکێت تێکەڵاوی هێزێکی بەرهەڵست کار دەبێت و دژی سوپای نازی کاردەکات. بێکێت لەو جەنگەدا ڕۆڵی کۆکردنەوەی زانیاری دەگێڕێت، دەزگایەکی زانیاری کۆکردنەوەش دەکاتە بنکەی چالاکییەکانی خۆی. بۆ ئەم مەبەستە زۆر بە ووریایی میکرۆفیلم، بەڵگەنامە و دۆکیومێنت دەربارەی چالاکی و جووڵانەوەکانی هێزەکانی ئەڵمانیا، ڕەوانەی بەریتانیا و شوێنە باوەڕپێکراوەکانی تر دەکات. بێکێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانە زۆر جار ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە، بەڵام سوور دەبێت لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارانە. لە ساڵی ١٩٤٢ دا کە شانەکەیان ئاشکرا دەبێت، بێکێت و سوزان ناچار دەبن ڕابکەن و خۆیان بگەیەننە ناوچە ئازادکراوەکانی فەڕەنسا و بۆ ماوەی دوو ساڵ بەنهێنی لە گوندە دوورە دەستەکانی ئەم وڵاتەدا ژیان دەبەنە سەر. بێکێت هەر لەم قۆناخەی ژیانیدا دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی وات Watt، دوای جەنگیش دەگەڕێنەوە بۆ پاریس و حکومەتی فەڕەنسیش خەڵاتی جەنگ و مێدالیای ئازایەتی پێ دەبەخشێت. بێکێت دواتر ئەم قۆناخەی ژیانی دەشارێتەوە و هێندە بە گرینگییەوە باسی ناکات و پۆزی پێوە لێ نادات.

٦- بێکێت هەر لەسەرەتاوە بڕیاری داوە کە ببێتە نووسەر، بۆ ئەم مەبەستە هەموو ڕێگاکان تاقی دەکاتەوە، بۆ نموونە بەر لەوەی ئێرلەندە بەجێ بێڵێت کۆمەڵێک بابەتی سەنجڕاکێش دەنووسێت: باسێک دەربارەی جێمس جۆیس، شیعرێکی فەلسەفی سەبارەت بە دیکارت و بابەتێکی ڕەخنەی ئەدەبی بۆ ڕاڤەکردنی بەرهەمەکانی ڕۆمان نووسی گەورەی فەڕەنسی مارسێل پرۆست. دەبێتە مامۆستا لە زانکۆی ترینیتی، بەڵام هەر دوای ماوەیەکی کورت واز لەم زانکۆ گرینگە دەهێنێت و لەبری ئەوە گەشتێک بە ئەورووپادا دەکات و دواتر بە تەواوی لە پاریس جێگیر دەبێت. بێکێت لە پاریس تێکەڵاوی چینێکی بەرزی ڕۆشنبیر و نووسەرەکانی ئەوکاتەی پاریس دەبێت و ئەم ڕۆشنبیرانەش بەتایبەتی

ڕۆمانی «مۆرفی» سەرنجیان ڕادەکێشیت. ڕۆمانی «مۆرفی» ئەتمۆسفێری کۆمیدیایەکی شێتانەی ڕەشی لەخۆگرتووە، مۆرفی کە پاڵەوانی ڕۆمانەکەیە هەوڵ ئەدات لە پەیوەندییە خۆشەویستییەکانیدا دونیای ناوەوە و دەرەوەی خۆی ڕێک بخات، بەڵام مۆرفی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ژیانی واقیعی و خودی خۆی نییە، تا لەئەنجامدا لە یەکێک لە شێتخانەکاندا دەگێرسێتەوە و ژیانی لۆژیکی خۆی لە دەست ئەدات.

٧- بێکێت توانی بە شانۆنامەی «بەدەم چاوەڕوانیی گۆدۆ»وە ڕێچکە باوەکە بشکێنێت و فۆرمێکی نوێ و زمانێکی جیاواز بۆ هونەری شانۆ دابهێنێت. شانۆنامەکە هەر لەیەکەم نمایشەوە دەبێتە هێماگەلی دەستپێکی نوێ بۆ شانۆی فەرەنسی، شانۆی جیهانی و تەوژمی شانۆی ئەبسورد. بێکێت لەم شانۆنامەیەدا هەر لە سەرەتاوە لە هەموو سەرچاوەکانی شانۆی تەقلیدی دوور دەکەوێتەوە، زمانێکی تایبەت و ئەتمۆسفێرێکی جیاواز بۆ شانۆ دەخوڵقێنێت. لە «کۆتایی گەمە» دا کارەکتەرەکان چیرۆک و یادەوەرییەکانی خۆیان دەگێڕنەوە و بیر لە هەندێک شت دەکەنەوە، تەنها بۆ ئـەوەی دەسەڵاتیان بەسەر بوونی خۆیان و دەوروبەرەکەیاندا بشکێت. هەندێک لە کارەکتەرەکانی ئەم دەقە لە ناو تەنەکەی خۆڵدا خۆیان دەشارنەوە. کـارەکـتـەرە سەرەکییەکەی شانۆنامەی «ڕۆژە بەختیارەکان»یش لەبەشی یەکەمدا تا ناو قەدی و لە بەشی دووەمیشدا هەموو جەستەی لەناو لمدا دەنێژرێت.

٨- بێکێت لە ساڵی ١٩٥١دا ڕۆمانی «مۆلۆی» دەنـووسـێـت، لە هەمان ساڵدا ڕۆمـانـی «مالۆن دەمرێت» دەنووسێت و لە ساڵی ١٩٥٣شدا ڕۆمانی «ئەوەی ناو نانرێت» بڵاودەکاتەوە. ئەو سێ ڕۆمانە پێکەوە سێینەیەکیان پێک هێناوە و یەکتری تەواو دەکەن، پسپۆڕ و ڕەخنەگرەکانیش ڕۆمانی مۆلۆی بە سەرکەوتووترین بەرهەمەکانی بێکێت دادەنێن. ڕۆمانەکە بریتییە لە دوو بەش، لە بەشی یەکەمدا مۆلۆی دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکی، هەرچەندە دوو قاچی پتەو و بەهێزی هەیە، بەڵام ناتوانێت پاسکیلەکەی بئاژوێ و لە ئەنجامدا ناچار دەبێت لەسەر سک بەرەو چاڵێک بخشێت. لەبەشی دووەمدا، مۆران دەگەڕێت بەدوای مۆلۆیدا، مۆران لە ڕێگادا ڕووت دەکرێتەوە و هەرچییەکی هەیە لە دەستی ئەدات و هەرگیز مۆلۆیش نادۆزێتەوە. لە دوا وێستگەکانی ڕۆمانەکەدا مۆران گۆڕانگاری بەسەردا دێت و وەک مۆلۆی لێ دێت.

٩- خۆرخێ لویس بۆرخێس نووسەرێکی گـەورەی ئەمەریکای لاتینە، لە ئەرجەنتین لە دایک بووە و لە سویسرا کۆچی کـردووە. ئەم نووسەرە کاریگەرییەکی ئێجگار گـەورەی بەسەر ئەدەبی جیهانییەوە هەیە و بەرهەمەکانی وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی دونیا.

١٠- دەتوانین بڵێین کە بێکێت سەر بە دوو کلتووری جیاواز بووە؛ ئینگلیزی و فەرەنسی، زمانی هەردوو کلتوورەکەشی باش زانیووە. ئینگلیزی کە زمانی دایکی بووە، لە دبلن و قوتابخانەکانی ئەو وڵاتەدا زمانێکی ستانداری ئەدەبی بەرز فێردەبێت. ورپایی لە زمان و خوێندنەوە بەردەوامەکانی، زمانە ئەدەبییە ئینگلیزییەکەی دەگەیەنێتە ئاستێکی بەرز و سەرەتای نووسینەکانیشی هـەر بـەم زمانە دەبـێـت. بەڵام زمانی فەرەنسی سەربەستییەکی تر و دەروازەیەکی جیاوازتری پێ دەبەخشێت، دەرگاکانی فەرەنسا و شاری پاریسیان بۆ دەکاتەوە؛ زمانی فەرەنسی بۆ بێکێت دەبێتە زمانی عەشق و داهێنان. کە هێدی هێدی لە زمانی ئینگلیزییش دوور دەکەوێتەوە، زمانی فەرەنسی دەبێتە زمانی یەکەمی، بەڵام بێکێت بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی هەردوو زمانەکە بە باشی بەکاردەهێنێت، بۆ نموونە هەر خۆی و زۆر بە سەلیقەوە بەرهەمەکانی لە فەرەنسییەوە وەردەگێڕێتە سەر

ئینگلیزی و لە ئینگلیزیشەوە بۆ سەر زمانی فەڕەنسی. ئەم زمان زانیینە و گەمەکردنە لە نێوان ئەم دوو زمانە گەورەیەدا، بەرهەمەکانی گەلێک دەوڵەمەند کردووەو ئاسۆی بیر و بۆچوونەکانیشی فراوانتر کردووە.

١١- بێکێت و فرانکی برای لە ئێرلەندە پێکەوە زۆر بە ئاسودەیی ژیاون و هەمیشە خەریکی یاریکردن بوون. فرانک بێکێت لە ساڵی ١٩٥٤دا دەمرێت و بەم شێوەیەش بێکێت هەموو پەیوەندییەکانی بە ئێرلەندەوە بە تەواوی دەپچڕێنێت.

١٢- ڕیژیسۆری بەریتانی پیتەر بروک، کە کاریگەرییەکانی بێکێت-ی بەسەرەوەیەو چ لە ڕووی تەکنیک و چ لە ڕووی خستنە سەر شانۆی دەقەکانی، کاری لەگەڵ دونیای بێکێت کردووە، سەبارەت بە هێماگەلی بێکێت دەڵێت «بێکێت دەتوانێت وێنەیەک پێشکەش بکات، کە سەر بە تەختەی شانۆیە، هەروەها پەیوەندی و ئامرازەکانیش؛ هەمووی لە ئەزموونێکی چڕی تیژەوە سەرچاوە وەردەگرێت، لە بریسکەیەکدا کە ژیانی تێدایە، بەڵام خۆی ئاشکرا ناکات. هێماگەلی بێکێت بەهێزە لەبەر ئەوەی ناتوانین بیانگرین، زۆر دوورە لەوەی کە تەنها کۆمەڵێ جیهانی لێک چووی وەک کتێبی قوتابخانەکان یان نەخشە و وێنە دیاریکراوەکان بێت، بەڵکو شانۆنامەکانی زۆر بە ئاسانی ئەفراندنی ئەدەبییە.

١٣-لە سویدیش بە چاودێری و ڕەزامەندی بێکێت، هونەرمەند (یان یۆنسۆن) لە بەندیخانەکاندا کاری لە سەرشانۆنامەی «بە دەم چاوەڕوانیی گۆدۆ»وە کردووە. لەو نەمایشەدا تێکرای ڕۆڵەکان لەلایەن بەندەکانەوە بینراون، دوای نەمایشەکەش هەموو هەڵدێن. ئەم ڕووداوە بێکێت گەلێک خۆشحاڵ دەکات. یان یۆنسۆن سەرلەنوێ لە ئەمەریکا و لە بەندیخانەکانی ئەو وڵاتەدا، لە ژێر چاودێرییەکی توندوتیژدا، لەگەڵ بەندەکان «بە دەم چاوەڕوانیی گۆدۆ»وە نەمایش دەکات. بۆ زیاتر شارەزابوون لە وردەکارییەکانی ئەم ئەزموونە سویدیە بڕوانە کتێبی «شانۆی سویدی» بە تایبەتی «هەندێک لە ساتەوەختەکانی واقیع» لە نووسینی دانا ڕەووف.

١٤- شانۆنامەی «بە دەم چاوەڕوانیی گۆدۆ»وە باسی دوو کەس، ڤلادیمیر و ئێستراگۆن دەکات. ئەم دوو کەسە بە دەم چاوەڕوانی کەسێکەوە کە ناوی (گۆدۆ) یە دالـدەی یەکتر ئەدەن و وتووێژەکانیان لە نێوان هەڵوێستەی کۆمێدی، بێ ئومێدی، هیوا و بێ هیواییدا دەسوڕێتەوە. گۆدۆ پێی ڕاگەیاندوون کە دێت، بەڵام هەرگیز دەرناکەوێت. هەر لەم سەرەڕێگای چاوەڕوانییەدا لەکی و پۆزۆ دەبینن، لە کۆتایی بەشەکانیشدا منداڵێک دێت و پێیان ڕادەگەیەنێت، کە گۆدۆ ئەمڕۆ نایەت، بەڵام بە دڵنیاییەوە سبەی دێت. لەسەر شانۆکەش تەنها درەختێکی وشکی بێ گەڵا هەیە، بەڵام لەبەشی دووەمدا ئەم درەختە وشکە گەڵای کردووە. بێکیت دووپاتی ئەوەی کردۆتەوە، کە مەبەستی لە گەڵاکردنی درەختەکە هیچ جۆرە هیوایەک نییە و تەنها مەبەست لەوەیە کە زەمەن تێ پەڕیوە.

١٥-بێکێت ئامادە نەبوو ئەو پاداشتە گەورە جیهانییە وەربگرێت، ئامادەش نەبوو سەردانی سوید بکات و بە نامەیەک بە ئەکادیمیای سویدی رادەگەیەنێت، کە پارەی پاداشتەکە بدەن بە هەژارەکانی دونیا.

١٦- «لە قوڕاوی کەنار ڕووباری مارن»دا ئەو تێکستەیە، کە بێکێت لەو خانووە بچوکەی دەرەوەی پاریس نووسیویەتی.

١٧-بـرام فـان فیلْدا ١٨٩٥-١٩٨١ هونەرمەندێکی وێنەکێشی بەناوبانگی هۆڵەندییە، لە ساڵی ١٩٢٥ وە لە پاریس ژیاوە، لە ساڵی ١٩٦٥دا چووەتە سویسرا و تا کۆچی دوایی دەکات لەوێی دەژی. تابلۆکانی ستایلێکی ئێکسپرێشنیزم، ئەبستراک و ئێکسنتیالیزمی لەخۆگرتووە.

# گفتوگۆ

# بەرپرسیارێتی مەدەنی

## گفتوگۆیەکی هەڵبژاردە لەگەڵ مایکڵ والزەردا

سازدانی: رامین جەهانبەگلو

وەرگێڕانی: کارزان محەمەد

(مایکڵ واڵــزەر)ی توێژەری ئەمریکی لە بواری فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵگای مـەدەنـی کە (رامین جەهانبەگلو) ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا ئەنجام داوە، هەنوکە ئەندامی لیژنەی زانستی قوتابخانەی سۆسیۆلۆجیای (دامەزراوەی توێژینەوە پێشکەوتووەکان)ە لە زانکۆی پرینستۆن. گرنگترین بەرتوکەکانی بریتین لـە: ئەرکەکان (١٩٧٠)، پلوڕالیسم، دادپەروەری و یەکسانی (١٩٩٥)، بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی جیهانی (١٩٩٥)...هتد هەروەها ناوبراو لە زانکۆکانی هارڤارد و پرینستۆن وانەی وتۆتەوە.

ئەمەش گفتوگۆیەکی هەڵبژاردەیە لەگەڵ ناوبراودا کە لەلایەن (رامین جەهانبەگلو)ەوە سازدراوە.

***

## * بۆ دەستپێکی گفتوگۆ، دەمەوێ سەبارەت بە کۆمەڵێ پرسیار لەبارەی قۆناغە جیاوازەکانی ژیان و ئەزمونت و ئەو هزرانە دەست پێ بکەم کە کاریگەری لەسەر بیروباوەڕت هەبووە، چۆن و لە چ ڕوویەکەوە ئینتیمات بۆ تیۆری سیاسی پەیدا کرد؟ کام لە قوتابخانە هزرییەکانی ئێستا، تۆی بەرەولای خۆی ڕاکێش کرد؟

–بەرلەوەی خولیای تیۆری سیاسی ببم، ئینتیمام بۆ خودی سیاسەت پەیدا کرد، هەنوکەش خولیای سەرەکیم بۆ خودی سیاسەتە. سیاسەت بەشێ لە گفتوگۆ ڕۆژانەییەکانی خێزانەکەمان بوو، هەر لە ساڵانی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییەوە، تێکەڵاوی چالاکی سیاسی بووم. سەرەتا لە جوڵانەوەی مافە مەدەنییەکان لە ساڵانی هەردوو دەیەی (١٩٥٠ و ١٩٦٠) و لەسەروەختی جوڵانەوەی دژ بە جەنگدا. ئەگەرچی بە درێژایی ماوەی خوێندنم، وەستانێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی، بـەڵام هەندێکجار لەم قـۆنـاغـانـەدا، لـە خوێندن و لێکۆڵینەوە دوور دەکەوتمەوە و ڕووم لە کاری سیاسی دەکرد.

لە دەیەی (١٩٦٠)دا نزیکەی ساڵێک لە جوڵانەوەی مافەمەدەنییەکان و ماوەی ساڵێکیش لە جوڵانەوەی دژەجەنگدا چالاکیم دەنواند. لە ڕوانگەی منەوە، ئەو ئەزموونەی لە چالاکییە مەیدانییەکانی سیاسەتدا فێری بووم، چەند پلەیەک لەو مەسەلانە گرنگترە کە لەو بـوارەدا خوێندوومە و شرۆڤەم کـردووە. ئەگەرچی ئەم ئەزموونە لەو مەسەلانە دوور بوو کە لە چەقی ئاڵوگۆڕی سیاسی ئەمریکادا ڕووی دەدا، واتا لە ڕاستیدا لە پەراوێزی باڵی چەپەکانی ئەوێدا بوو، وەلـێ دەرفەتی بۆ ڕەخساندم تا وێنایەک لە چەندایەتی و چۆنایەتی سیاسەتی بزووتنەوەکان بەدەست بهێنم، ئەم ئەزموونە تائێستاش ڕۆڵێکی نەمری لەسەر شێوازی بیرکردنەوەم هەیە.

وێڕای ئەمانەش، لەهەمان قۆناغەکانی سەرەتای کاردا، دەستم بە نووسین بۆ گۆڤاری (دیسنت) کرد. (ئیرڤینگ هاو) و (لویس کۆزەر) کە بە دامەزرێنەرانی ئەم گۆڤارە دەژمێردران، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر جێهێشتم. (کـۆزەر) سەربە چەپە سەربەخۆکانی دژ بە ستالینیزم و (هاو)یش لە سەرەتاوە سەربە یەکێک لە گروپە ترۆتسکییەکان بوو، بەڵام کاتێ لەگەڵیدا ئاشنا بووم کە جیهان بەشێوەیەکی گشتی ئەم گروپەی پەراوێز خستبوو.

هاریکاریی لەگەڵ گۆڤاری (دیسنت)دا، ئەزموونێکی زۆر بە نرخ و پڕ ئەزموون بوو کە فێری نوسین و پێداچوونەوە لە گۆڤارێکی چەپڕەودا بووم.

## * لەو قۆناغەدا چ بەرهەمێک یاخود چ کۆمەڵە نوسەرێک تۆی خستە ژێرکاریگەرییەوە؟

– بەلای منەوە گرنگترین کتێب، کتێبە فەلسەفی

یاخود کتێبی تیۆرییە سیاسییەکان نەبوو، پتر لەژێر کاریگەری کۆمەڵێ
کتێبدا بووم وەک (مرۆڤی یاخی)ی کامۆ، (نان و شەراب)ی ئیگناسیۆ سیلۆنە، تاریکی لە نیوەڕۆدای ئەرتۆر کۆیستلەر، پەیامەکانی ئۆرێل و کورتە چیرۆکەکانی ئەیزاک بەبیڵ.

## * لە چ ڕەوتێکەوە چوویتە نێو هرزی سیاسییەوە؟

- بەگشتی لێرە حیزبێکی سۆشیالیستی تێدا نەبوو کە خاوەنی بڵاوکراوەیەکی تیۆریی بێ تا پەیوەندی پێوە بکەم. پتر لە ڕێگەی توێژینەوە ئەکادیمییەکانی تیۆرە سیاسییەکانەوە بەم مەسەلەیە ئاشنا بووم. لە ساڵانی دەیەی (١٩٦٠) ژمارەیەکی زۆری ڕووناکبیرانی چەپڕەو چوونە زانکۆکانی ئەمریکا، بەم هۆیەوە بۆ ماوەیەکی کورت، زۆر چالاکی سیاسی لەم زانکۆیانەدا ئەنجام درا. بەهەرحاڵ شوێنێکی دیکەمان بۆ ژیان و چالاکیمان نەبوو.

## * ئایا تۆش لەو ساڵانەدا لەڕووی سیاسییەوە هەڵدەسوڕایت؟

-هەڵبەتە بۆئەوەی بەشێوەیەکی نایاب بچمە نێو ئەم چەپە نوێیەوە، کەمێ پیر ببووم. لە ساڵانی دەیەی (١٩٥٠)دا یەکەمین وتارم بۆ گۆڤاری (دیسنت) نوسی و هۆشیاری سیاسیم پەیدا کرد، بەڵام لە ساڵانی دەیەی (١٩٦٠)دا بەرەو باشوری ئەمریکا ڕۆیشتم، لە ڕێکخستنەوەی بزووتنەوەی پشتیوانی باکور لە خەباتی ڕەشپێستاندا هەڵدەسوڕام کە لەو دەڤەرەدا هاتەئاراوە.

## * ئایا ئەمە هەمان بزووتنەوەکەی مارتین لۆتەر کینگ بۆ بەدەستهێنانی مافە مەدەنییەکان نەبوو؟

- بەڵێ، بەڵام ئەو کەسانەی من زیاتر ئاشنایم لەگەڵیاندا هەبوو (بابەتم دەربارەیان دەنووسی)، ئەو خوێندکارانە بوون کە بۆ نارەزایی دژ بە سیاسەتە جیاکارییەکان، لەو زانکۆیانەدا مانیان دەگرت. ئەم مانگرتنانە لە کانوونی دووەمی (١٩٦٠)ەوە دەستی پێکرد و نیشانە بەراییەکانی جوڵانەوەیەک بوون کە لە ساڵانی دواتر گۆڕا بۆ شەپۆلێکی بەرفرەی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان.

## * کەی تێکەڵاوی چالاکییەکانی دژەجەنگ بوویت؟

- ماوەیەکی زۆر دوای ساڵی (١٩٦٧)، بە وردی لەپێناو خستنەگەڕی (دیموکراسی بەشداریی)دا بۆ نارەزایی دژ بە جەنگ بوو کە لەسەر ئاستی ناوچەکە، تێکەڵاوی خەباتی دژەجەنگ بووم. من یەکێک لە بەڕێوەبەرانی (کۆمیتەی ناوچەیی کامبرێج دەربارەی ڤێتنام) بووم. ڕیفراندۆمێکمان دەربارەی جەنگ بەڕێوەبرد کە ڕووبەڕووی شکست بۆوە، بەڵام وێڕای ئەمەش هەوڵێکی گرنگ بوو بۆ دەربڕینی نارەزایی دژ بەجەنگ کە لە هەندێ شاریتری ئەمریکاشدا ئەنجام درا. هەوڵی ئێمە لەپێناو بزواندنی خەڵک بۆ دەنگدان دژ بە جەنگ بوو، هەرچەندە سەرەنجام تەنها توانیمان نزیکەی (٤٠٪)ی خەڵک ڕەزامەند بکەین.

## * یەکێک لەو کتێبە بەراییانەی لەگەڵ (فیل گرین)دا نوسیوتانە، ناوی (خەیاڵی سیاسی لە ئەدەبیاتدا)یە. بایەخدانت بە ئەدەبیات بە تایبەتی ڕۆڵی خەیاڵی سیاسی لەم مەیدانەدا

بەلای منەوە زۆر سەرنجڕاکێشە، ئایا بەلای تۆوە ئەدەبیات هەمیشە پاڵنەرێکی گرنگی لێکۆڵینەوەی سیاسەت بووە؟

- بێگومان هەمیشە ڕایەڵەیەک لەنێوان ڕووناکبیرانی ئەدەبی و ڕووناکبیرانی سیاسیدا هەبووە. ئەو نوسەرانەی وەک کەسایەتییەکی گرنگ لە فۆرمەڵەبوونی بۆچوون و هزرەکانمدا ناوم هێناون، کۆمەڵێ کەسی وەک (کامۆ، سیلۆنە و کۆستلەر)ن، نەک هەر تەنها چیرۆکنووس بەڵکو سیاسییەکی هەڵسوڕاویش بوون. (ئایروینگ هاو) لە هەمانکاتدا کە سەرنوسەری بڵاوکراوەیەکی سۆشیالیستی بوو، بە ڕەخنەگرێکی ئەدەبیش دەژمێردرا. ئەوان پێیانوایە ڕایەڵەی نێوان ئەدەبیات و سیاسەت بە چەندین پلە جیاوازترە لەوەی کە لەنێوان پۆست مۆدێرنیزمەکاندا دەبینرێت، ئەو پۆست مۆدێرنانەی زۆربەیان ئەمڕۆ لە کۆلیژەکانی ئەدەبیاتی بەراوردکاری و ئەدەبیاتی ئینگلیزیی زانکۆکانی ئەمریکادان. تایبەتمەندییەکانیان پتر جۆرێ لە ڕادیکالیزمێکی ئەکادیمییە، لەکاتێکدا ڕادیکالیزمی (کامۆ، سیلۆنە یاخود ئاینروینگ هاو) بەهیچ جۆرێک ئەکادیمی نییە. ڕادیکالیزمی ئەوان هەم ئەدەبی و هەم سیاسی بوو، وەلێ سیاسەت هەمیشە ئامادەگییەکی بابەتیانەی هەبوو، یاخود لایەنی کەم هەوڵیان دەدا کە سیاسەت ئامادەگییەکی بابەتیانەی هەبێت. منیش ئینتمایەکی لەو چەشنەم هەبوو. وتارە یەکەمینەکانم دەربارەی ئەدەبیاتی سیاسین. بۆنمونە سالانی ناوەڕاستی دەیەی (١٩٦٠) وتارێکم لە گۆڤاری (دیسنت) دەربارەی (لاوانی تورە) نوسی کە ئەدەبی بەرەنگاری ئینگلیزی بوو دژ بە سیستەمی چینایەتی بەریتانیا.

سەرەرای ئەمەش، ڕەخنەیەکی شیکاریم لەسەر بەرهەمێکی (جەی.دی.سالینجەر) نوسی، بەڵام دواجار گەیشتمە ئەم دەرئەنجامەی کە توانستەکانم بوارێکی دیکە دەخوازێ، لەکاتێکدا هێشتا خوێندکار بووم، ڕووم لە تیۆری سیاسی کرد.

*توێژینەوەی دەرچوونت دەربارەی چی بوو؟

-توێژینەوەی دەرچوونم دەربارەی شۆڕشی (پیوریتنەکانی بەریتانیا) نووسی. یەکەمین کتێب کە بڵاوم کردەوە ناوی (شۆڕشی قەدیسین)ە و تەوەرەکەشی دەربارەی (سیاسەتە کالڤینیزمەکان)ە کە پێموایە بە یەکەمین مۆدێلی ڕادیکالیزمی هاوچەرخی ڕۆژئاوا دەژمێردرێت. هەڵبەتە زیاتر حەزم دەکرد دەربارەی شۆڕشی فەرەنسا بنووسم، بەڵام لەو سەروەختەدا زمانە فەرەنسییەکەم باش نەبوو، هەربۆیەشە کارم دەربارەی بەریتانیا کرد.

* لەساڵی (١٩٧١)دا (جۆن ڕاوڵز) تیۆری دادپەروەرییەکەی بڵاوکردەوە، زۆرجار ئەو تیۆرە بە گرنگترین دەقی هزری سیاسی ئەم سەدەیە لە سالانی دوای جەنگ ناودەبرێت. بەگشتی (جۆن راوڵز) وەک کەسایەتییەک ناودەبرێت کە توانی بە خستنەڕووی مەسەلەی (دادپەروەریی سەرتاپاگیر) لەناو چەقی فەلسەفەی لیبرالیزمدا، ئەم فەلسەفەیە وەک فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی، ژیان نۆژەن بکاتەوە. تۆش یەکێکی لەو تیۆریزانە سیاسییانەی کە هەنگاوت بۆ درێژەدان بە ڕێگاکەی هەڵێناوە، تا چ ئەندازەیەک لەژێر کاریگەری جۆن راوڵز و تیۆری دادپەروەرییەکەی ئەودا بوویت؟

- دوای شۆڕشی قەدیسین، دووەمین کتێبم بڵاوم

کردەوە کە ناوی (ئەرکەکان)ە، بریتییە لە زنجیرە وتارێک کە لە گۆڤاری (دیسنت) و هەندێک لە بڵاوکراوە ئەکادیمییەکانی ئەو رۆژگارە بڵاوکراونەتەوە.
لەم وتارانەدا، هەندێک لەو مەسەلانەی لەڕووی سیاسی و فکرییەوە لە دەیەی (١٩٦٠)دا لەئارادابوو، خرایە ژێر باس و لێکۆڵینەوەوە. وەک (نافەرمانی مەدەنی، خۆلادانی هۆشیارانە لە خزمەتی سەربازی، دیموکراسیی ڕاوێژکاری)، ئەمەش ئەو مەسەلانەن کە هەم ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی جیهانی بە ئاستێکی بەرفراوان لەخۆگرتبوو و هەم ئەو بڕیارە تایبەتیانەش کە خەڵک دەبووایە لە ماوەی چالاکی سیاسیی خۆیاندا بیگرنەبەر. (دەستە ئاڵودەکان) کە ناونیشانی یەکەمین زنجیرە وتارمە، هەر لەو بوارەدایە.
من کرۆکی تیۆرییە سیاسییەکانی خۆم لە ئەزموونی ڕۆژانەی ژیانی سیاسییەوە وەرگرتووە. هێندە تێکەڵاوی باسوخواسە باوە ئەکادیمییەکان نەبووم، بەڵام (تیۆری دادپەروەریی ڕاوڵز) لایەنێکی نوێی بەم باسوخواسانە بەخشی، لە ڕاستی دا بە بەرهەمێکی بنچینەیی بۆ هەمووان دادەنرێت.
بۆیەکەمینجار نمونە چاپکراوەکەی درا بەو پۆلانەی کە وانەی تیادا دەوتەوە، لە کەمبرێج خوێندمەوە. لەڕاستیدا پێموانیە هەرگیز ئەو دەقەی دواتر بڵاوکرایەوە لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی بخوێنمەوە، چونکە بەشەکانیم بەرلە چاپکردنی، خوێندۆتەوە.
وێڕای ئەمەش پێموایە کتێبی (فەزاکانی دادپەروەری)ی من، تا ئەندازەیەک گفتوگۆیەک بێت لەگەڵ (جۆن ڕاوڵز) و ڕەنگە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆتریش لەگەڵ (رۆبەرت نوزیک)دا. زۆربەی ئەو مەسەلە تایبەتییانەی لەم کتێبەدا خستوومەتە بەرباس، مەسەلە ڕۆژانەییەکانی ژیان بوون و هەن.
لەو کتێبەدا دەربارەی کاری پۆزەتیف دەدوێم، داکۆکیم لە سیستەمی پشتگیری کۆمەڵایەتی کردووە.
لە ڕاستیدا، یەکێک لە فاکتەرەکانی فۆرمەڵەبوونی بۆچوونەکانم بەوجۆرەی کە خستمەڕوو، ئەوەیە کە پەیمانی پلوڕالیستیانە و هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی ژینگە جیاوازەکان، دەرفەتێکی شیاوی بۆ ڕەخساندم تا تا بەشێوازێکی زۆر ڕوونتر لە جێی باسوخواسی (جۆن ڕاوڵز) بنووسم.

* کەواتە بەمشێوەیە تۆ زیاتر خۆت بە بیرمەندێکی ڕیالیست و ئەزموونگەر دەژمێرێت نەک بیرمەندێکی بواری چەمکە ئەبستراکت و میتافیزیکەکان؟

– من بەشێوەیەکی گشتی لە باسوخواسی ئەبستراکتدا لە یەک تا دوو ڕستە زیاتر ناتوانم ببەمەپێش. لە ڕاستیدا، یەکێک لە خەسڵەتە جیاوازەکانی کتێبەکەم لەگەڵ کتێبی ڕاوڵزدا ئەوەیە کە زەمینەی بنەڕەتی تیۆری دادپەروەرییەکەی ڕاوڵز، پتر لەسەر لێکۆڵینەوە ئابوری و سایکۆلۆژیای گەشە بنیاتنراوە، لەکاتێکدا کتێبی (ژینگەکانی دادپەروەری)ی من، پتر لەسەر لێکۆڵینەوەی مێژوویی و سۆسیۆلۆژییە. ڕاوڵز بەدوای تیۆرە شیاوەکاندا دەگەڕێت و منیش بەدوای نمونە ڕۆشنگەرییەکاندا.

* بەمانایەکی تر، ئایا دەشێ بڵێین کە تۆ لە کتێبی (ژینگەکانی دادپەروەری)دا بە جێگۆڕکێی چەقی تێڕوانینی خۆت لە تیۆرێکی یاساییەوە بۆ تیۆرێک دەربارەی (سامان)، مەودایەکی تەواو جیاوازت لە ڕێبازی ڕاوڵز گرتۆتەبەر؟ بە واتایەکی تر، ئایا دەشێ بڵێین کە تیۆری دادپەروەرییە سەرتاپاگیرەکەی تۆ، کەم تا زۆر لەسەر چۆنییەتی دابەشبوونی (سامان) بنیاتنراوە؟

-بە پلەی یەکەم، ئەو هەوڵانەی بۆ جەخت کردنەوە لەسەر ئەم جۆرە خەسڵەتە جیاوازە ئەنجامم دا، زیاتر لەوەی ئاراستەی لەسەر خودی ڕاوڵز بێت (هەرچەندە لەگەڵا میتۆدەکەیدا کۆمەڵێ ناکۆکیم هەیە) بۆ جیاکردنەوەی خوێندکار و شوێنکەوتووانی ڕاوڵز بوو کە تیۆرەکەی ڕاوڵزیان بەرەو ئاراستەیەک دەبرد ڕەنگە خودی ڕاوڵز بەلایەوە پەسەند نەبێ. هەروەکچۆن بە تێپەڕینی کات زانرا کە بۆچوونی من ڕاست و دروست بووە، چونکە لە ساڵانی دواتردا بینمان کە ڕاوڵز لە خستنەڕوو و شرۆڤەی چەمکە ئەبستراکتە جهانشمولییەکاندا، زیاتر لەگەڵ خستنەڕووی باسی کرۆکە تایبەتەکانی دادپەوەریدا بوو کە پەیوەندییەکی ڕوونی لەگەڵ مەیدانی لیبرالیزمی ئەمریکی یاخود خۆرئاوایی دا هەبوو.

لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین کە من دادپەروەرییەکی سەرتاپاگیرم بە مۆدیلێکی پلورالیستیانە لە بەرنامەدا بوو، واتا بەو مانایەی کە پێویستی بە جۆرێ لە ئاڵوگۆڕ هەبوو. ئاڵوگۆڕێک لەسەر بنەمای ئەو سامانانەی کە پێویستە دابەش بکرێن، یاخود بە واتایەکی وردتر کۆمەڵێ مانای لە ژیانی ئەو پیاو و ژنانەدا هەیە کە سامان و دەرامەت بەرهەم دەهێنن و دابەشیشی دەکەن.

* بەمانایەکی تر، مەبەست تەنها سامانی ماددی نیە، بەڵکو سامانە کلتوری و مەعنەوییەکانی وەک: عەشق، مافی ئینتما، ڕێز لەخۆگرتنیش لەخۆدەگرێت؟

-بەڵێ، سەرجەم ئەم سامانانە جێگەی مەبەستن. بەلای منەوە خودی ئەم بەرفراوانییەی سامان زۆر جێگەی بایەخە. من نەمدەویست تەنها جەخت لەسەر سامانە بنەڕەتی و سەرەتاییەکان بکەمەوە، بەڵکو دەمویست سەرجەم ئەو چالاکییە ئاڵوگۆڕانەی لە کۆمەڵگادا بەردەوامە، بخەمە ژێر لێکۆڵینەوەوە. زیاتر دەمویست کە کۆمەڵگا وەک کۆمەڵێک مەسەلەی ئاڵۆزی چالاکییە ئاڵوگۆڕەکان بەرجەستە بکەم.

بێگومان ئاشکرایە کە ئەمە تەنها ڕێگای بەرجەستەکردن و وێناکردنی کۆمەڵگا نییە، بەڵام لە تێڕوانینی منەوە ئەم کارە دەیتوانی لە دیدی (دادپەروەری سەرتاپاگیر)ەوە ئەنجامێکی پۆزەتیڤ بهێنێتەدی، لەبەرئەوەی ئەمە خاڵی جەختکردنەوە بوو لەسەر بوونی (زۆری و فرەیی) لەناو پرۆسە و پێودانگ و ئەو فاکتەرانەش کە دەشێ ئاڵوگۆڕیان پێوە بکرێت. من نەمدەویست کە کۆمەڵگا بەو جۆرە بخەمە بەرچاو کە لە گوتاری سودگەرایی (Utilitarian)دا پێناس دەکرێت. واتا بەو چەشنەی کە گوایا لەو پرۆسەیەدا تەنها یەک (فاکتەری سەرەکی ئاڵوگۆڕ) لە سەرجەم پرۆسەکانی ئاڵوگۆڕدا و لەسەربنەمای هاوکێشەیەکی یەککگرتوو، دەگرێتە ئەستۆ. حەزم دەکرد پێناسێکی دیکە بۆ کۆمەڵگا بخەمەڕوو، پێناسێک کە ئەو دەرەنجامە پۆزەتیڤانەش دەخاتەڕوو کە بە ڕاستی لەناو پرۆسەکانی ئاڵوگۆڕدا هەن.

*ڕێگام بدە بۆ تیۆری (دادپەروەریی سەرتاپاگیر)ی تۆ بگەڕێمەوە، زۆرینەی تیۆریستانی زانستی سیاسەت لەم بڕوایەدان میتۆدەکەی تۆ لە ڕووی تیۆرییەوە کەموکوڕی تێدایە، چونکە ئەم میتۆدە دەشێ ببێتەمایەی ئەوەی کە فەلسەفەی سیاسی پتر ئینتیما بەرەو سۆسیۆلۆژیای ئەزموونگەرایی و وەسفی پەیدا بکات، وەڵامی تۆ لەهەمبەر ئەم چەشنە ڕەخنانە چییە؟

- پێمواننییە ئەوە پێویست بێ کە فەیلەسوفان لە

دیدگای سۆسیۆلۆژیاشەوە تێروتەسەل بن. بوونی تێگەیشتنێکی ئەزموونگەرایانە جێگەی بایەخە نەک تەنها وەک تیۆریێ دەربارەی واقیعییەتی کۆمەڵایەتی، بەڵکو وەک هەستێک دەربارەی ئەو مەسەلانەی لە ئارادان، واتا هەستکردن بە چۆنییەتی ژیان لەم دامەزراوە و ئۆرگانیزە کۆڵامەیەتیانەدا، بەڵام من بانگەشەی ئەوەش ناکەم کە تیۆریستە سیاسییەکان و فەیلەسوفانی ئەخلاق ناتوانن تەنها پشت بە پێناسێکی زۆر باش ببەستن. یەک پێناس تەنها مەودایەک دەخولقێنێ، بەمانایەکی دیکە تەنها تۆ دەخاتە نێو یەک مەودای ئەخلاقییەوە، چونکە من لەم بڕوایەدام کە بەڕاستی جیهانێکی ئەخلاقی هەیە. من نۆمینالیستیش نیم. لە سەرجەم بەرهەمەکانمدا، ڕەگێکی بەرجەستە و تەواوی ڕیالیستیانەی تێدایە. جیهانێکی ئەخلاقی هەیە کە دەتوانم پێناسی بکەم، ئەم پێناسەش زنجیرەیەک دەرەنجامی گرنگی ئەخلاقی بەدواوەیە. بۆ نمونە ئەگەر پێناسی کۆمەڵەیەکی سیاسی بکەم، ئەم پێناسە شیکارییەکی ئەرکی ئەندامان لەهەمبەر یەکتردا لەنێو ئەم کۆمەڵە سیاسییەدا لەخۆدەگرێت. کاتێک ڕۆسۆ دەڵێت: «هاوڵاتیانی کۆمارێک دەتوانن لە هەر دۆخێکدا کە حەز بکەن، کۆمارەکە جێ بهێڵن مەگەر لەو هەلومەرجانەدا نەبێ کە کۆمارەکە ڕووبەڕووی گرفت و دژواری بۆتەوە»، پێموایە ئەمە تەنها پێناسە نەک بەرنامەی کار یاخود بڕیارێکی ئەخلاقی بێت لە لوتکەی چیایەکەوە. مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە کە شیکردنەوەیەکی دیاریکراو بۆ ئەرکی ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیان لەهەمبەر یەکتردا، ئەو ئەنجامە دەدات بەدەستەوە کە هاوڵاتیان ناتوانن سەری خۆیان دانەوێنن و بڕۆن. ژیان لەم کۆمەڵگایەدا، زنجیرەیەک ئەرک بۆ ئەندامەکانی خۆی دەهێنێتە پێش و ئەم ئەرکانەش ڕاستەقینەن.

هەرجۆرە پێناسێ بۆ جیهانی ئەخلاقی، دەببێ ئەم ئەرکانەش بگرێتەخۆ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم مەسەلانە، دەتوانین بڵێین هەرجۆرە پێناسێک، دەرەنجامێکی ئەخلاقیش بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەڵام مەسەلەکە لێرەدا کۆتایی نایەت. جیهانی ئەخلاقی، کۆمەڵێک حەز و خولیاش لەخۆدەگرێت کە لەو چوارچێوەیەدا هێشتا بەدینەهێنراون، ڕەخنەگرانی کۆمەڵایەتیش خۆیان بە چەشنە نوێنەرێکی ئەم حەز و خولیایانە دادەنێن کە جۆرێک لە جیهانگیریشی تێدایە. بۆنمونە چینی فەرمانڕەوا ئەم قسەیە دەهێننەئارا کە حکومەتەکەیان لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگادا کۆک و تەبایە. لەو ساتەدا ڕەخنەگریی کۆمەڵایەتی دێتەپێش و دەڵێت: کەواتە بۆچی هەموو مرۆڤەکان لەنێو هەژاری و مەینەتیدا دەژین و بێبەش و ستەملێکراون.

ئەم هەوڵە ڕەخنەگرانەیە، لە پێناسێکی ڕووتی تێپەڕاندووە و واقیعی ڕۆژانەی ژیان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. ئەمەش یەکێکە لە جۆرە باوەکانی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی.

هەندێکجار کاتێک کۆمەڵگا دەخەینە بەردەم ڕەخنە، ڕەخنەکانمان لە مەودایەکی دوورتر و لە دوورنمایەکی جیهانگیرانەوە ئەنجام دەدەین کە بەلایەنی کەمەوە دەچێتە ئەو چوارچێوە ئەخلاقییەی پێشتر ئاماژەمان پێدا. بەمشێوەیە کۆمەڵگایەک کە هەندێ لە ئەندامەکانی دەبنە دیل، یاخود ستەم لە گروپێکی کەمینە دەکات، نەک تەنها دەتوانین لەناو سیستەمەکەوە پرۆتستۆی بکەین، بەڵکو بەدیلکردن یاخود ستەمکردن لەگەڵ چەمکە باوەکان یاخود ئەو دابونەریتە ڕیشەییە مێژووییانەشدا ناکۆکە کە دەربارەی دادپەروەری یاخود ئازادییە، هەروەها لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیەشدا دەتوانین ڕەخنەی

لێ بگرین، واتا هەموو کەسێ بەشێوازێکی سادەش دەتوانێ بڵێت کە ئەم ڕەفتارە لەگەڵ مرۆڤدا شیاو نییە.

دەتوانین کۆمەڵێک ئامرازی ڕەخنەیی جۆراوجۆر و باسوخواسە ئەخلاقییە هەمەچەشنەکان بخەینەڕوو. هەندێک لەم ئامرازانە، لە واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی (کات و شوێنێکی دیاریکراو) ەوە سەرچاوە دەگرن، هەندێکیشیان لە حەزو خولیا و ئومێدەکانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو و هەندێکیشیان لە ئەخلاقێکی جیهانیانەوەیە. ئەم دوو مەسەلەی سەرەوە، پێویستی بە خستنەڕووی جۆرێ لە پێناسی مێژوویی و کۆمەڵناسی هەیە، ڕەنگە دەربارەی ئەخلاقێکی جیهانیش پێویستی بە پێناسێکی مێژوویی و سۆسیۆلۆژی هەبێت، ڕەنگە دەربارەی ئەم مەسەلەی دوایی پێناسێکی سروشتگەرایشی بوێت.

*کەواتە بەمشێوەیە ئایا دەتوانین بڵێین کە لە ڕوانگەی تۆوە، هاوڵاتێتی بەبێ ئەرکێکی ئەخلاقی نایەتەدی؟. پێدەچێ تۆ لەم مەیدانەدا ئیلهامت لە فەلسەفەی ئەرستۆوە وەرگرتبێ؟. لەکاتێکدا ژمارەیەک لە بیرمەندانی مۆدێرن، پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان هاوڵاتێتی و ئەرکە ئەخلاقییەکانیان لاشیاو نییە.

-ژیان لە هەر کۆمەڵگایەکی سیاسیانەی شیاو و گونجاودا، بمانەوێ و نەمانەوێ کۆمەڵێک ئەرک لەهەمبەر گشت کۆمەڵگادا دەخوڵقێنی. ژیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا، کۆمەڵێک ئەرک لەهەمبەر ئەو کەسانەدا دەخوڵقێنێ، تەنانەت ژیان لە کۆمەڵگایەکی سیاسیانەی نالەباریشدا بەلایەنی کەمەوە ئەم ئەرکە دێنێتەئارا کە بە ئاشکرا بڵێین ئەم کۆمەڵگایە خراپە. کاتێک هێشتا گەنج بووم، لەژێر کاریگەری هەستی جولەکەدا بووم کە خەڵکەکەی هەمیشە لەژێر دەستیدا دەژیان، هەمیشە ئەنجامدانی هەر کارێک یاخود ئەنجام نەدانی بریتییە لە پەیڕەویی لە فەرمانێک. من بیرمەندێکی ئایینی نیم یاخود ناتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە لەسەربنەمای زنجیرەیەک فەرمانی ئایینی دەژیم، بەڵام هیچکاتێ ئەو هەستی ئەرکەم فەرامۆش نەکردووە، لەم بڕوایەدام گەلێ مرۆڤ زۆرجار و لە زۆرینەی هەلومەرجەکاندا هەمیشە لەگەڵ ئەو چەشنە هەستانەدا ژیاوە کە ڕەنگە بەڕاستی و دروستی نەیناسیبێ یاخود بەڕوونی نەیخستبێتەڕوو. دەتوانم بڵێم سەبارەت بەم چەمکی پۆست مۆدێرنە، مرۆڤ بەشێوەیەکی قوڵ و ئازاد و خۆکرد دەتوانێ خۆی بۆ هەرشتێ بگۆڕێت کە مەبەستییەتی، منیش هەر لە سەرەتاوە دژ بە ئەوەم. ئازادی بەهایەکی ڕەخنەگرانەی هەیە، بەڵام تا ئەو ساتەی ئێمە لەتەک کەسانی دیکەدا دەژین، ناوەرۆکێکی بێ سنوری نییە و ناشێ بێ سنوریش بێت.

سەرچاوە نشریە علوم انسانی، گفتوگو، تابستان ١٣٧٧، شمارە ٢٠، ص (١٣٠-١٣٨)

# کۆنترۆڵ و بوونەوە[1]

## گفتوگۆی ئەنتۆنیۆ نیگری لەگەڵ ژیل دولۆز

و. لە ئینگلیزییەوە: پێشڕەو محەمەد



ژیل دولۆز

نێگری: وادەردەکەوێت، کە کێشەی سیاسەت هەمیشە لە فکری تۆدا ئامادەیی هەبووە. ئامادەبوون و بەشداری تۆ لە بزووتنەوە جیاوازەکانی وەکو (زیندانییەکان، هۆمۆسێکسوالەکان، ئۆتۆنۆمیستە ئیتالیاییەکان، فەلەستینییەکان) دا لەلایەک، کێشە هەمیشەییەکانت لەگەڵ دامەزراوەکان، لەلایەکی دیکەوە، کاریگەریی لەسەر یەکتری دادەنێن و لە کارەکانتدا ڕەنگیان داوەتەوە، هەر لەو کتێبەی دەربارەی هیوم نووسیت تاوەکو کتێبەکەت دەربارەی فوکۆ. ڕیشەکانی ئەم خەریکبوونە بەردەوامەی تۆ لەگەڵ پرسی سیاسەتدا لەکوێدایە و چۆن لەنێو بەرهەمەکانتدا پەرەت پێداوە؟ بۆچی پەیوەندی نێوان بزووتنەوە و دامەزراوە[2]، هەمیشە بۆ تۆ پرۆبلەماتیک و گرنگ بووە؟

دولۆز: ئەوەی من مەیلم بەلایدا هەبووە، بریتیی بووە لە ئافرێنراوە دەستەجەمعییەکان، نەک وێناکردنەکان. لە

---

١- Control and Becoming، Becoming بە عەرەبی (**صيرورە**)ی پێدەگوترێت، دولۆز ئەم چەمکە لە نیتشە وەردەگرێت، بەڵام مانایەکی دینامیکیتری پێدەدات، بەدیدی دولۆز بوونەوە، بریتییە لە پەڕینەوەی بەردەوام لە ئایدینێتییەک بۆ یەکێکی دیکە و تەنانەت ئەوەش دەگرێتەوە، کە دولۆز و گواتاری پێیدەڵێن "زۆرایەتییەکان" (multiplicities)، کە لە پێکهاتە سینگولاریتییە ناجۆر و ناهەمەگونەکان پێکدێن لە بونیاد و لێکدراوێکی دینامیکیدا. کەواتە بوونەوە پرۆسەیەکی بەردەوامی لێرەبوون و هاتنەئارا و هاتنەگۆڕکێیە. هەڵبەت لە کوردیدا چەند مانایەکی دیکەی بۆ دانراون، بەڵام لەبەر ئەوەی بوون چاوگە و لە زمانی کوردیشدا بۆ دروستکردنی ڕابوردوی بەردەوامی ڕاگەیاندن، پاشگری (ەوە) دەدرێتە پاڵ چاوک، دوای لابردنی (ن)ی چاوگ، هاوکات (ing)یش پرۆسەی (ەوە) دروست دەکات، بۆیە لە (بوون) وەکو شتێکی جێگیر دەگەین بە (بوونەوە)ی دینامیکی و ناجێگیر و هەمیشە بەردەوام و خۆزیتکەرەوە. (وەرگێڕ). بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەسەر چەمکی "بوونەوە" بگەڕێنەوە بۆ:

Charles J. Stivale(ed), Gilles Deleuze (Key Concepts), McGill-Queen's University Press, 2005, pp.99-100.

2- Movement and Institution

بزووتنەوەی "دامەزراوە"دا، ڕێکبەندییەکی گشتی بوونی هەیە، کە سەربەخۆیە لە یاسا و پەیمانەکان. من لە قسەکەی دەیڤد هیومدا تێگەیشتنێکی زۆر ئافرێنەرانم دەربارەی دامەزراوەکان و یاسا دۆزیوەتەوە. لەسەرەتادا زیاتر مەیلم بەلای ماف و یاسادا هەبوو نەک سیاسەت. تەنانەت لەگەڵ مازۆخ[3] و ساد[4]دا هاوڕا بووم، وەکو مازۆخ مەیلم بەلای چەمکی تەواو ئاڵۆزی پەیمانەکان و هەروەها وەکو سادیش مەیلم بەلای چەمکی دامەزراوەکاندا هەبوو؛ هەروەها دەربارەی سێکسوالیتیش هەر بەمجۆرەیە. لە ئێستادا، دەبینم فرانسیس ئیوالد[5] خەریکی کارکردنە لەسەر دووبارە دامەزراندنەوەی فەلسەفەی ماف وەکو مەسەلەیەکی تەواو بونیادی.

ئەوەی من دەمەوێت لەگەڵیدا خەریک بم، یاسا یاخود یاساکان[6] نییە (یەکەم تێگەیەکی بەتاڵە و دووەمیش بریتییە لە تێگەیەکی ناڕەخنەیی)[(1)]؛ تەنانەت ماف یاخود مافەکانیش نییە، بریتییە لە بونیادی ماف[7]. ئەمە پرەنیسپی مافە، لە کۆتاییدا، کە یاساکان دەئافرێنێت و نابێت ئێمە بکەوینە بڕیار و حوکمدان سەبارەت بەم شتە. نووسەران پێویستە راپۆرتە یاساییەکان بخوێننەوە نەک یاسا مەدەنییەکان. خەڵکی بەردەوام بیر لە بونیادنانی سیستەمێکی یاسایی بۆ ژیانی مۆدێرن دەکەنەوە؛ بەڵام لە ژیانی مۆدێرندا و ئەم ڕەوشە نوێیەی دروستیدەکات، ئەو ڕەوتە نوێیانەی ڕووداوەکان شیاو دەکات، ئەوا تەواوی شتەکان پەیوەندی بە پرەنسیپی مافەوە دەکەن. ئێمە پێویستمان بە کۆمیتەی ئەخلاقی پێکهاتوو لە پیاوانی دانای باش ڕێکخراو نییە، بەڵکو دەبێت گروپەکان لەبەرچاو بگرین. لێرەدایە، کە ئێمە لە مافەوە بەرەو سیاسەت دەڕۆین. من، بەنۆرەی خۆم، لەمیانەی مانگی ئازاری 1968 بە جۆرێک چوومە نێو کایەی سیاسەتەوە، هەر بەوجۆرەی بەڕێی گواتاری و فوکۆ و ئێلی سەمبەر[8]ـەوە پەیوەندیم بە کێشە تایبەتییەکانەوە پەیداکرد. ئەنتی-ئۆدیپ هەر لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتایی، کتێبێک بوو دەربارەی فەلسەفەی سیاسیی.

نێگری: تۆ ڕووداوەکانی 68 بە سەرکەوتنێکی ناوەخت و دەستپێکی دژەواقیعیکردن[9] دەبینی[(2)]. پێشتر لە ساڵەکانی کۆتایی 68دا، لەو کارەی دەربارەی نیتشە و کەمێک دواتر لە کتێبی ساردی و ستەم[10]دا مانایەکی تازەت بە سیاسەت بەخشی-سیاسەت وەک ئەگەر، ڕووداو، تاکایەتی (سینگولاریتی). تۆ بازنەیەکی کورتت دامەزراند، تێیدا داهاتوو درزە دەکاتە نێو ئێستاوە، دامەزراوەکان لەژێر سێبەری خۆیدا دەگۆڕێت. بەڵام دوای 68، تۆ کەمێک ڕێگاکەی خۆت گۆڕی: فکری کۆچەری[11] هەمیشە فۆرمی کاتیی دژەواقیعیکردنی ساتیی بەخۆیەوە دەگرێت، ئەمە لەکاتێکدایە، کە تەنها "بوونەوەی کەمینە یونیڤێرسەلە". چۆن دەتوانین لەم یونیڤێرسەلە پێشوەختە تێبگەین؟

دولۆز: مەسەلەکە ئەمەیە، بەهۆی توانستی جیاوازییدانان لەنێوان هەبوون و مێژوودا من زیاتر و زیاتر تێگەیشتووم.

3- Masoch
4- Sade
5- Francois Ewald
6- Law and Laws
7- jurisprudence
8- Elie Sambar
9- counteractualization
10- Gilles Deleuze: Masochism: Coldness and Cruelty, Venus in Furs, Zone Books, 1991.
11- Nomadic Thought

ئەوە نیتشە بوو دەیگوت هیچ شتێک لەنێو "هەورێکی نامێژووییدا" گرنگی نییە. ئەمە دژایەتیکردنی نەمری و مێژوویی، یاخود رامان و کردە نییە: نیتشە دەربارەی رێگەی روودانی شتەکان، واتا خودی شتەکان یان بوونەوە، قسە دەکات. ئەوەی لە ڕووداوێکدا دێتە نێو چنگی مێژووەوە، شێوازی بەدیهاتنی ئەو ڕووداوەیە لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا؛ واتا بوونەوەی ڕووداوەکانە لەودیوی ئامانجی مێژووەوە. مێژوو شتێکی شیاوی تاقیکردنەوە نییە[3]، مێژوو بریتییە لە چەند پێشمەرجێکی کەم تا زۆر نێگەتیڤ، کە تاقیکردنەوەی بە شتێک لەودیوی مێژووەوە، مومکین دەکات. تاقیکردنەوە بەبێ مێژوو نادیار دەبێت، هیچجۆرە مەرجێکی سەرەتایی نییە؛ بەڵام تاقیکردنەوە مێژوویی نییە. کلیۆ پەگی[12] لە بەرهەمێکی فەلسەفەیی ناوازەدا، ڕوونیکردۆتەوە، کە بە دوو ڕێگا دەتوانین لە ڕووداوەکان ڕابمێنین، یەکێکیان بەڕێی هەڵسەنگاندنی ڕەوتی ڕووداوەکان، واتا چۆن بە شێوەیەکی مێژوویی کۆدەبێتەوە، چۆن لە مێژوودا دروست دەکرێت و پاشان لەنێو دەچێت. ڕێگەی دووەم گەڕانەوە بۆ نێو خودی ڕووداوەکە، شوێنی ئەو شتە وەکو شتێک لەکاتی بوونەوەدا لەبەرچاو بگرین. تازەیی و کۆنی بەیەکەوە وەکو یەک دابنێین، تەواوی ڕەگەزەکانی یاخود تاکەکییەکانی ئەزموون بکەین. بوونەوە بەشێک نییە لە مێژوو؛ مێژوو تەنها کۆمەڵەیەکی پێشمەرجەکانە، کە شتێک بەجێدەهێڵێت بۆ ئەوەی "هەبێت"، واتا شتێکی نوێ بئافرێنێت. ئەمە ڕێک ئەو شتەیە، کە نیتشە پێیدەڵێت پێشوەخت[13]. ئازاری 68 خۆنیشاندان و هەڵقولانێک بوو لە نایابترین و پەتیترین حاڵەتدا. ئێستا مەحکومکردنی ترس لە شۆڕش بووە بە مۆدێکی ڕۆژ. ئەمە شتێکی تازە نییە؛ ڕۆمانتیسیزمی ئینگلیزی ڕامانەکان بۆ دزەکردنە نێو کرۆموێلی بە شتێکی شیاو زانیوە و ئەمڕۆکە ڕامانەکان دەربارەی ستالین، لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ ئەو کاتەدا هەیە[4]. دەڵێن شۆڕشەکان کارەساتی خراپ بەدوای خۆیاندا دەهێنن. بەڵام لێرەدا هەمیشە دوو شتی تەواو جیاواز تێکەڵ دەکەن: شێوازی ڕوودانی شۆڕشەکان لەڕوانگەی مێژووییانە و بەخەڵکیبوونی شۆڕش. ئەمانە بەدوو سێتی جیاواز پەیوەندییان بە خەڵکییەوە هەیە. تاکە هیوای مرۆڤەکان لە بەخڵکیبوونی شۆڕشدا خۆی مەڵاس داوە؛ ئەمە تەنها ڕێگای نەهێشتنی شەرمەزاری یاخود پەرچەکردارە بەرانبەر بەشتێکی نەشیاوی تەحەمولکردن.

نێگری: هەزار فلات[14]، کە بەدیدی من کارێکی فەلسەفەیی گەورەیە، هاوکات پێدەچێت کەتەلۆگێک بێت بۆ کێشە چارەسەرنەکراوەکان. بەتایبەت لە کایەی فەلسەفەی سیاسییدا چەندین دوانە زاراوەی دژ بەیەکی وەکو پرۆسە و پرۆژە، سینگولاریتی و سووژە، ئاوێتە و ئۆرگان، هێڵەکانی فڕین و دەزگاکان-ستراتیژەکان، بچووک و گەورەی تاقیگەیی، و هتد، هەموو ئەمانە نەک تەنها تا کۆتایی بە کراوەیی دەمێننەوە، بەڵکو هەمیشە بەڕێی ئیرادەیەکی سەرسوڕهێنەر بۆ تیۆریزەکردن و بەڕێی بیرەوەرییە توندوتیژەکانی بڵاوکراوە هەرتەقییەکان دووبارە بەکراوەیی زیتدەبنەوە. من بەهیچ جۆرێک دژ بەمجۆرە وێرانکردن و لابردنە[15] نیم. ڕێک بە پێچەوانەوە، هەندێکجار هەست بەوە دەکەم، کە خەریکم تێبینییەکی تراژیدیی دەبیستم؛ ئەو خاڵانەی لێرەدا ڕوون نییە، ئەمەیە، کە جەنگی ئامێر بەکوێ دەگات؟

---

12- Clio Peguy
13- Untimely
14- A Thousand Plateaus
15- subversion

دولۆز: قسەکانتان تووشی ڕاچەنینیان کردم. من وابیردەکەمەوە فلێکس گاتواری و من، پێدەچێت بەدوو چەشنی جیاواز، بەڵام هەردووکمان وەکو مارکسیستێک ماوینەتەوە. دەزانیت، ئێمە وا بیردەکەینەوە، کە هەر فەلسەفەیەکی سیاسیی دەبێت بگەڕێتەوە بۆ شیکارکردنی کەپتالیزم و شێوازەکانی گەشەسەندنی کەپیتالیزم. من شتێکی زۆر گرنگم لە [قسەکەی] مارکسدا دۆزیوەتەوە، ئەویش بریتییە لەو شیکارییەی ئەو بۆ کەپیتالیزم کردویەتی وەکو سیستەمێکی ئیمانێنت، کە بە شێوەیەکی بەردەوام بەسەر سنووردارێتییەکانیدا زاڵ دەبێت، و پاشان جارێکی دیکە بەچەشنێکی کاریگەرتر دەردەکەوێتەوە. بەڵام سنووردارێتییە بونیادییەکەی بریتییە لە خودی سەرمایە (کەپیتال). هەزار فلات بەسەر چەند ئاراستەیەکی جیاوازدا دەڕوات، بەڵام ئەمانە سێ ڕەوتی سەرەکین: یەکەم، ئێمە وابیردەکەینەوە، کە هەر کۆمەڵگایەک بەو ئەندازەیەی بە هێڵەکانی فڕینی پێناسە دەکرێت، بەو ئەندازەیە بە ناکۆکییەکانی پێناسە ناکرێت. کۆمەڵگا بە شێوەیەکی گشتی لە شوێن ڕادەکات و زۆر سەیرە ڕاهێنان یاخود بەدوای ئەو هێڵانەی فڕین بکەوین، کە لەم چرکەساتەوە بۆ چرکەساتێکی دیکە دروست دەبێت. بۆنموونە ئێستە لە ئەورووپا بڕوانە: سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا تەقەللای گەورەیان کردووە بۆ لابردنی هەموو ئەمانە؛ تەکنۆکراتەکان هەوڵی جدیان داوە بۆ ئەوەی بە [سیستەمێکی] بەڕێوەبردن و ڕێسایەکی یونیفۆرم و یەکپارچە بگەن؛ بەڵام پاشان لەلایەکەوە، سەرقاڵی شەپۆلی لەناکاوی خەڵکانی گەنج و ژنان دەبن؛ ئەو شەپۆلانەی تەنها بەهۆی بەلاوەنانی سنوورە سەرەکییەکانەوە دەستەبەر بووە (ئەو دەرەنجامانەی نەشیاون بە تەکنۆکراتی بکرێن)؛ لە لایەکی دیکەوە، زۆر کۆمیدیانەیە کاتێک لەوە رابمێنین، کە ئەورووپا تائێستا بەشێوەیەکی تەواو بەر لەوەی دابمەزرێت، هەڕەشەی کەوتنی دەکرێت؛ واتا ئەو بزووتنەوانەی لە خۆرهەڵاتەوە دێن، ئەورووپا دووچاری شۆک دەکەن. ئەمانە هێڵە سەرەکییەکانی فڕینن. لە هەزار فلاتدا ڕەوتێکی دیکەیش هەیە، کە نە تەنها لەبری ناکۆکییەکان باس لە هێڵەکانی فڕین دەکات، بەڵکو لە بری چینەکان، سەرنج لەسەر کەمینەکان چڕ دەکاتەوە. کەواتە، لە کۆتاییدا ڕەوتی سێیەم خەریکی وەسفکردنی "ئامێری جەنگ" دەبێت، کە پەیوەندی بە جەنگەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە شێوازی تایبەتی کاری فەزا-کات یان داهێنانی فەزا-کاتە تازەکانەوە دەکات: بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان (بۆ نموونە خەڵکی زانیارییەکی تەواویان لە چۆنێتی بەدیهێنانی فەزا-کاتی لە جیهانی عەرەبیدا نییە، کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی فەلەستینی دایهێناوە)، بەڵکو بزووتنەوە هونەرییەکانیش، بەم مانایە، بریتین لە ئامێرەکانی جەنگ. تۆ دەڵێین تۆنێکی تراژیدیی یان مالیخولیایی لە تەواوی ئەم بەرهەمەدا دەبینرێت. بیردەکەمەوە بۆ ئەوەی بزانم بۆچی! تەواوی ئەو پاسجانەی لە کارەکانی پریمۆ لێڤی[16]دا هەن، بەجدی منیان جوڵاندووە؛ بۆ نموونە،

١٦ پریمۆ میشێل لێڤی (١٩١٩-١٩٨٧)، جولەکەیەکی کیمیازان و نووسەری ئیتالیایی بوو. دوو ڕۆمان، کۆمەڵە چیرۆک و وتار و شیعری نووسیوە. هاوکات یەکێک بوو لە ئەندامانی بزووتنەوەی بەرگری دژ بە فاشیزم لە ئیتالیا، ساڵی ١٩٤٤ لەلایەن نازییەکانەوە دەستگیر دەکرێت و بەرەو ئاشڤیتز دەبرێت. دوای ئەوەی ئازاد دەکرێت، نووسینەکانی دەبنە سەرچاوەیەکی ئیلهام بەخش بۆ لێکۆڵینەوە لە کەمپی مەرگی نازییەکان. یەکێک لەو کەسانەی ئیلهامی لە لێڤی وەرگرتووە، جۆرجیۆ ئاگامبێنی مەزنە فەیلەسوفی ئیتالییە، لە کتێبەکەیدا بەناوی «بەجێماوانی ئاشڤیتز» بەشێکی بە ناوی شایەتی، تەرخانکردووە بۆ پریمۆ لێڤی. بڕوانە:

Giorgio Agamben: Remnants of Auschwitz (The Witness and the Archive), trans. Daniel Heller-Roazen, Zone Books, New York, 1999.

لەو شوێنەی ڕوونیدەکاتەوە، کە کەمپی نازییەکان وامان لێدەکات "شەرم لە مرۆڤبوون بکەینەوە". نەخێر، ئەو دەڵێت هەمووومان بەهۆی نازیزمەوە بەرپرسیارین؛ بەوجۆرەی کۆمەڵێک کەس دەیانەوێت ئەوەمان لا قبوڵبێت، بەڵام چیرۆکی هەموومان ئالودەی ئەوە بووە: تەنانەت دەبێت بەجێماوانی کەمپەکان خۆیان لەگەڵی یەکلایی بکەنەوە. ئەوان بەهۆی ئەوەی سەردەمێک پەیوەست بوون بە ناوەندی نازیزمەوە، پێویستە شەرمەزار بن؛ شەرمەزاری لە بێتوانایی بۆ بەرگرتن پێی، نەبینی چۆنێتییەکەی؛ شەرمەزاری لە ڕازیبوون پێی؛ ئەمە هەموو ئەم شتانەیە، کە پریمۆ لیڤی پێیدەڵێت هەرێمی خۆڵەمێشی[17]. هەروەها پێویستە بەهۆی ناچیزبوونی مرۆڤ، هەست بە شەرمەزاری بکەین: لە بەرانبەر بە عەوامکردنە گەورەکانی [بواری] بیرکردنەوە، لەبەرانبەر سەرگەرمییەکانی تەلەفزیۆن، لەبەرانبەر گوتاری وەزیرێک، لەبەرانبەر دروشمە بێ بنەماکانی "خۆشگەپکردنی خەڵک". ئەمە یەکێکە لە بەهێزترین گوڕوتینەکان بەرەو فەلسەفە، و هەر ئەمەیشە هەموو فەلسەفەکان دەکات بە فەلسەفەیەکی سیاسیی. لە کەپیتالیزمدا تەنها شتێک یونیڤێرساڵە: بازاڕ. هیچ دەوڵەتێکی یونیڤێرسال بوونی نییە، دروست بەو هۆیەی بازاڕێکی یونیڤێرسال بوونی هەیە، کە دەوڵەتەکان سێنتەر و ژوورەکانی بازرگانی ئەو بازاڕەن. بەڵام بازاڕ یونیڤێرسالکەر (گشتگیرکەر)، و هۆمۆژێنساز نییە. بازاڕ بەجۆرێکی سەیروسەمە بەرهەمهێنەری سامان و بەدبەختییە. مەیل بۆ مافەکانی مرۆڤ نابێت وامان لێبکات لە "چێژەکانی" کەپیتالیزمی لیبرالیدا، کە بەشی سەرەکییەتی، نقوم ببین. ئەمەی زۆر شەرمهێنەرە ئەمەیە، کە ئیدی هیچ ڕێگەیەکی متمانەکردن بۆ بەردەوامبوونی "بوونەوە"کان یان دامەزراندنیان، بوونی نییە؛ تەنانەت لەنێوان خۆیشماندا. چۆنێتی دەرکەوتنی گروپێک، چۆنێتی گەڕانەوەی بۆ مێژوو، لەسەر جۆرێک لە "دەرگیربوون و مەیل"[(5)] وەستاوە. ئیدی هیچ وێنەیەکی ئەو پرۆلیتارییایە بوونی نییە، کە تەنها دەرگیری هەبوونی ئاگامەندی بوو.

نێگری: چۆن دەکرێت بوونەوەی کەمینەیەک بەدەستەڵات بێت؟ بەرگری چۆن دەشێت ببێت بە ڕاپەڕینێک؟ بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی تۆ، هەرگیز دڵنیا نیم بتوانم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە؛ ئەگەرچی تێیاندا هەمیشە هێزێکی بزوێنەر دەبینمەوە، کە ناچارم دەکات مەسەلەکان بەجۆرێکی تیۆریی و پراکتیکیی دووبارە فۆرمولە بکەمەوە. هێشتا کاتێک نووسینەکانی تۆ دەخوێنمەوە دەربارەی خەیاڵکردن، یان دەربارەی تێگە هاوبەشەکان لای سپینۆزا، یان تەنانەت کاتێک بەدوای وەسفەکانی تۆدا دەچم بۆ کات–وێنەی دەرکەوتنی سینەمای شۆڕشگێڕی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، و هاوڕای تۆ [بە] تێپەڕین لە وێنەوە بۆ ئەفسانەسازی[18]، بە پراکسیسی سیاسییەوە، خەریک بووم، بە ئەندازەیەک هەست بەوە دەکەم، وەڵامم دۆزیوەتەوە... یان من هەڵەدەکەم؟ کەواتە ئایا ڕێگەیەک هەیە بۆ کاریگەرترکردنی بەرگری سەرکوتکراوەکان؟ ئایا ڕێگەیەک هەیە بۆ تاکە جەماوەر و ئەتۆمێک، کە هەموومان ئەوانە بە دەستەڵاتی بیناکەر[19] دادەنێین، یان نا، پێویستە ئەو پارادۆکسەی ماف قبوڵ بکەین، کە لەسەر بنەمای ئەوە، دەستەڵاتی بیناکەر دەتوانێت تەنها لەلایەن دەستەڵاتی دروستکراوەوە[20] پێناسە بکرێت؟

دولۆز: جیاوازی لە نێوان کەمینەکان و زۆرینەکان لە قەبارەیاندا نییە. دەشێت کەمینە گەورەتر بێت لە زۆرینە.

17- Gray Area
18- fabulation
19- constitutive power
20- constituted power

ئەوەی زۆرینە پێناسە دەکات، ئەو مۆدێلەیە، کە تۆ بۆ بەراوردکردن دەیهێنیتە پێشەوە: بۆ نموونە ئاستی مامناوەندی گەورەسالانی نێرینەی شارنشینی ئەوروپا... لەلایەکی دیکەوە، زۆرینە مۆدێلی نییە؛ زۆرینە بریتییە لە بوونەوەیەک؛ بریتییە لە پرۆسەیەک. دەتوانین بڵێین زۆرینە هیچ کەسێک نییە. هەمووان توانستی ئەوەیان هەیە لەنێو کەمینەدا بن و ئەمەش دەشێت ئەوان بەرەو ڕەوتگەلی نەناسراو ئاراستە بکات. کاتێک کەمینەیەک چەند مۆدێلێک بۆ خۆی دروست دەکات، بەم هۆیەوەیە، کە دەیەوێت بگۆڕێت بۆ زۆرینە، و دەبێت بەردەوامی هەبێت و پێشبکەوێت (بۆ نموونە، حەزدەکات بە ڕەسمی بناسرێت و مافی خۆی بەدیبهێنێت). بەڵام دەستەڵاتەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە دەیەوێت دروستی بکات، تا ئاستێک بەندە لەسەر ئاستی ئەو مۆدێلە، بەڵام پێیەوە وابەستە نییە. خەڵکی هەمیشە کەمینەیەکیان ئافراندووە و بە تەنها دەمێننەوە. تەنانەت کاتێک بوون بە زۆرینە، ئەوا دەتوانن هەردوو تایبەتمەندییەکەیان بەیەکەوە هەبێت. ئەمە هونەرمەندە گەورەکانن (نەک هونەرمەندە پۆپۆلیستەکان)، کە خەڵکی بەدیدەهێنن و ئەوان "بەبێ خەڵک"[21] دەدۆزنەوە: مالارمە، رامبۆ، کلە، بێرگ. هونەرمەندان تەنها دەتوانن داوای خەڵک بکەن، پێویستی ئەوان دروست دەچێتە نێو دڵی ئەو شتەی ئەنجامی دەدەن. کاری ئەوان بریتی نییە لەوەی یەکێک دروست بکەن، توانستی ئەم کارەیشیان نییە. هونەر بەرگرییە: بەرگری لەبەرانبەر بە مەرگ، کۆیلەیی، ڕسوایی و شەرمەزاری. بەڵام خەڵک ناتوانن خەمیان بەرانبەر بە هونەر هەبێت. خەڵکی چۆن بەرێی ئازارە گەورەکانەوە دەئافرێنرێن؟ خەڵک بەرێی سەرچاوەکانی خۆیانەوە دەئافرێنرێن؛ بەڵام بەشێوەیەک، کە بەجۆرێک پەیوەندی بە هونەرەوە هەیە (گارێل دەڵێت کۆمەڵێک لەو ئازارە گەورانەی لە مۆزەخانەی لۆڤەردا هەیە) یان هونەر دەبەستێتەوە بەو شتەی نییەتی. یۆتۆپیا کۆنسەپتێکی دروست نییە: یۆتۆپیا زیاتر مەسەلەیەکە پەیوەندی بە خشتەبەندیی[22]یەوە هەیە، کە تێیدا خەڵک و هونەر بەیەکەوە بەشداری دەکەن. ئێمە دەبێت تێگەیشتنی بێرگسن بۆ خشتەبەندی وەربگرین و مانایەکی سیاسیی پێبدەین.

نێگری: لەو کتێبەی دەربارەی فوکۆ نووسیوتە، و هەروەها دووبارە لەو چاوپێکەوتنە تەلەڤیزیۆنییەی لەگەڵ INA[6] ئەنجامت داوە، پێشنیاری ئەوە دەکەیت، کە دەبێت وردتر لە سێ جۆری دەستەڵات بڕوانین: دەستەڵاتی سۆڤەرێن (حاکم)، دەستەڵاتی دیسپلینکار و لە هەمووان گرنگتر، کۆنترۆڵی "پەیوەندییەکان[23]"، کە خەریکە هەژموونێکی زۆر پەیدا دەکات. لەلایەکەوە، ئەم سێ سیناریۆیە پەیوەندییان بە پێرفێکتترین فۆرمی هەیمەنە[24]وە هەیە، تەنانەت دزە دەکەنە نێو پانتایی قسەکردن و خەیاڵکردنیشەوە. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، هەر مرۆڤێک، هەر کەمینەیەک، هەر سینگولاریتییەک (تاکەکییەک)، زێتر لە ڕابوردوو، بە شێوەیەکی هێزەکیانە (پۆتێنشیەل) توانای قسەکردن و دەرکەوتنی هەیە و بەم شێوەیە ئەندازەیەکی گەورەتری ئازادی بەدیدەهێنێت. لە یۆتۆپیای مارکسیستی گروندریسەدا، کۆمۆنیزم بە وردی فۆرمی ئۆرگانیزەکردنی تەواوجیهانی تاکە ئازادەکان بەخۆوە دەگرێت و لەسەر ئەو تەکنەلۆژییە بونیادنراوە، کە دەبێت ئەوە بسازێنێت. ئایا کۆمۆنیزم هێشتا ئۆپشنێکی (اختیار) زیندووە؟ لەوانەیە لە کۆمەڵگای کۆمۆنیکاسیۆنی (پەیوەندیی)دا، بەپێچەوانەی ئەو ڕوانگە باوەی هەبوو، کۆمۆنیزم کەمتر یۆتۆپییایە؟

21- lack a people
22- Tabulation
23- communication
24- domination

دولۆز: ڕێکوڕاست ئێمە بەرەو کۆمەڵگا "کۆنترۆڵی"ییەکان هەنگاو دەنێین، کە ئیدی بە تەواوی [کۆمەڵگای، و] دیسپلینکار نین. بە گشتی، فوکۆ وەکو تیۆریستی کۆمەڵگا دیسپلینکارەکان و تەکنەلۆژییە پرەنسیپییەکانی، واتا زیندانیکردن، دەبینن؛ (زیندانیکردن نە تەنها لە نەخۆشخانەکان و زیندانەکاندا، بەڵکو لە قوتابخانەکان، کارگەکان و سەربازگەکانیشدا). بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یەکەمین کەسێک بوو گوتی ئێمە دەمانەوێت لە کۆمەڵگا دیسپلینکارەکان بچینە دەرەوە. ئێمە خەریکە بەرەو کۆمەڵگا کۆنترۆڵکارەکان دەبزوین، چیدی پەیوەندییان بە زیندانیکردنی خەڵکییەوە نییە، بەڵکو بەڕێی کۆنترۆڵی بەردەوام و کۆمۆنیکاسیۆنی هەمیشەییەوە کاردەکەین. بورۆز[25] یەکەمین کەس بووە ئەم بابەتەی باسکردووە. هەڵبەت خەڵکی بەردەوام دەربارەی زیندانەکان، قوتابخانە و نەخۆشخانەکان دەدوێن: دامەزراوەکان بەرەو ئاوابوونن. بەڵام ئەوان بەو هۆیەوە بەرەو ئاوابوونن، کە خەریکی ئەنجامدانی ئەو خەباتەن، کە شکست دەهێنێت. شێوازە تازەکانی سزادان، پەروەردە، چاودێری تەندروستی بە شێوەیەکی نهێنی، خەریکی دەرکەوتنن. نەخۆشخانەکان و تیمە کراوەکان باس لە چاودێرییەکانی ماڵەوە دەکەن. دەتوانین بڵێین دامەزراوەی پەروەردە هەرچەند کەمتر شوێنێکی داخراوە، کە لە فەزای کار وەکو شوێنێکی داخراوی دیکە جیاوازی هەیە، بەڵام هەردووکیان بەرەو ئاوابوون و داڕمان دەبزون و دەبن بە پەروەردەیەکی مەترسیداری بەردەوام و چاودێریکردنی بەردەوامی[7] کرێکار–قوتابخانەی سەرەتایی یان کارمەند–خوێندکار. ئەوان هەوڵدەدەن ئەمە وەکو ڕیفۆرمێکی سیستەمی قوتابخانەیی دابنێن، بەڵام لەڕاستیدا دایدەماڵن و ڕووتیدەکەنەوە[26]. خۆت پێشتر باست لەوە کردووە، کە چۆن کاری نیوە–دەوام لە ماڵ و فۆرمە تازەکانی خولانەوە و دابەشکردنی بەرهەم، فۆرمی کاری لە ئیتالیا گۆڕیوە. ئەو ئاراستەیەی باستکردووە، برەوێکی زۆری پەیداکردووە. هەڵبەت دەتوانین ببینین، کە چۆن هەریەکێک لەجۆری کۆمەڵگاکان لەگەڵ جۆرێکی تایبەتی ئامێردا دەگونجێت– کۆمەڵگا سۆڤەرینییەکان لەگەڵ ئامێرە میکانیکییە سادەکان، کۆمەڵگا دیسپلینکارەکان لەگەڵ ئامێرە گەرمە بەردەوامەکان، کۆمەڵگا کۆنترۆڵکارەکانیش لەگەڵ ئامێرە سایبرەنتیکی و کۆمپیوتەرەکان. بەڵام ئامێرەکان باس لە شتێک ناکەن، دەبێت ڕێکخستنە دەستەجەمعییەکان شیکار بکەیت، کە ئامێرەکان تەنها یەکێکن لە پێکهێنەرەکانی. بەراوردکردن لەگەڵ نزیکبوونەوە لە فۆرمەکانی کۆنترۆڵی هەمیشەیی لە شوێنە کراوەکاندا، دەتوانین وەکو بەشێکی ڕابوردووی شادی سەرسوڕهێنەر، ئاراستەی زیندانی توند و پتەو ببینین. گەڕان بەدوای "یونیڤێرسالەکانی پەیوەندی"دا دەبێت بمانلەرزێنێت. ئەوە ڕاستە، کە تەنانەت بەر لەوەی کۆمەڵگا کۆنترۆڵکارەکان پەیدا ببن، فۆرمەکانی نافەرمانی یان بەرگریش (دوو شتی جیاوان) بەرەو دەرکەوتن بوون. بۆ نموونە، چەتەیی کۆمپیوتەر و ڤایرۆسەکان، جێگای مانگرتن و ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا پێیدەگوترا "خراپەکاری"[27] ("لەکارخستنی ئامێر")[8]. دەپرسی ئایا کۆمەڵگا کۆنترۆڵکارەکان یان کۆمۆنیکاسیۆنەکان دەبن بە فۆرمەکانی ئەو بەرگرییەی، کە بتوانن ڕێگە بۆ کۆمۆنیزم بکەنەوە و "ئۆرگانیزەکردنی تەواو جیهانی تازە ئازادەکان" دابمەزرێنن؛ لەوانەیە، ن نەیزانم! بەڵام دەربارەی ئەمە پێویست بە قسەکردنی کەمینەکان ناکات , لەوانەیە گوتار و کۆمۆنیکاسیۆن گەندەڵ بووبێتن. ئەوان لە سەرەتاوە لەگەڵ پارەدا نفوز پەیدا دەکەن–نەک لەگەڵ ڕووداو[28]، بەڵکو زیاتر لەگەڵ سروشتی

25- Burroughs
26- dismantling
27- sabotage
28- accident

خۆیان. لێرەدا ئێمە باس لە دز دەکەین. داهێنان هەمیشە شتێکی هەبووە جیاوازتر بووە لە پەیوەندیگرتن. بابەتی سەرەکی بریتییە لە دروستکردنی چاڵە بێ پەیوەندییەکان[29]، بازنەشکێنەکان، بەمجۆرە دەتوانین لە کۆنترۆڵ دووربکەوینەوە.

نێگری: لە کتێبی فوکۆ و The Foldدا[30]، پرۆسەکانی بەسووژەکردن زێتر و وردتر لە هەندێکی دیکەی کارەکانت بەرچاو دەکەون و خراونەتە بەر لێکۆڵینەوەوە. سووژە بریتییە لە سنووری جوڵەی بەردەوامی نێوان ناوەوە و دەرەوە. پەیامە سیاسییەکانی ئەم چەمکی سووژەیە چییە؟ ئەگەر نەتوانین سووژە بۆسەر ئاستی هاوولاتییەکی دەرکراو[31] کورت بکەینەوە، ئایا دەشێت هاوولاتی لەگەڵ هێز و ژیاندا ئاوێتەبکرێت؟ ئایا دەشێت پراگماتیزمێکی نوێی خەباتکەر و هاوکات پانتاییەک بەرەو جیهان و بونیادێکی تەواو ڕادیکاڵ ئاوەڵا بکات؟ کام سیاسەت دەتوانێت شان و شکۆی ڕووداوەکان و سەبژێکتیڤیتە بەرێتە نێو مێژووەوە؟ چۆن دەتوانین وێنای کۆمەڵێک[32] بکەین، کە هێزی ڕیاڵی هەیە، بەڵام بنەمایەکی نییە، واتا گشتگیر و تۆتالیتە نییە، بەڵکو بەو جۆرەی سپینۆزا دەڵێت، ڕەهایە؟

دولۆز: بێگومان ماناداره، کە تەماشای شێوازە جۆراوجۆرەکانی تاک و گروپەکان بکەین، کە خۆیان بەڕێگەی پرۆسەکانی بەسووژەبوون وەکو سووژەکان، بونیاد دەنێن: ئەوەی لەم پرۆسانەدا دەبینرێت بریتییە لە پێوەری دوورکەوتنەوەیان لە فۆرمە دامەزراوەکانی زانین و فۆرمە زاڵەکانی دەستەڵات لە پرۆسەی دروستبووندا. تەنانەت ئەگەر فۆرمە تازەکانی دەستەڵات بەدیبهێنن یاخود لەگەڵ فۆرمە تازەکانی زانیندا یەکبگرن. کەواتە بەشێوەیەکی تەواو، سپۆنتانیتی (عفویت)ێکی یاخی ڕاستەقینە لەوانەدا هەیە. ئەکە پەیوەندی بە گەڕانەوە بۆ "سووژە" نییە، واتا، ئەو شتەی تێکەڵ بە ئەرکەکان، دەستەڵات و زانین بووە. دەتوانین باس لە شێوازە تازەکانی ڕووداو بکەین، لەجیاتی باسکردن لە پرۆسەکانی بەسووژەبوون: ئەو ڕووداوانەی، کە ناشێت لەلایەن ئەو ڕەوشانەی ئەگەری دەرکەوتنیان پێدەدات، یان بەوان کۆتایی دێت، ڕوونبکرێتەوە و ڕاڤە بکرێت. ئەوان ساتێک دەردەکەون و ئەمەش هەر ئەو ساتەیە، کە گرنگی هەیە، ئەمە ئەو چانسەیە، کە دەبێت بیقۆزینەوە. یان بە سانایی دەتوانین دەربارەی مێشک بدوێین: مێشک ڕێک سنووری بزووتنی بەردەوامی دوولایەنەیە لەنێوان ناوەوە و دەرەوەدا، لەنێوان ئەواندا شاردراوەتەوە. ڕێگاکانی مێشکی نوێ، ڕێگا تازەکانی بیرکردنەوە، ناکرێت لەسەر بنەمای مایکرۆسێرجەری[33] شیبکرێنەوە؛ ئەمە ئیشی زانستە، کە هەوڵبدات ئەوەی دەشێت لە مێشکی کەسێکدا بۆ دەستپێکی بیرکردنەوە یان هەڵبژاردنی ئەمە یان ئەوە، بدۆزێتەوە. بیردەکەمەوە بەسووژەبوون، ڕووداوەکان و مێشکەکان کەم تا زۆر شتێکی چوونیەکن. زێتر لە هەر شتێک، ئێمە باوەڕمان بە جیهان نییە، ئێمە بەشێوەیەکی تەواو جیهانمان لەدەستداوە، جیهان ناڕەحەت بووە. ئەگەر باوەڕت بە جیهان هەیە، لانیکەم خێرایی بەو ڕووداوانە دەبەخشیت، کە کۆنترۆڵ لەناو دەبەن، فەزا-کاتی نوێ بەدیدەهێنیت، هەرچەند ئەندازە یان قەبارەیەکی بچووکیشی هەبێت.

---

29- vacuoles of noncommunication

٣٠- دەشێت بە مانای «پەرژین» وەربگێڕدرێت. (وەرگێڕ)

31- externalized

32- a community

٣٣- نەشتەرگەرییەکی میکرۆسکۆبی microsurgery

ئەمە ئەو شتەیە، کە تۆ پێیدەڵێیت پانتایی[34]. توانستی بەرگری ئێمە لەبەرانبەر کۆنترۆڵ یان تەسلیمبوون بە کۆنترۆڵ، پێویستە لەسەر بنەمای ئاستی بزووتنی ئێمەوە هەڵبسەنگێنرێت. ئێمە هەم پێویستمان بەداهێنان و هەم بە خەڵک.

یاداشتەکانی وەرگێڕی ئینگلیزی

(1) La loi, les lois : بە ڕێکی لە ئینگلیزیدا دەبن بە "the laws" و "laws"، چاودێرە بەسەر سیستەمی دادوەری یاسایی پۆزەتیزدا، کە بە شێوازی کۆدی یاسایی دادەمەزرێت (وەکو یاسای مەدەنی لە فەرەنسا). من "law"م (بەبێ پیتی ناساندن) بۆ وەرگێڕانی adroit، سیستەمی مافەکان (adroits) بۆ "مافی سروشتی" بەکارهێناوە، بەو جۆرەی لاتینی jus لەبەرانبەر بە lex بەکاردەهێنێت.

(2) Contre-effectuation: مەبەستی دولۆز لەم زاراوەیە لە کتێبی لۆژیکی مانادا برێتییە لە "دژە-ئاکت" یان دانانی هەر چالاکییەک لەنێو ئەو ڕۆڵانەی لەپێشەوە دیاریکراون بە جۆرێکی پاسیڤ و ناچالاک.

(3) L'histoire n'est pas l 'experimentation: دەربارەی مانای دوانەیی "experience " و " experiment" بڕوانە: "Breaking Things Open," n. 13.

(4) دەتوانین بڵێین ئەو ڕامانانەی دەربارەی کرۆموێل لە ڕۆمانتیسیزمی فەرەنسیدا کراون- زۆر سێنترالیترن لەو کارانەی پێشڕەوانی ئینگلیزی لەم بوارەدا ئەنجامیان داوە. بەشێوەیەکی نەریتی، ڕۆژگاری لەدایکبوونی ڕۆمانتیسیزم وەکو بزووتنەوەیەکی جیابووەوە، بە بڵاوکردنەوەی کتێبی کرۆموێلی ڤیکتۆر هوگۆ دەبینن لە ساڵی 1872دا.

(5) دەرگیربوون و مەیل، یان نیگەرانی، ئەو شتەی بەردەوام بیرکردنەوە پێیەوە سەرقاڵە.

(6) The Institut National d'Audiovisuel: لە ساڵی 1975 لەلایەن حکومەتی فەرەنسییەوە وەکو ناوەندێک بۆ پەروەردەکردن، لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانی میدیاکانی بیستن و بینین دامەزرا. خەرجی ناوەندە بە ئەندازەیەک بە ئەندازەیەک لەلایەن تۆڕەکانی تیڤی فەرەنسی دابین دەکرد و خەریکی بەرهەمهێنانی ژمارەیەک پرۆگرامی نێتۆرکی بوو.

(7) Controle continu: لە ڕوانگەی زمانییەوە واتا "کۆنترۆڵی بەردەوام"، ئەم زاراوە فەرەنسییە بەرانبەر بە "هەڵسەنگاندنی بەردەوام"ـە لە پەروەردە و فێرکردندا؛ لێرەدا formation permanenteم بە "پەروەردەکردنی بەردەوام" وەرگێڕاوە، کە هاومانایەکی ستانداردە بۆ "پەروەردەی بەردەوام" (continuing education )

(8) sabotage: دروستکردنی پێڵاوی کۆن بوو لە ئەوروپا، لەلایەن کرێکارانی دارستانەوە.

لەم لینکە وەرگیراوە
http://www.generation-online.org/p/fpdeleuze3.htm

34- pietas



صادقی هیدایەت

ئەو پیاوەی کە شەوێ لە ڕێگەی خونسار سواری ئۆتۆمبێلەکەمان بوو، بە وردی خۆی لە نێو پاڵتۆ بارانییە سوورمەییەکی پێچابووەوە و کڵاوە لێودارە درێژەکەی تا نێوچاوانی داگرتبوو. تەواو وەک ئەوەی بییەوێت لە ڕووداوەکانی جیهانی دەرەوە و پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوانی تردا بەدوور بێ. پاکەتێکی بە بنباڵەوە بوو، دەسی بە دەورییەوە پەرچین کردبوو. لەو نێو سەعاتەدا کە لە ئۆتۆمبێلەکەدا بەیەکەوە بووین، بە هیچ شێوەیەک بەشداری گفتگۆکانی نەئەکرد، نە لەگەڵ شۆفێرەکە و نە لەگەڵ نەفەرەکانی تردا. لەو ڕووەوە گاریگەرییەکی سەخت و قووڵی سەبارەت بە خۆی جێهێشتبوو. هەر کاتێ چرای نێو ئۆتۆمبێلەکە یا ڕووناکی دەرەوە ناوەوەی ڕووناک بکردایەوە من بە دزییەوە تەماشایەکی ڕووخساریم ئەکرد. ڕووخسارێکی سپی ڕەنگ پەڕیو و لوتێکی بچوکی قەڵەمی هەبوو، پێڵووەکانی لە ماندوویدا هاتبوە خوارەوە. شەقێکی قووڵ بە هەردوو لای لێوییەوە ئەبینرا کە هێز و ویست و ئیرادەی ئەوی ئەگەیاند، وەک بڵێی سەری لە بەرد داتاشرا بوو، تەنیا هەندێ جار زمانێکی بە لێویدا ئەهێنا و دواتر خەیاڵ ئەبیردەوە.

ئۆتۆمبێلەکەمان لە خونسار لەپێش گەراجی ((مەدەنی)) ڕاوەستا. گەرچی بڕیار بوو شەو ڕانەوەستین، وەلێ شۆفێرەکە و هەموو نەفەرەکانیش دابەزین. منیش تەماشایەکی دەرودیـواری گەراج و قاوەخانەکەم کرد، زۆر باوی دڵم نەبوو. پاشان نزیکی ئۆتۆمبێلەکە بوومەوەو وەک ئاخر قسە بە شۆفێرەکەم وت: (( وا پێئەچێ شەو لێرە ڕۆژبکەینەوە؟))

(( ئەرێ، ڕێگە خراپە. ئەم شەو لێرە ئەبین، بەیانی مەلابانگدان بەڕێ ئەکەوین))

لەناکاودا بینیم ئەو کەسەی پاڵتۆ بارانییەکەی لەخۆی پێچابوو بەرەو ڕووم هات و بەدەنگێکی نەرم و خەفەوە وتی: ــ (( ئێرە شوێنێکی باشی لێ نییە، ئەگەر ماڵە خزمێکت یان شوێنێکت بۆ خۆت لەبەرچاو نەداوە، ئەکرێ بێنە ماڵەکەی من))

(( زۆر سوپاس! وەلێ حەز ناکەم ببمە مایەی زەحمەتتان))

(( من حەز لە خولّقکردن ناکەم، نە تۆ ئەناسم و نە ئەشمەوێ بتناسم، ناشمەوێ منەتت بەسەردا بکەم. لەو کاتەوە ژوورێکم بە زەوقی خۆم درووستکردووە، ئیتر ژوورە کۆنەکەم بەکار ناهێنم، تەنیا ئەوەندە هەیە وا هەست ئەکەم لە قاوەخانەکە باشتربێ))
دەنگە سادە و ڕاشکاوانە و بێباکەکەی کاریتێکردم، تێگەیشتم لەوەی کە سەروکارم لەگەڵا کەسێکی ئاسییدا نییە. وتم: (( زۆر باشە، من ئامادەم)).
بێ هیچ دوو دڵییەک دوای کەوتم، دەسی کرد بە گیرفانیا و چرایەکی دەسی دەرهێنا و داگیرساند و ڕۆشناییەکی تیژی ستوونی بەردەم پێمانی ڕووناککردەوە، لە چەن کۆڵانێکی بەرز و نزما بە نێو دیوارە گڵیییەکان گووزەرمان کرد. گشت شوێنێ بێدەنگ و ئارام بوو. جۆرێک لە ئاسوودەیی و ئارامیی ناخی مرۆڤی ئەتەنی.... دەنگی ئاو ئەهات و سروەیەکی فێنک بەنێو دارەکاندا تێئەپەڕی و ڕێک ئەیدا بەدەماوچاوماندا. چرای یەک دوو ماڵ لە دوورەوە تروسکە تروسکی بوو. ماوەیەک تێپەری و ئێمە لە تاریکیدا ئەڕۆیشتین. من بۆ ئەوەی هاوڕێ نەناسەکەم بهێنمە قسە وتم: ((لەوە دەچێت ئێرە شارێکی جوان بێ!))
وەلێ وەک ئەوەی لە دەنگی من ترسا بێ پاش ماوەیەک بیرکردنەوە زۆر لەسەرخۆ وتی: (( لە نێو ئەو شارانەی ئێران کە من بینیوومن خونسارم لە هەموویان لا جوانترە، نەک لەبەر ئەوەی سەرسەوزوە و داروبار و میوە و ئاوی لێیە، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوەی هێشتا شێوازی کۆنی خۆی پاراستووە. چونکە هێشتاش هەر شێوەی ئەم کوچەو کۆڵانانە و درزی نێوان خانووە قووڕەکان و دارە بەرزە بێدەنگەکانی وەکو خۆی ماوەتەوە. ئەشێ بۆنی بکەیت هێشتا ڕووی مێواندۆستی خۆی لەدەس نەداوە. ئێرە شوێنێکی دوورەدەس و پەرتە هەر ئەوەش کەشەکەی شاعیرانە کردووە. ڕۆژنامە، ئۆتۆمبێل، فرۆکە، ڕێیئاسن لە بەڵاکانی سەردەمە، بەتایبەت ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە بە هۆڕن و تەپوتۆز، کەیفی شاگرد شوفێرەکە تا دوورترین کوێرەدێیەکان ئەبات- و بیرۆکەگەلێکی تازەکیسە و سەلیقەی خواروخێچ و لاسیکردنەوەیەکی گەمژانە بە گشت کونوکەلەبەرێکدا ئەکات.
ڕۆشنایی چرادەستییەکەی بە پەنجەرەی خانووەکان ئەکێشا و ئەیوت: ((بڕوانە، مونەبەتکاری پەنجەرەکان خانووی جیاوازی هەیە. مرۆڤ هەست بە بۆنی خاک ئەکات، بۆنی یۆنجەی دروێنە کراو، هەست بە بۆگەنی ژیان ئەکات، دەنگی چیچرک و باڵندەچکۆلانەکان، خەڵکی جاران بە سادە و بەدکارییەوە، هەموو ئەمانە دنیایەکی بەرزبووی کۆن ئەهێنێتەوە یاد و مرۆڤیش لە قیرۆقاڵی دنیایی تازەکیسەکان بە دوور ئەگرێ.
پاشان لەپڕدا هاتەوەیادی کە منی میوان کردووە پرسی : (( شێومان خواردوە؟))
((ئەرێ، لە گوڵپپایەگان شێومان خوارد))
بە تەنیشت چەند چۆمێکدا تێپەڕین ئاخری نزیکیی کێوەکە، دەرگای باخێکی کردەوە و هەردوو چووینە ژوورەوە. گەیشتینە بەردەم باڵەخانەیەکی تازەساز. چووینە ژوورێکی بچووکەوە کە تەختەخەوێکی سەفەری، مێزێک و دوو ئەسکەملی ڕاحەتی تێدا بوو. چرا نەوتییەکەی داگیرساند و چووە ژوورەکەی ترەوە. دوای چەند خۆلەکێک بە بیجامەیەکی سوورکاڵ لە ڕەنگی گۆشتی جەستەی، هاتەژوورەوە و چرایەکی تری هێنا و دایگیرساند. دواتر پاکەتەی کە پێی بوو کردیەوە. ئاباژۆرێکی سووری قووچکەیی لەنێو پاکەتەکەدا دەرهێنا و خستیە سەر چراکە.

پاش ماوەیەک تێڕمان، وەک ئەوەی لە کارێ دوو دڵا بوو وتی : (( ئەفەرموون بچینە ژوورە تایبەتەکەی خۆم؟))

چرای ئاباژۆرەکەی هەڵگرت، بە داڵانێکی تەسک و تاریکدا تێپەڕین، سەرمیچەکەی گومەدی بوو بە شێوەیەکی لوولەیی دروستکرابوو، سەرمیچ و دیوارەکانی لەڕەنگی ئۆخرایی بوون و زەویەکەشی بە گڵێمی سوور داپۆشرابوو. دواتر دەرگایەکی تری کردەوە و چووینە نێو پانتاییەکەوە هەروەک ژوورێکی شێوە هێلکەی بوو، واپێدەچێ هیچ ڕێیەکەی تری بۆ دەرەوە نەبێ، جگە لەو دەرگایەی کە ڕوو بەرەو داڵانەکە ئەکرایەوە. بێ گۆشە و بێ هێڵی ئەندازەیی دروستکراوە، سەرتاسەری سەرمیچ و لاتەنیشت و زەوییەکەی بە (قەدیفە) مەخمەڵی عەنابی داپۆشرابوو. تەنگە نەفەس بووم بەهۆی ئەو بۆن و بەرامە قورسەی کە بە هەوای ژوورەکەدا بڵاو بووبووەوە. چرایەکەی لەسەر مێزەکە دانا و خۆیشی لەسەر ئەو تەختەخەوەی ناوەڕاستی ژوورەکە دانیشت و فەرمووی لێکردم، منیش لەسەر ئەسکەمەلەکەی تەنیشت مێزەکەوە دانیشتم. لە سەری مێزەکە پەرداخێک و گۆزڵەیەکی دۆیان دانابوو. من بە سەرسامییەوە ئەمڕوانیە دەوروبەر، لای خۆم وام خەیاڵ کرد، بێگومان کەوتوومەتە داوی یەکێک لەو نەخۆشە شڕوشێتانە و ئێرەش ژووری ئەشکەنجەدانەکەیەتی، بۆیەش بە ڕەنگی خوێنی دروستی کردووە تاکو تاوانەکانی ئاشکرا نەبێ، هیچ ڕێیەکی بۆ دەرەوەش نییە تا بە فریای مرۆڤ بکەوێ! چاوەڕوان بووم بەتیلایەک بدرێت بە سەرمدا یانیش دەرگا دابخرێ، ئەم بابەیە بەچەقۆ یا تەور هێرشم بکاتە سەر. وەلێ ئەو هەر بەو دەنگە هێورەیەوە پرسی: ((ژوورەکەمت پێ چۆنە؟))

((ژوور؟! ببورە، – بەس واهەست ئەکەم لەنێو کیسەیەکی نایلۆنی دانیشتووین))

ئەو بێ ئەوەی باکێکی بەقسەکانەوە هەبێ، دیسانەوە وتی : (( خواردنی من شیرە، تۆیش ئەخۆیتەوە؟!))

((زۆر سپاس من شێوم خواردووە))

((پەرداخێ شیر خراپ نییە))

گۆزەڵەکە و پەرداخەکەی لەپێشم دانا. گەرچی مەیلم لێی نەبوو، وەلێ چارناچاری پەرداخێک شیرم تێکردوو و خواردمەوە. ئیتر خۆی ئەودوای شیرەکەی ئەڕشتە نێو پەرداخەکەوە و هێدی هێدی هەڵیئەمژی، زبانی بەسەر لێویدا ئەهێنا و لێوەکانی ئەدرەوشانەوە، پێڵووەکانی بەشێوەیەکی بەژان ئاسا داخستبوو، وەک بڵێی یادەوەرەییەکانی ئەهێنایەوە بەرچاو. ڕووخسارێکی لاو و ڕەنگ پەڕیو، لوتێکی کورت و ساف، لێوە گۆشتنەکانی لەبەرامبەر ڕۆشنایی سوور، حاڵەتێکی شەهوانی بەخۆوە گرتبوو. تەوێڵێکی بەرزی هەبوو دەمارێکی مۆری بەرجەستە بەسەرییەوە ئەبینرا. قژە خورماییەکەی تا سەر شانی هاتبوو. وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات وتی: (( من هیچ کات لە خۆشییەکانی ئەوانی تر هاوبەش نەبووم، هەردەم هەستێکی قورس یان هەستی بەدبەختی پێشی لێ گرتووم.– ئازاری ژیان، گرفتەکانی ژیان، ئەمما لە هەموو ئەو گرفتانە گرنگتر هەڵکردنە لەگەڵ مرۆڤەکاندا، بەدکاری کۆمەڵگایەکی گەنیاو، بەدکاری خۆراک و پۆشاک هەموو ئەمانە بەردەوام ڕێگری ئەکەن لە بەئاگاهاتنەوەی وجودی ڕاستەقینەمان. ساتەوەختێک تێکەڵاوی ئەوان بووم، ویستم لاساییان بکەمەوە، بۆم دەرکەوت گاڵتەم بەخۆم کردووە، هەرچی ئەوان بە چێژی ئەبینن هەر هەموویانم تاقیکردەوە، تێگەیشتم لەوەی

چێژی ئەوانی تر بەکەڵکی من نایەت. - هەستم ئەکرد هەمیشە و لە هەر شوێنێ بم بێگانەم، هیچ هاوپەیوەستییەکەم بە خەڵکانی ترەوە نەبوو. من نەمئەتوانی خۆم وەکو ئەو خەڵکەی تر بگونجێنم. هەمیشە بە خۆمم ئـەوت: ((ڕۆژێ لە کۆمەڵگا ڕائەکەم، لە دوورەدێییەک یان شوێنێکی دوور خۆم گۆشەگیر ئەکەم، وەلێ نەمئەویست گۆشەگیری ئامرازێ بێ بۆ نان پەیداکردن و ناوبانگ دەرکردنم. نەمئەویست خۆم پابەندی بیرکردنەوەی کەس بکەم یان لاساییکەرەوەی کەسێ بم، ئاخری بڕیارم دا ژوورێک بەکەیفی خۆم ساز بکەم. شوێنێک لەنێو خۆمدا بم، جێیەک کە بیرکردنەوەمی تێدا پەرت نەبێ))

((مـن هـەر بە تەمەڵی ئەفرێندراوم. - کـار و کەسابەت هی خەڵکی هەڵوولە، ئەیانەوێت بەم ڕێگەیە ئەو بۆشاییەی لە ناخیاندا هەیە پڕبکەنەوە. هی کەسانێکی نەدیوبدییە ئەوانەی ئەسڵ و فەسڵیان ونە. ئەرێ، باوانی منیش هەڵوولْ بوون زۆریان کار کرد و زۆریشیان زەحمەت کێشاوە، دواتر بیریان کردوەتەوە و تێگەیشتوون، ئیدی چەند ساتێکیان بە تەمەڵی گووزەراندوە. - بۆشاییەکەی ناخیان پڕ بۆتەوە، هەرچی میراتی تەمەڵیشیان هەیە هەر هەموویان بەمن بەخشی. - من شانازییەک بە باوانمەوە ناکەم، سەرەڕای ئەوەش لەم مەملەکەتە وەکو شوێنەکانی تر چیناتەتی تێدا نییە، هەر کام لەو دەوڵەت و مەملەکەتانە بە دروستی شیانبکەینەوە دوو و سێ پشت لەمەوبەر یان دز بوون یان چەتە و ڕێگر یان سەڕاف یانیش گەپچاڕی دەربار بوونە، ئەوجا گەر زۆر لە باوباپیرانمان بکۆڵینەوە ئەوە باوەگەورەی هەرکەسێ یان گۆریلا یان شەمپانزی دەرئـەچـێ. ئەمما ئـەوە کە هەیە، من بۆ کار نەخوڵقێندراوم. تەنیا کەسانی تازەکیسە و نوێگەرا ئەتوانن لەو پانتاییە خۆ نوێنی بکەن، کۆمەڵگایەکیان بەپێی سەلیقەی چاوچنۆکی و شەهۆتی خۆیان درووستکردووە، هەتا لە بچووکترین ئەرکەکانی ژیاندا ئەبێ یاساجەبرییەکان و کۆیلایەتییان وەک حەبی کەبسوول قووت بدەی! ئەو یەخسیرییەی ناویان لێناوە (کار) و ئەبێ هەرکێ مافی ژیانی خۆی لەوان سواڵبکات! لەم پانتاییەی تەنیا دەستەیەک دز، گەمژەی بێشەرم و نەخۆش مافی ژیانیان هەیە. ئەگەریش کەسێ دز و خوێری و ماستاوچی نەبێ ئەڵێین: ((شایەنی ئەوە نییە بژێ)). ئەوان ناتوانن تێبگەن! لەو ئازارانەی هەمبووە، لەو بارە میراتییەی کە لەژێریدا چەمابوومەوە. ماندووی باوانم لە مندا مابوونەوە و لە ناخمدا هەستم بە نۆستالۆژییای ئەم ڕابردووە ئەکرد.

((ئەمویست وەک ئاژەڵێکی زستانی سەر بە کۆنێدا بکەم، لە نێو تاریکی خۆمدا ڕۆبچم و ڕاستگاری بدۆزمەوە. هەر وەک چۆن لە تاریکخانە وێنە لەسەر شووشە دەرئـەکـەوێـت. ئـەو شتانەی لە مرۆڤدا ناسک و نادیارە لەئەنجامی ڕاکـەڕاکـەی ژیـان و جاروجەنجاڵی ڕۆشنایی ئەخنکێن و ئەمرن، تەنیا لەنێو تاریکی و بێدەنگیدا لەتەک مرۆڤ دەرئەکەوێ.

- ئەم تاریکییە لە خۆمدا بوو، بێخود هەوڵم ئەدا بەرزی بکەمەوە. تەنیا داخم ئەوەیە بۆچی ماوەیەک لەخۆڕایی پەیڕەویم لە ئەوانی تر کردووە. ئێستە پەییم بەوە بردووە کە بەنرخترین بەشی من ئەم تاریکی و ئەم بێدەنگییە بووە. ئەم تاریکییە لە سروشتی گشت ڕۆح لەبەرێکدا هەیە، بەڵام تەنیا لە گۆشەگیری و گەڕانەوە بەرەو خۆمان ئەو وەختەی لە دونیای ڕواڵەتی دوورئەکەوینەوە خۆیمان پیشان ئەدا.- وەلێ خەڵکی هەردەم هەوڵی ئەو ئەدەن لەم

گۆشەگیرییەو ئەم تاریکییە هەڵبێن، گوێی خۆیان لەبەرامبەر دەنگی مەرگ دابخەن. کەسایەتی خۆیان لەنێو جاروجەنجاڵ و هاتوهاواری ژیان لەبەین بەرن! بە قەولی سوفییەکان: «ڕۆشنایی هەقیقەت لەمندا جیلۆوە بکا» بە پێچەوانەوە چاوەڕوانی دابەزینی ئەهریمەن ئەکەم، ئەمەوێ هەر وەک ئەوەی هەم لەخۆمدا بەئاگا بێمەوە. من لەو دەستەواژە بریقەدارە بێ ناوەڕۆکەی ڕۆشنبیران مچوورکە بە گیانم دادێ، نامەوێ خۆم بدۆڕێنم بۆ پێداویستییە گڵاوەکانی ئەم ژیانە کە بەپێی ئارەزووی دزگەلێک و قاچاخچیگەلێک و بوونەوەرگەلێکی زێڕپەرست و گەمژە درووست بووە و بەڕێوەدەبرێ))

( (تەنیا لەم ژوورەدا ئەتوانم لە خۆمدا بژیم، هێز و توانام بە فیرۆ نەڕوات، ئەم تاریکییە و ئەم ڕۆشناییە سووره پێویستە بۆم، ناتوانم لە ژوورێکدا دانیشم کە لە پشت سەرمەوە پەنجەرەی هەبێ، وەک ئەوە وایە بیرکردنەوەم پەرت و بڵاوبێتەوە، حەز لە ڕۆشنایی ناکەم. - لەبەردەمی خۆردا هەموو شتێ جوان و ئاسایی دەرئەکەوێ، ترس و تاریکی سەرچاوەی جوانین: لە بەردەم ڕووناکی ڕۆژدا پشیلەیەک ئاسایی دێتەبەرچاو، ئەمما بە شەو لە تاریکدا چاوەکانی ئەدرۆشێنەوە و مووەکانی ئەتروسکێمەوە و جووڵەکانی ئەفسووناوی ئەبێ. بنچەگوڵێک کە بە ڕۆژ بێخوڵکە و داویی جاڵجاڵۆکەی تێئاڵاوە، بە



شەو وەک ئەوەی نهێنییەکان بەدەورییەوە شەپۆل ئەدەنەوە و مانایەکی تایبەت بە خۆی ئەدا. ڕۆشنایی هەموو ڕۆحلەبەرەکان بەئاگائەهێنێ و هۆشیاریان ئەکا - کەچی لەتاریکی شەوانەدا کە هەر ژیانێ، هەر شتێکی ئاسایی بەحاڵەتێکی ئەفسووناوییەوە دەرئەوکەوێ. تەواوی ترسە بزربووەکان بەئاگادێنەوە لە تاریکدا مرۆڤ ئەخەوێ بەڵام ئەبیستێ، خودی کەسەکە بە ئاگایە ئا لەو کاتەوە ژیانی ڕاستەقینە دەست پێئەکات. مرۆڤ لەپێداویستە هیچوپووچەکانی ژیان بێنیازە و بە جیهانە مەعنەوییەکەدا گوزەر ئەکا، ئەو شتانەی هەرگیز پەی پێیان نەبردووە دێتەوەیادی...))

پاش ئەم وتارە پڕاوپڕەی، لەناکاودا بێدەنگ بوو. وەک ئەوەی هەموو مەبەستی لەم قسانە بێگوناح دەرخستنی خۆی بوو. ئایا ئەم بابایە بەگزادەیەکی لە ژیان بێزار و ماندوو بوو، یان نەخۆشییەکی سەیروسەمەرەی هەبوو؟ بەهەرحاڵ وەکو خەڵکی ئاسایی بیری نەئەکردەوە. من نەمئەزانی چی وەڵام بدەمەوە! ڕووخسای حاڵەتێکی سەیری بە خۆوەگرتبوو، ئەو خەتەی بە تەنیشت لێوییەوە تێئەپەڕی قووڵتر و ڕەقتر ئەینواند، دەمارێکی شین لەسەر توێڵی زەقتر دەرکەوتبوو. کاتێ قسەی ئەکرد* چارەوزەکانی لووتی ئەلەرزان، ڕەنگ پەڕیوییەکەی لەبەردەم ڕۆشناییە سوورەکەدا حاڵەتێکی ماندوو و خەمینی بە ڕووخساری ئەبەخشی، بەسەرێک ئەچوو لەمۆم دروستیانکردبێ، لەگەڵ ئەو شێوەی من لە ئۆتۆمبێلەکەدا بینیبووم ناچوونیەک ئەهاتەبەرچاو. لەو کاتەدا کە سەری دائەنەواند بزەیەکی کورت دەکەوتە سەر لێوی. دواتر وەک ئەوەی لەناکاودا تێگەیشتبێ بە نیگایەکی سەخڵەت و گاڵتەجاڕانە کە تا ئەو کات هاوشێوەیەم لای نەبینیی بوو ، وتی : (( تۆ ڕێبواری و ماندوو، منیش هەر باسی خۆم کرد!))

((هەرکەسێ هەرچی ئەڵێ مەبەستی خۆیەتی. تەنیا هەقیقەتێک بۆ هەر کەسێ لەئارادابێ هەر خودی خۆیەتی، هەموومان بێئیرادە قسە لەسەر خۆمان ئەکەین، هەتا لە بابەتە دەرەکییەکان هەست و تێبینییەکانی خۆمان بە زمانی کەسێکی تر ئەگێڕینەوە. دژوارترین کار ئەوەیە کەسێ بتوانێ ڕاستگۆیانە باس لە خۆی بکات))

لە وەڵامەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە، چونکە زۆر بێمانا و ناڕێک و لە ناوەختدا بوو. دیار نەبوو ئەمویست چ شتێک بسەلمێنم. وەک بڵێی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تاقە مەبەستم * مەرایی بوو بۆ خانەخوێیەکەم. وەلێ ئەو بێ ئەوەی بایەخ بەقسەکانم بدا، بۆ چەن چرکەیەک بە نێگا ئازاراوییەکەیەوە تەماشایکردم. دیسان پێڵوەکانی داکەوتن، زمانی بەسەر لێویدا ئەهێنا وەک بڵێی هەر ئاگای لەمن نەبێ و لە دنیایەکی تردا بژێ. وتی:

(( من هەمیشە ئارەزووم ئەکرد شوێنێکی ئاسوودە، بەپێی سەلیقە و ئارەزووی خۆم سازبکەم. ئاخر ئەو ژوور و جێگایانەی ئەوانی تر دروستیانکردبوو بە کەڵکی من نەئەهات. من ئەمویست لەنێو خۆم لە خۆمدا بم، هەر بۆیە هەموو سەروەتی خۆمم کردە پارەی نەختینە. هاتمە ئەم ناوچەیە و بە زەوق و سەلیقەی خۆم ئەم ژوورەم دروستکرد. هەموو ئەم پەردە مەخمەڵیانەم لەگەڵ خۆمدا هێنا، خۆم گرنگیم بە تەواوی وردەکارییەکان داوە. تەنیا ئابازۆرە سوورەکەم بیرچووبوو، ئەویش پاش ئەوەی نەخشە و ئەندازەکەیم دا تا لە تاران بۆمی دروستبکەن، ئەمڕۆ پێم گەیشت. ئەگینا هەر حەز ناکەن لە ژوورەکەی خۆم بێمە دەرەوە یان تێکەڵاوی

کەسێ بم. تەنانەت خواردنی خۆمم بەس لە شیردا چڕکردووەتەوە بۆ ئەوەی لەهەر دۆخێکدا بێ بە دانیشتن یان پاڵکەوتن بتوانم بیخۆمەوە و پێویستم بەلێنانی چێشت نەبێ. وەلێ پەیمانم بەخۆم داوە هەر ڕۆژێک گیرفانم بەتاڵ بوو یا پێویستم بە کەسێکی تر بوو، ئەوە کۆتایی بە ژیانی خۆم بێنم. ئەمشەو یەکەم شەوە لە ژوورەکەی خۆمدا ئەخەوم، من کەسێکی بەختەوەرم کە بە ئارەزووی خۆم گەیشتووم. کەسێکی بەختەوەر! وێناکردنی چەند زەحمەتە، من هیچ کات نەمئەتوانی وێنای بکەم، ئەمما ئێستە کەسێکی بەختەوەرەم!
دووبــارە بێدەنگ بــوو، منیش بۆ شکاندی ئەو بێدەنگییە وتم: ((ئەو حاڵەتەی تۆ بۆی ئەگەڕێی، حاڵەتی کورپەلەیە لە ڕەحمی دایکیدا، کە بەبێ ڕاکەڕاک و کێشمەکێش و مەرایی لەنێو دیوارێکی سـووری گـەرم و نـەرمـدا خـۆی خـڕکـردووەتـەوە، بەهێواشی خوێنی دایکی ئەمژێ و هەموو خواست و پێویستییەکانی دێتەدی. ئەمە هەمان نۆستالۆژیای بەهەشتی بزربووە ئـەوەی لە ناخی وجـودی هەر مرۆڤێکدا هەیە، مروڤ لە خۆیدا و بۆ خۆی دەژی، ڕەنگە جۆرە مەرگێکی خۆویستانە بێ؟))
وەک بڵێی چـاوەڕوانــی نەئەکرد کەسێ خۆی هەڵقورتێنێتە نێو ئەو قسانەی لەگەڵ خویدا ئەیکرد، بەنیگایەکی گاڵتەجاڕانەوە تەماشای کردم و وتی : ((جەنابت ڕێبواری و ماندوو، فەرموو ئیسراحەتی خۆت وەربگرە!)) چرایەکەی هەڵگرت و تا لای داڵانەکە ڕێنوێنی کردم، ئەو ژوورەی کە یەکەم جار لێیهاتبووینە ژوورەوە پیشانی دام. نیوە شەو تێپەڕیبوو، هەناسەیەکی تازەم لە هەوایکی ئازادا هەڵمژی، وەک ئەوە وابوو لە ژێرزەوییەکی ناخۆش هاتبێتمە دەرەوە، ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە ئەدرەوشانەوە، بە خۆمم وت ئایا لەگەڵ کەسێکی دێوانە و ڕاڕا سەروکارەم هەیە یان مرۆڤێکی زۆر تایبەت.

.......................................... . . . . .
..................................

سبەی، دوو کاتژمێر مابوو بۆ نیوەڕۆ بەخەبەر هاتم. وەک ئـەوەی کەسێکی نامەحرەم بم و پێ بنێمە نێو پەرستگەیەکی پیرۆزەوە بەهێواشی تاکو دەمی داڵانەکە چووم و لەسەرخۆ لە دەرگام دا تا ماڵئاوایی خانەخوێیەکم بکەم. داڵانەکە کپ و تاریک بوو، بەماتەمات چوومە ژوورە تایبەتەکەوە، هێشتا چرایەکە لەسەر مێزەکە ئەسووتا، خانەخوێیەکم دی هەر بەو بیژامە سوورکاڵەوە، لەسەر تەختەکەی پاڵکەوتوە. هەردوو دەستی لەپێش ڕووخساری داناوە و پێیەکانیشی بەلای سکییەوە لوول کردوە، شێوەی کۆرپەلەیەکی نێو منداڵدانی دایکی بەخۆوە گرتووە. لێی نزیک بوومەوە و شانیم گرت و دامتەکاند، بەڵام هەر بەو حاڵەتەی خۆیەوە ڕەقی بردبووەوە. تۆقاو لەو ژوورە هاتمە دەرەوە و بـەرەو گـەراژ چووم. چونکە نەمئەویست ئۆتۆمبێلەکەم لەدەست بچێ. ئایا بە قەولی خۆی گیرفانی بەبن گەیشتبوو؟ یان ئەو تەنیاییەی کە خۆی مەدحی ئەکرد ترساندبووی و ئەیویست لانی کەم دوا شەو کەسێکی بەدەورەوە بێ؟ پاش هەموو قسەکان، لەوانەیە ئەم بابایە بەختەوەرێکی ڕاستەقینە بووبێ و خواستی بووبێت ئەم بەختەوەرییە بۆ هەمیشە لای خۆی هەڵبگرێ، ژوورەکەیش ژووری دڵخوازی ئەو بووبێ!
کوتایی...

سەرچاوە: www.sokhan.com

باوکم مرد بەڵام بیف ستروگانفی نەخوارد. فیله مینونی نەخوارد. نانی پاپادامی نەخوارد. ئیگ بروگر و مریشکی کنتاکی نەخوارد. لچی له پیتزا نەدا و هەرگیز تێنەگەیشت لابستر و ڕۆست بیف چییە. باوکم مرد بەڵام هەرگیز مەشروبی نەخوارد. لێوی له جگەرە نەدا. تەنانەت ناوی ماریجواناشی نەبیستبوو. باوکم حەفتا ساڵ ژیا، بەڵام ڕێستورانتی چێڵسی نەبینی. نەیبینی که له ڕێستوڕانتی گۆڵدن فود چۆن گەڵای کاهوو ورد دەکەن. نەیبینی چۆن تەماتەکان لەتوکوت دەکەن. مرد و نەیبینی چۆن گارسۆنەکان پاشماوەی خۆراکەکان دەڕژنە سەتڵە خۆڵەکانەوە. باوکم مرد بەڵام قەت میوەی پێش خواردنەکەی کافه گلاسه و کرێمی کارامل نەبوو، دوو دەنک خورمابوو.

*

باوکم له مـرادآوا له دایک بوو. له مـراداواش مرد. بەڵام هەرگیز نایت کلاَبی نەبینی. نەیبینی چۆن له سەماخانەکان دیسکۆلایتەکان سەمای ڕووناکی دەکەن و پیاوان و ژنان تێکدەئاڵێن. باوکم مرد و پانتۆڵی سێ چارەکی ژنانەی نەبینی. گڵۆپی سووری نووستنی نەبینی. مرد و چاوی به پەردەی سینەما نەکەوت. ڤیدیۆی نەبینی. سەیری کۆنسێرتی مایکڵ جاکسۆنی نەکرد. بۆ ئەوەی باران ببارێت باوکم هەمیشه چاوی بۆ ئاسمان هەڵبڕی بوو. دواتریش که دەباری هەمیشه له زەوی وردەبۆوە، تا سەوزە گیا سەر دەربکات.

*

باوکم مرد بێئەوەی دەنگی شەهرام و فری بژنەوێ. مرد و له جیاوازی کەمانچە و گیتار حاڵی نەبوو. تەنانەت ساکسیفۆنیشی به چاو نەبینی. باوکم هەمیشه بەیانیان به دەنگی کەڵەشێر خەبەری دەبـۆوە و نیوەڕوان به دەنگی بانگی ڕادیۆ بچووکەکەی، له ناوەڕاستی شەقامەکەدا نوێژی دادەبـەست. باوکم بۆینباخ و قردێلەی نەدەبەست. فراکی نەدەپۆشی. کۆڵۆنیای بەکار نەدەهێنا، بەڵام هەمیشه چڵە نێرگزێکی کێوی له بەرماڵەکەیدا بوو که له کاتی کڕنووشدا به بۆنەکەی مەست دەبـوو. ڕەنگە بەهۆی ئەمەوە بووبێت که هەمیشه کڕنووشەکانی دوور و درێژ دەکردەوە.

*

باوکم شتێکی زۆری له دنیا نەدەزانی. سواری پاجیرۆ نەببوو. نەیدەزانی شۆفێری به کاتلاس سۆپریم سیرا چه لەزەتێکی هەیە. کامارو و کورڤیتی نەبینیبوو. نەیدەزانی کلاردەشت له کوێیە، ڤیلا یانی چی. باوکم نەیدەزانی قەڵەملێو چییە، یا بۆچی ڕیمێل له برژانگ دەدەن. ساڵانێک ژیا، بەڵام نەیدەزانی ئەسیتۆن به کەڵکی چیدێت. بۆیەی نینۆک و لەفکردنی قژ چییە. کورتاژ یەعنی چی.

*

لەبەردەم سینەمای شاری چیرۆکدا عاشقی مەهتاب بووم. کتوپڕ وەکبڵێی شتێک له مندا ڕۆچوو. ڕۆحەکانی ئێمه وەک لاولاو تێک ئاڵاو گرێدرا. مەهتاب وەک خۆرێک له مندا درەوشایەوە، وەک تۆفان بەسەر مندا هەڵیکرد تا ئەوێ که ساکسیفۆن و پاجیرۆ و کورتاژ و ڕۆستی بیف و نایت کلاَب و گۆڵدن فودز وەک گەڵای وشکەوە بوو لەسەر ڕووی ڕۆحی من ڕوان و ڕۆحی من وەک ئاوێنەیەک بریقایەوە. پاشان مەهتاب وەک کۆترێک هێلانەی بەسەر ڕۆحی منەوە کرد. هێلانەی کرد. له مندا گۆرانی وت. له مندا قیژاندی. له مندا هەڵیواسی. ڕووا. پێکەنی. نووست. ئاخ! مەهتاب له مندا باریی. چرپاندی. گریا. له مندا توند بوو. له مندا وەستا. له مندا جێگیر بوو. به سەر مندا لەرزی تا ڕۆحەکانی ئێمه وەک بازنەی هاوسەنتەر و هاو ئەندازە وەک یەکیان لێهات. به جۆرێک که من خۆمم لەو بۆ نەناسرایەوە. به جۆرێک که من ئالوودەی مەهتاب بووم و مەهتاب وەک چوارچێوەی وێنه درا له سەر دیواری ڕۆحی من. عەتری ڕۆحی ئەو، به جۆرێک ڕۆحی منی مەست کرد، من تووشی سەرەگێژە بووم.

*

له مـراداوا کاتێک به باوکم وت عاشق بووم، هیچی نەوت. کاتێک وردەکاری ڕۆحی مەهتابم بۆ ئەو ڕاڤەکرد،

هیچی نەوت. کاتێک وتم مەهتاب لە سۆسەنی کچی کاک عەباسیش جوانترە، وتی: (مەگەر کاک عەباس کچی هەیە؟) باوکم قەت عاشق نەبوو. تەنانەت عاشقی دایکیشم نەبوو، بەڵام ئەوی خۆشدەویست. زۆری خۆشدەویست. کاتێک دایکم دەچوو بۆ ماڵی عالییە خانم بۆ ڕەوزە خوێندن، باوکم وەک چۆلەکەیەک کە گوللەیان بە بێچووەکەیەوە نابێت، باڵەفرەی دەکرد. لە نێو ژوورەکاندا پیاسەی دەکرد و حەجمینی نەمابوو تا دایکم بگەڕێتەوە.

*

کاتێک گەڕامەوە مەهتاب لەبەر سینەماکەدا نەبوو. چما وەک تا کە لە جەستە هەڵبێت یا وەک نەخۆشییەک لە گیان هەڵکەندرێ، بێدەنگ لە من هەڵاتبوو. یا لەوەیە ونبووبێت. بەڵام ئێستا جارجارێ دەنگی دەبیستم. جارجارێ بۆنی ئەو کە سەیر لە بۆنی نێرگزە کێویەکانی بەرماڵەکەی باوکم دەچێت، دەبیستم، بەڵام خۆی نابینم. جارجارێ ساتێک دێت و خولەکێک گڵۆپی ڕۆحی من هەڵدەکات و تا من بمەوێ بیبینم، ڕۆیشتووە و دووبارە ڕۆح تاریک.

ڕۆژێک بە باوکم وت وەکبڵێی مەهتاب بەرامبەر من وەستاوە، بەڵام نایبینم. وەکبڵێی بە مشت بە ڕۆحما دەکێشێ، بەڵام کاتێک دەرگا دەکەمەوە کەسی لێ نییە. چما چنگ لە قووڵایی گیانم دەگرێت، بەڵام هەر چەندێک چاوەڕێ دەکەم خۆی پیشان نادات. وەکبڵێی هەیە. وەکبڵێی نییە. جارجارێ چما ڕژاوەتە هەموو منەوە، بەڵام لە وردەکاری مندا نییە. جارجارێ وەکبڵێی لە وردەکاری مندا خورەی دێت، بەڵام لە گشتێتی مندا نادیارە. جارجارێ من لە ئامادەیی ئەودا لە خۆمدا گێژ دەبم. ئاخ جارجارێ چما ئەو منە، من ئەوم. باوکم وتی: (ڕێک وەک خوداوەند).

١

هەر سێکیان لە گۆڕستانێکی چەپەک لەسەر گۆڕێک دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. دوورتر گۆڕهەڵکەنەکە گۆڕێکی هەڵدەکەند. یونس و مەلول لە نوزەر ڕامابوون. نوزەر وتی: (مەلول وتوێتی تەواو گیرت خواردووە. وتوێتی خەریکە تیادەچێت. وتوێتی بە شوێن پارەدا دەگەڕێی. قبوڵمە. قبوڵمە ئەم ڕۆژانە پارە پەیدا کردن تۆزێک قورس بووە، بەڵام گەر تۆزێک جەربەزەییت هەبێت، دەتوانی خۆت قوتار بکەیت. تێدەگەیت چی دەڵێم؟ ئەم مەلولە دەبینی؟ سەرەتا نانێکی نەبوو، بەڵام ئێستا گاڵتەی بە شا دێت. لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی پارەی هەیە. هەموو ئەم گروپەی کە دەیبینی، دەزانی لەبەرچی لە کازیوەی بەیانییەوە تا تەنگی ئێوارە ڕادەکەن؟ لەبەر پارە. لەبەرئەوەی گەر پارەیان نەبێت ناتوانن هەنگاو هەڵبنین. لەوەوە بیگرە کە لە تەنیشت شەقامەکە پێڵاوی جەماعەت بۆیاخ دەکات تا ئەوەی کە تەلاری شەست نهۆم دەگەیەنێتە ئاسمان، هەموو بە شوێن شتێکەوەن: پارە. تێدەگەیت چی دەڵێم؟ مەبەستم ئەمەیە لە بەقاڵ و قەسابەوە بیگرە تا بازرگان و زەرەنگەر و دکتۆر و ئەندازیار تا فووتباڵیست و گۆرانی بێژ و ئەکتەر و مامۆستا و هونەرمەند و شۆفێر و قازیی و پاکەوان و سەرۆک و مردووشۆر، هەموو بە شوێن پارەدا دەگەڕێن. هەموو ئەم جەماعەتە جاشی ماکەرێکن. دڵی هەموویان شتێکی دەوێت: پارە! حاڵی هەی چی دەڵێم؟ هەموو کاروباری ئەم دنیا لەعنەتییە لەسەر پارە دەسووڕێ. ئەمە شتێک نییە من تازە دۆزیبێتمەوە. لە سەرەتای دنیاوە هەبووە و تا ڕۆژی هەستانەوەیش دەبێت. هەموو ئەم کۆمەڵەیش ئەمە دەزانن. هەرچەندە گەر لێیان بپرسی لەبەر چییە بەردەوام سەگ ڕاودەنێن، ئەشێ هەموو گاڵتەجارییەک بهۆننەوە، بەڵام ئەسڵەن ئەمە بایەخی نییە. مەبەستم ئەمەیە گاڵتەجارییەکانی ئەوانە هیچ ناگۆڕێت. ئەوانەی پارەیان هەیە هەوڵدەدەن زیاتری بکەن و ئەوانەیشی کە نیانە دەبێت بە شوێنیدا ڕابکەن. باشە هەڵبەتە هەندێکیش تەنها حەز دەکەن یاری بە

پارە بکەن، تەنانەت ئەگەر ئەم یارییە مەترسیداریش بێت. تێدەگەیت کە؟ بۆ نموونە مەلول جارێکیان لە یەکێک لەم یارییە مەترسیدارانەدا هەشتسەد دانەی دۆڕاند. وانییە مەلول؟)

مەلول وتی: (بەڵێ نوزەر خان دۆڕاندم، دۆڕاندم).

نـوزەر ساتێک بێدەنگ بـوو و لـە دوورەدەسـتـی گۆڕستانەکە ڕاما. جگە لەوان و گۆڕهەڵکەنەکە کەس لە گۆڕستانەکە نەبوو. جگەرەیەکی لە گیرفانی کراسەکەی دەرهێنا و گڕی دا. سەیری شاعیرەکەی کرد و پرسی: (وتت کارت چییە گیانە؟)

– قوربان شاعیرم.

لەگەڵ بیستنی ئەم وشەیە، نوزەر پێکەنی. مەلول بە دەسڕ ئارەقەی ناوچەوانی سڕی و وتی: (مەبەستی ئەمەیە، بەرلەوەی ڕووداوەکە بقەومێ شیعری دەنووسی و بە چاپکردنی کتێبەکانی پارەی پەیدا دەکرد. بەڵام ئێستا ئیدی بێکارە. لەبەرئەمەیشە خراپ کەوتۆتە تەنگژەوە. زۆرێک پشتگیرییان کردووە، نوزەر خان نهێنی پارێزە و متمانەی هەیە).

نوزەر ساتێک سەیری گۆڕهەڵکەنی کرد کە گۆڕەکەی تا نیوە هەڵکەندبوو.

– سەیرکە شاعیر، نە تۆ و نە هیچ کەسی دی تا شتەکان نەگۆڕن بۆ پارە، ناتوانن ئەوانە پێکەوە بەراورد بکەن. بۆ نموونە ناتوانن تێبگەن بەهای تەلەڤزیۆنێک پترە یان گایەک. مەبەستم ئەمەیە بۆ ئەوەی تێبگەیت ڕادیۆیەک بە نرخترە یا تایەیەکی ئۆتۆمبیل، هیچ ڕێگەیەکت نییە مەگەر ئەوەی کە هەر دووکیان بگۆڕیت بۆ پارە. تێدەگەیت چی دەڵێم کاکی شاعیر؟

– تێدەگەم قوربان.

– تێگەیشتنی کارێکی قورس نییە. بەڵام وابزانم زۆرێک لەمە تێناگەن. لەم دنیایەدا کەسێک براوەیە لەمە تێبگات. باش تێبگات. لە ساندویچێکەوە بیگرە تا قەڵەم جاف و گڵۆپ و جگەرە و جانتا و ڕۆژنامە و چەقۆ و فرۆکە و قاپ و حەبی ئسپرین و کتێب و پایسکیل و دەسڕی کلێنس و میوە و چاویلکە و کۆمپیوتەر و تەماتە و هەر شتێکی دی نرخێکی هەیە. تا نرخی ئەوانە نەزانی ناتوانی پێکەوە بەراوردیان بکەیت. بارودۆخەکە کاتێک قورستر دەبێت کە بتەوێ هەندێک لە شتەکان لەگەڵ هەندێک کار بەراورد بکەیت. جارجارێ چەند وشەیەک قسە کردن، لە گاگەلێک بە نرخترە. ئەشێ هەندێکیان بەهۆی بێدەنگیان بە هێندەی دە هەزار دانە ساندویچ پارە وەربگرن. هەندێکیان خەروارێک پارە وەردەگرن تا شتێک کە بینیویانە بڵێن نەمان بینیوە، تا قسەیەک کە نەیان بیستوە بڵێن بیستوومانە. هەندێک جار دەستەکان کارگەلێک ئەنجام دەدەن کە پارەیەکی زۆر لە پشتییەوە کەوتووە. تێدەگەیت چی دەڵێم؟ جارجارێ واژۆیەک نرخی شەست دانە ئامێری جلشۆردنی هەیە. ئەم کارە سادانەی کە ئێمە ڕۆژانە ئەنجامی دەدەین، ئەشێ جارجارێ نرخێکی زۆری هەبێت. باشە هەڵبەتە جارجارێ پێچەوانەکەیشی ڕوودەدات. مەبەستم ئەمەیە جارجارێ کەسێک شتێک کە دەبێت نکۆڵی لێبکات نایکات و ئەمەیش بۆ ئەو زۆر دەکەوێت. جارجارێ نابێت شتەکان ببینی. نابێت بیبیستی. نابێت بیڵێی. جارجارێ نابێت کەسێکت خۆشبوێ. تێدەگەیت چی دەڵێم کاکی شاعیر؟ مەلول! بە شاعیرت وت دەبێت چی بکات؟

– وتوومە قوربان. دوای ئەوەی بەهۆی چەند فلسە سوورێکەوە ئەو ڕووداوەی لێ قەوما، تەواو بارودۆخی تێکچووە. وتی ئامادەیە هەر کارێک بکات بە مەرجێک پارەیەکی باشی دەستبکەوێت. دەیەوێ بەم پارەیە بچێتە جێگەیەک کەس نەیناسێت. دەڵێ دەمەوێ سەری خۆم هەڵبگرم.

با لە گۆڕستانەوە دەهات و تەپ و تۆزی هەڵدەکرد. نـوزەر پاشماوەی جگەرەکەی بە کێڵی ئەو گۆڕە کوژاندەوە کە لایەوە دانیشتبوون. خۆڵەمێشی جگەرەکە شوێنەوارێکی ڕەشی لەسەر کێڵی گۆڕەکە بەجێهێشت. نوزەر لە چاوەکانی مەلول ڕاما.

- پەیوەندی بە ئێمەوە نییە شاعیر دەیـەوێ بەو پارەیەی دەستی دەکەوێت چی بکات. پەیوەندی بە کاکی شاعیریشەوە نییە کە کەی و بۆچی داوای ئەم کارەی کردووە. پەیوەندی بەو کەسەیشەوە نییە کە بۆ ئەم کارە پارە دەدات. سەد کەڕەتم وت هەر کەسێک کاری خۆی دەکات.

نوزەر ئەمجارە لە شاعیرەکە ڕاما. خولەکێک بێدەنگ بوو و پاشان وتی: (ئێرە باشترین جێگەیەکە کە دەکـرێ لە بـارەی کوشتنەوە قسە بکەیت، کاکی شاعیر! لەبەرئەوەی کە هیچ کەس دەنگت نابیستێت. مشتێک مردوو لێرە نووستوون و تەنها چاوەڕێن تا باقی خەڵکەکەیتر پەیوەندییان پێوە بکەن. هەر ئەمە. تەنانەت گەر شتێکیش بژنەون ناتوانن هیچ بە کەسێک بڵێن. بە کورتی کوشتن لەو کارانەیە کە پتر لە هەر کارێکی دی پارە دەدەن لە هەقیدا. لە هەموو دنیادا بەم شێوەیەیە. کاتێک کەسێک - بە بەڵگەیەک کە ئەسڵەن بۆ ئێمە گرنگ نییە - بیەوێ کەسێکی دی لەسەر ڕووی یارییەکە فڕێداتە دەرێ، دەبێت پارەیەکی زۆر خەرج بکات. مرۆڤەکان هەموو بە نۆرە دەگەنە ئەو سەری جادەی قیر و دەمرن. بەڵام گەر کەسێک بیەوێ زووتر کەسێکی دی بگەیەنێتە ئەو سەری جادەکە، دەبێت لە جادەی قەدبڕەوە بیبات. لە جادەی خۆڵەوە. تێدەگەیت چی دەڵێم کاکی شاعیر؟ هەندێک کەس کاتێک لە یارییەکدا لە دەست کەسێک ماندوو دەبن، حەز دەکەن ئەو کەسە لە یارییەکە فڕێدەنە دەرێ. لەبەرئەوەی کاتێک خەڵکانی یارییەکە کەمتر بن، ئەگەری بردنەوە زیاترە. وانییە مەلول؟)

- ئاشکرایە نوزەر خان، بەتایبەت گەر یارییەکە سێ کەسی بێت.

گۆڕهەڵکەن ڕۆچووبووە گۆڕەکەوە و تەنها هەر جارێک کە تۆپەڵێک خۆڵی لە ناو گۆڕەکەوە دەڕشتە دەرێ، دەمی بێڵەکەی لەبەر هەتاوەکە دەبریقایەوە. نوزەر دەستی بە کێلی ئـەو گـۆڕەدا هێنا کە لە سەری دانیشتبوو و بڕکە بڕکە وتی: (ڕۆژێک ئەم کێلی گۆڕە تەواو ساف بووە. هیچ شتێکی لە سەر هەڵنەکۆڵرابوو. ئەوسا هیچ کەس نەیزانیوە بڕیارە ناوی کێ لە سەر ئەم بەردە بنووسن. ئێستایش زۆر بەردیتر چاوەڕێن ناوی کەسێکیان لە سەر بنووسرێت).

نوزەر کتوپڕ چاوی لەسەر کێلەکە هەڵگرت و لە ناو چاوی یونس ڕاما.

- باشە ئیدی، ئێمە یارییەکی سێ کەسیمان هەیە کاکی شاعیر! یەکێک لەم ناوەدا زیادەیە. دەبێت لە جادەی خۆڵەوە بیبەیت. پێتوایە دەرەقەتی دێیت؟

- دەتوانم نوزەر خان.

- باشە، بەڵام گەر نەتوانی دەزانی چی دەقەومێت؟

- مەلول وتوێتی چی دەبێت.

- مەلول دووبارە پێی بڵێ چی دەبێت.

مەلول چەقۆکەی لە ژێر کراسەکەیەوە دەرهێنا و پیشانی یونسی دا.

- هەر بەم چەقۆیە لەسەر ڕووی یارییەکە فڕێتدەدەمە دەرێ.

نـوزەر وتــی: (ئێستا ئیدی تۆ زۆر شت دەزانــی کاکی شاعیر! نیوەی ڕێگەکە هاتووی. ئیدی ناتوانی بگەڕێیتەوە).

- نامەوێ بگەڕێمەوە قوربان.

- خۆڵاسە لە کاری ئێمەدا دوو پرسیار تەرکە. بۆچی یارۆ دەبێت لە یارییەکە بچێتە دەرێ؟ کێ دەیەوێ یارۆ لە یارییەکەدا نەبێت؟ ئەم دوو دانە پرسیارە پەیوەندی بە هیچ یەک لە ئێمەوە نییە. تاقە شتێک کە پەیوەستە بە تۆوە ئەمەیە هەفتسەد و پەنجا لە بری وەردەگریت. نیوەی لە سەرەتاوە و باقییەکەیشی بۆ دوای کارەکە.

مەلول لە کراسەکەیدا چەند بەستە پارەیەکی کاغەزی دەرهێنا و لەبەردەم یونسدا، لەسەر کێلی گۆڕەکە دایینا. وتی: (یارۆ خوێندکاری کۆلێژی فەلسەفەیە. ناوی لەعنەتی یوسفە. دوانیوەڕۆیان لە کتێبفرۆشی لادن کار دەکات).

وێنەکەی یوسفی لە گیرفانی کراسەکەی دەرهێنا و خستییە سەر کێڵەکەی بەردەم یونس.
- دوو هەفتە، دەبێت تا دوو هەفتەی دی کارەکە تەواو بووبێت. دوو هەفتەی دی هەر لێرە باقی پارەکەت وەردەگریت.
دەنگی فڕۆکەیەک ئاڵایە گۆڕستانەکەوە. نوزەر لەگەڵ دەنگی فڕۆکەکە چاوی بڕییە ئاسمان. یەک پارچە سپی بوو و تەنانەت پەڵە هەورێکی پێوە نەدەبینرا. نوزەر سەیری ئاسمانی کرد و بە خۆی وت: (لامەزهەبە نیازی بارینی نییە).

٢

کتێبفرۆشی لادن لە کۆڵانێکی چەپەک و دووردا بوو. لە کتێبفرۆشییەکەدا، یونس سەیری گەنجێکی کرد کە دەسڕی بە شووشەی مێزەکەیدا دەهێنا و پاشان وێنەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لێی ڕاما. دووبارە سەیری گەنجەکەی کرد تا دڵنیا بێت ئەو کەسەی دەسڕ بە مێزەکەدا دەهێنێ، یوسفە. خۆرئاوا بوو و خێرا دنیا تاریک دەبوو. یوسف شووشەکەی خاوێن کـردەوە، لە پشت مێزەکەوە، لە سەر کورسییەکە دانیشت و کتێبێکی شیعری کردەوە. جگە لەوان کەس لە کتێبفرۆشییەکە نەبوو. یونس ساتێک سەیری بەرگی کتێبەکەی کرد و پاشان بە دەنگی بەرز لەبەر شیعرێکی لە کتێبەکەدا خوێندەوە:

(هەتاوم خۆشدەوێ
بەخاتری کراسەکەت لەسەر تەنافەکە
بارانیش
گەر دەبارییە سەر چەترە شینەکەی تۆ و
لەبەرئەوەی تۆ نوێژت کردووە بوومەتە خودا پەرست)

یوسف سەری لە سەر کتێبەکە هەڵبڕی و بۆ یونس پێکەنی.
- تۆیش ئەهلی شیعری قوربان؟
چاوی یونس پتر لە سەر ڕەفەی کتێبەکان بوو تا یوسف. وتی: (جارجارێ چاو بە کۆمەڵە شیعرێکدا دەخشێنم).
- من عاشقی شیعرم، بە تایبەت شیعری نوێ.



یونس کتێبێکی لە ڕەفەکە دەرهێنا، بەڵام خێرا خستییەوە شوێنی خۆی. بە درۆوە وتی: (من پتر حەزم لە فەلسەفەیە تا شیعر).
یوسف وتی: (بەڕاست؟ من لە زانکۆ فەلسەفە دەخوێنم).
- فەلسەفە؟ ئەی لێرە چی دەکەیت؟
- دوانیوەڕوان لێرە کار دەکەم، قوربان.
یۆنس سەیری دەرەوەی کرد. با کە لە کۆڵانەکەوە کوتە کاغەزێکی بردبوو. وتی: (مەودای نێوان فەلسەفە و شیعر زۆر زۆرە).
- هەندێکجار لە فەلسەفەیشدا شیعرگەلی ناسک هەیە. وەک ئەم پەیڤەی کە دەڵێ خوداوەند لە دەرکەوتنی زۆریدا شاراوەیە. لە ڕاستیدا مانای ئەم قسەیە ئەمەیە خوداوەند ئەوەندە هەیە، وەکبڵێی نییە. ئەوەندە ئامادەیی هەیە چما پێوارە. ئەسڵەن پێوارییەکەی بە بەڵگەی گەورەییەکەیەتی. دەڵێن خوداوەند وەک دەنگێک وایە کە لە سەرەتای خوڵقانییەوە تا کۆتاییەکەی بە ڕیتمێک بەردەوام لە بووندا دەژەندرێت. دەنگێکە تا نەبڕێتەوە کەس ناتوانێ بیبیستێت. لە ڕاستیدا بەردەوامیی دەنگەکە هۆیەکە بۆ نەبیستنی. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەبێت کە ئێمە ناتوانین درک بە خوداوەند بکەین. بە بۆچوونی من ئەمە خەیاڵاویترین شیعرە کە مرۆڤ بە درێژایی مێژوو نووسیوێتی.
یونس دووبارە لە ڕەفەی کتێبەکان ڕاما. وتی: (خۆ بێزارت ناکەم؟)
یوسف تەپڵەکێکی هێنایە پێشەوە.
- هەرگیز، تکایە دابنیشە. زۆر دەمێکە حەزم دەکرد لەگەڵ کەسێکدا لە بارەی شیعرەوە گفتوگۆیەک بکەم.
یونس دەستی کرد بە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا تا دەست لەو چەقۆیە بدات کە لە گیرفانیدا شاردبوویەوە، بەڵام هەر کە چاوی بە یەکێک لە کتێبەکانی خۆی کەوت، دەستی لە گیرفانی دەرهێنا تا لە پەنا کتێبەکانی دییەوە دەریبهێنێت. کتێبەکە، کۆمەڵە شیعرێک بوو بە ناوی هەوڵدان لەسەر خولگەی خەفەت کە ئەو شیعرە ئەویندارییانە بوون لە ستایش و پەسنی سایەی ژنیدا.
کتێبەکەی لەسەر مێزەکە دانا و لە سەر تەپڵەکەکە دانیشت.
یوسف وتی: (شیعرێکی ئەڤیندارانە لەم کتێبەدا هەیە زۆر جوانە. لەوەیە ئەم شیعرە "لە چاوەکانتدا مەلە دەکەم و لە دەستەکانتدا دەمرم" بێت. من ئەم شیعرەم چەندین جار خوێندۆتەوە و تەنانەت ڕۆژی لە دایکوونی نیلۆفەر- دەزگیرانەکەم دەڵێم- لە سەر کارتێکی پیرۆزبایی نووسیم و پێشکەشم کرد. زۆر کەیفی پێیهاتبوو).
یوسف خێرا خێرا پەڕەی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە تا شیعرەکەی دۆزییەوە. پرسی: (تۆ پێشتر ئەم کتێبەت بینیوە؟)
- بەڵێ، بینیومە. پێموایە کاتێک شاعیرەکەی خەریکبووە ئەم شیعرە بنووسێت، تەواو عاشق بووە. بە بۆچوونی تۆ دەکرێ کەسێک عاشق نەبێت و شیعری عاشقانە بنووسێت؟
- ڕاستییەکەی من پێموایە گەر خوێنەرییش عاشق نەبێت، ناتوانێ لە قووڵی شیعری عاشقانە تێبگات.
- بە بۆچوونی من کارێکی درێو و بێمانایە.
- مەبەستت خوێندنەوەی شیعرە؟
- نا، مەبەستم شیعر نووسینە. مەبەستم ئەوەیە کاتێک لە بەیانییەوە تا شەو بڕیارە لە دنیایەکی ئاوا گەورەدا هەزاران گەندەڵی و توندوتیژی هەبێت، بەڕاستی شیعر نووسین کارێکی بێهوودەیە. واتا کارێکی گەمژانەیە. لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە هەندێک کەس بە هۆی هەژاری و نەگبەتییەوە منداڵەکانی خۆیان بە نرخی سەد دۆلار بە دەڵاڵەکان دەفرۆشن تا ئەوان هەر بەڵایەکیان حەز لێیە بە سەر منداڵەکانیا بهێنن. کارێک کە هیچ ئاژەڵێک لەگەڵ بێچووەکەی نایکات. وابزانم ئەگەر ڕۆژانە هەزاران دانە لەم شیعرە ئەڤینداریانەیش بنووسرێت، تەنانەت ناتوانێ بەر لە یەکێک لەم تاوانانە بگرێت. هەموو ڕۆژێک هەزاران کەس لە توندی هەژاری

و برسێتی یا دەمـرن یا گەندەڵ دەبـن و کەسیش کارێکی لە دەست نایەت. هەزاران مرۆڤ لە شەڕە بێ ئەنجامەکاندا دەکوژرێن و کەسیش ناپرسێ مەگەر ئێوە ژیانتان داوە بە وان تا بە ئاسانی لێیان وەردەگرنەوە؟ لەبەرئەمەیشە دەڵێم کارێکی بێهوودەیە. ڕۆژ بە ڕۆژیش خەریکە بارودۆخەکە خراپتر دەبێت.

– پێتوانییە برێک پتر لە ئەندازە ڕەش بینیت؟

لە دەرەوە دنیا تەواو تاریک بووبوو. یونس ئەمجارە لە سەر پانتۆڵەکەیەوە دەستی لە چەقۆکەی گیرفانیدا. وتی: (دوو هەفتە لەمەوبەر بوو لە ماڵەکەی خۆیدا گۆشاوگۆش قوڕگی ژنی یەکێک لە هاوڕێ شاعیرەکانمیان بڕی بۆ ملوانکەیەک. کاتێک کاکی شاعیر دەگاتەوە ماڵێ ژنەکەی لە حەوشەکەدا خەریکبووە لە خوێنی خۆیدا لنگە فرتێیەتی).

یونس چرکەساتێک بێدەنگ بوو تا ئەو ڕقەی ئەوکی گرتبوو بڕەوێتەوە. یوسف وتی: (بە داخم. بەڕاستی بە داخم. حەزم نەدەکرد بێتاقەتت بکەم، بەڵام پێتوانییە چاوەڕوانیت لە شیعر زۆرە؟)

– سێ مانگ بوو هاوسەرگیرییان کردبوو. شاعیرەکە شێتئاسا سایەی خۆشدەویست. دەیوت سایە چاوەی لە بن نەهاتووی هەموو سروشە شاعیرانەکەی ئەوە. دەیوت جگە لە شیعر نەیتوانیوە پەسنی سایە بە شتێکی دی بکات. دەیوت چەندین کاتژمێر سەیری ئەوی کردووە و وەکبڵێی ئەو سروشی بداتێ لە پەسنی ئەودا شیعری نووسیوە و لەبەرئەمەیش نەیتوانیوە زۆرێک لە شیعرەکانی بنووسێت. جارێک بە منی وت ئەوەندە سایەی خۆشدەوێ کە جارجارێ خۆیشی لەم هەموو خۆشویستنە دەترسێت. لە گەورەیی خۆشویستن ترسابوو. تێدەگەیت؟ ترسابوو! دەیوت پێیباشە لەبری دەستگرتنی، چەندین کاژمێر لە دەستەکانی ڕابمێنێ. ئەمە نامۆترین عەشقێک بووە کە من بینیبووم. بزانم، وتت دەزگیرانت هەیە؟

– بەڵێ، قوربان. بەڵام کەسێکی دیش هاتۆتە خوازبێنی. یارۆ خەریکی کاری هەناردەکردنە. بەڵام نیلۆفەر منی خۆشدەوێت. خۆی چەندین جار ئەمەی پێوتووم. بەڕاستی ئەو بارودۆخی هاوڕێ شاعیرەتان چۆنە؟

– ماوەیەکی زۆرە هەواڵم لێی نییە. وابزانم تەواو بارودۆخی تێکچووە. ئیدی حاڵی لە هەرچی شیعر و شاعیرییە تێکدەچێت. دکتۆرەکان دەڵێن پاش کوژرانی سایە هاوسەنگی لە دەستداوە. خۆی دەڵێ بە سایەوە هەڵواسرابووم و ئێستا ئیدی بە هیچ جێکەوە هەڵنەواسراوم. دەیوت چما خوداوەندیان کوشتووم. وابزانم گەیشتۆتە ئەو سەری هێڵەکە. لەعنەت لە شیعر کە ناتوانێ هیچ هەڵەیەک بکات. تەنانەت شاعیر ناتوانێ خۆیشی قوتار بکات.

یونس لە سەر تەپڵەکەکە هەستا و سەیری دەرەوەی کرد. ڕەشەباکە لە کۆڵانە تاریکەکەدا دەهات و پارچە کاغەزی بە دیوارەکەدا دەکێشا. وتی: (زۆر درەنگ بووە دەبێت بڕۆم).

تەلەفۆن زەنگی لێدا و یوسف بەلەز بیستەرەکەی هەڵگرت. نیلۆفەر بوو. یونس چەقۆکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لە دەستیدا شاردییەوە. بەرەو دەرگاکە چوو. کتێبە شیعرەکە هێشتا لە سەر شیعری لە چاوەکانتدا مەلە دەکەم و لە دەستەکانتدا دەمرم، لە سەر مێزەکە کرابۆوە. یونس لە ناو دەرگای کتێبفرۆشییەکە بەرامبەر دیوارەکە وەستا و چاوەڕێ ما تا یوسف بیستەرەکە دابنێت. دەمی چەقۆکە لە بەر ڕووناکییەک کە لە جامخانەی کتێبفرۆشییەکەوە دەیدا لە دەرەوە، لە دەستی یونسدا دەبریقایەوە. یونس لە دیوارە ڕەشەکەی بەرامبەری ڕامابوو و بیری لە دەنگێکی بێبڕانەوە دەکردەوە کە هەرگیز نەیدەتوانی بیبیستێت. یوسف لە بیستەری تەلەفۆنەکەدا بە ئەسپایی وتی: (منیش خۆشمدەوێی نیلۆفەر.) دوو دڵۆپە فرمێسک لە چاوانی یونسدا قەتیس مابوو، بەڵام نەدەڕژا.

سەرچاوە: نشر چشمە– چند روایت موعتەبەر

هەموو ڕۆژێـک لەبەر خۆمەوە دەڵێم: "ئیمڕۆ چیرۆکێک دەنووسم". بەڵام شەوێ، دوای شوشتنی قاپ و کەوچک، باوێشکێک دەدەم و دەڵێم سبەی حەتمەن دەینووسم.

قاپ و کەوچکی شەوم شتووە. ئاشپەزخانە خاوێن دەکەمەوە و ڕووبـەڕووی تەلەفیزیۆنەکە دادەنیشم. لەبەر خۆمەوە دەڵێم: "لە سەر کوتە کاغەزێک پوختەی ئەو چیرۆکەی وا لە زەینم دا گەڵاڵەم کردووە، لە چەند ڕستەیەک دا دەنووسم و کاغـەزەکـە بـە ئاوێنەی ڕووشـوویـیـەکـەوە دەچەسپێنم کە سبەینێ کاتی دەم و چاو شتن وەبیرم بێتەوە کە دەمـەوێ چیرۆک بنووسم. سبەینێ دوای ئەوەی فراوێنم دروست کرد، بەر لە هاتنەوەی منالان لە قوتابخانە و مێردەکەم لە دایرە، کاتێکی باشم هەیە بینووسم.

بۆ فراوێنی سبەینێ باینجان درووسـت دەکـەم و زۆرم کات ناگرێ. منداڵەکان پێیان خۆشە، بـەڵام مێردەکەم – دەتوانم قەلافەتی بێنمە بەرچاوم. سەری دادەخا و دەیخوا و بێ ئەوەی شتێک بڵێ، لە سەر میزەکە هەڵدەستێ.
–دەزانـم باینجانی پێخۆش نییە، بـەڵام بیانوو ناگرێ، پرتەوبۆڵەش ناکات. منیش دووسبەی ئەو چێشتەی پێیخۆشە بۆی لێدەنێم. دووسبەی دەچم سەوزەی تازە دەکڕم و خۆرشتی سەوزە لێدەنێم. دووسبەی چیرۆک نانووسم و کاتم هەیە سەوزە چاک کەم و بە سەر سەوزە فرۆشەکەشدا ببۆڵێنم کە بۆچی سەوزەکەی هەموو هەر قوڕ و خۆڵە، پاشان قاپشۆرییەکە پڕ دەکەم لە ئاو و سەوزییەکە دەخووسێنم. جارێکی دەشۆم و ئاوەکەی دەگۆڕم، دووجاری دەشۆم و ئاوەکەی دەگـۆڕم و سێ جار و چوار جار، جاری واشە حەوت هەشت جار. چاویلکەکەم لە چاو دەکەم و سەوزییەکە سەروژێر دەکەم کە قوڕاوی نەبێ و دواییش دەیجنم. ئەوجار ئاگاداری خۆم دەکەم دەستم نەبڕم. کاتی سەوزە چاک کردن هەمیشە دەستی خۆم دەبڕم. مێردەکەم پێدەکەنێ: "دوای پازدە ساڵ ماڵداری ئێستاش هەر ناشی؟"
بۆ خۆشم پێدەکەنم. دەزانـم بە جەفەنگ وا دەڵێ. سەوزییەکە ورد ورد دەجنم. دایکم دەڵێ: "سەوزەی خۆرشت دەبێ ورد بێ. بۆخۆشی لەسەر سەوزە وردکردن زۆر پێکراوە. توندتوند دەیجنێ و قەتیش دەستی نابڕێ. بۆ سوورکردنەوەش هەر دەبێ لێی بزانی. پاش پازدە ساڵ ئاخرییەکەی فێری بـووم. دەبـێ لە سەر ئاورەکە بـەردەوام تێکەڵی دەی کە نەسووتێت و جوانیش سوور بێتەوە. لە بیرم نەچێ پاقلەکە لە ئاو کەم.
گۆشتەکە کوڵی و هەڵوپەل بوو، بەڵام پاقلەکە هەر نەکوڵی. مێردەکەم هیچی نەگوت. بەڵام پاشان کە سفرەکەم کۆ کردەوە پاقلەکانی لە گۆشەی دەورییەکەی خڕ کردبۆوە. ئەو شەوە کچەکەم گوتی زگم دێشێ. مێردەکەم ڕۆژنامەکەی هێنا خوارێ و چاوێکی لێکردم. پاشان پێکەنی و ئاماژەی بۆ ئاشپەزخانە کرد. مێردەکەم وەک زۆربەی مێردەکان نەیدەزانی کە کچۆڵە سێزدە ساڵەکان زوو زوو زگئێشە دەگرن.
سبەینێ چیشتی باینجان زۆر کاتم ناگرێ و من چیرۆکەکەم دەنووسم. چیرۆکەکەم تایبەتی مـنـداڵانـە. چیرۆکی کەروێشکێکە، دەکەوێتە کونێکەوە کە ڕاوچییەک هەڵیکەندووە. کونەکە زۆر قووڵە و کەروێشکەکە ناتوانێ لێی بێتە دەرێ. هەڤاڵەکانی کەروێشکەکە دەدۆزنـەوە، بەڵام هیچیان بۆ ڕزگارکردنی لە دەست نایە. نان

و ئاوی بۆ دێنن تا لە برسان و لە توونیان نەمرێ و جاروبار لەو سەرەوە قسەی لەگەڵ دەکەن تا بێتاقەت نەبێ. کەروێشکەکە عەیامێکی زۆر لە کونەکەدا دەمێنێتەوە. خواردنی هەیە، جێگای گەرم و خۆشە، بەڵام دەیهەوێ بێتە دەرێ. لە نێو کونەکەدا لەتێک ئاسمان دەبینێ کە جاری وایە ڕووناکە، جاری واشە شینە و جارجاریش پڕە لە هەور و خۆڵەمێشییە. لە ڕۆژدا باڵندەکان دەبینێ کە هەڵدەفڕن و شەوانەش ئەستێرەکان، ئێستاش نازانم چلۆن کەروێشکە چکۆلە لەو کونە بێنمە دەرێ. سبەینێ فکرێکی بۆ دەکەمەوە. تا ئێرەی چیرۆکەکە لە چەند ڕستەدا دەنووسم با لە بیرم نەچێ. باوێشک دەدەم. با بچم بخەوم بۆوەی سبەینێ بە کەیف و بە دەماخ بم. سبەی دەبێ کەروێشکێکی چکۆلە لە کونێکی قووڵ بێنمە دەرێ. توونیمە. دەچمە ئاشپەزخانە و دەرگای یەخچاڵەکە دەکەمەوە و شووشە ئاوەکە دێنمە دەر. جێ میوەکەم وەبەر چاو دێ. تەنیا دوو باینجانی تێدایە و دوو باینجانیش بەشی چێشتی باینجانی سبەینێ ناکات. سبەینێ دەبێ بچم باینجان بکرم. ئاوەکە دەخۆمەوە. خەوم دێت. لیوانەکە لە جێی خۆی دادەنێمەوە. کارەباکە دەکووژێنمەوە و لە ئاشپەزخانە دێمە دەر. دەمهەوێ شتێک بنووسم. چی بوو؟ کوتە کاغەزێک لە دەفتەرچەی حیساب و کیتابم لێدەکەمەوە و لە سەری دەنووسم باینجان. کاغەزەکە بە ئاوێنەی دەسشوویی‌یەکەوە دەچەسپێنم تا سبەی لە بیرم بێت کە ....

سەرچاوە: پیرزاد،زوویا (١٣٨١)سە کتاب، تهران: نشر مرکز ل٢-٥





گابریل گارسیا مارکیز

کاتێک بۆ یەکەمینجار منداڵەکان چاویان کەوتە سـەری وایـان زانـی کەشتیەکە لە کەشتیەکانی دوژمـن، وەکـو تەنێکی ڕەش لە دەریـاکـەدا تا دەهـات نزیک و نزیکتر دەکەوتەوە، منداڵەکان تێبینی ئەوەیان کرد کە نە چارۆکەی پێوەیە نە هیچ بەیداخێکیش ئیتر وایانزانی نەهەنگێکی گەورەیە، بەڵام کاتێ گەیشتە سەر لمی کەنارەکە، هەندێک قەوزە و ڕیشاڵی ئەو ڕوەکانەی تێوەی ئاڵابوو و هەروەها ئەو ماسیانەشیان لێکردوە کە دایانپۆشیبوو ئینجا بۆیان دەرکەوت کە ئەمە کەسێکی خنکاوە .

ئیتر منداڵەکان کەوتنە گەمەکردن بە تەرمەکە، جارێک بە خۆڵەکە دایاندەپۆشی و جارێکی تر دەریاندەهێنایەوە، هەتا پیاوێک لەوێوە تێپەڕی خێرا دووری خستنەوە و بەپەلە خۆی گەیاندە گوندەکە هەتا لە ڕووداوەکە ئاگاداریان بکاتەوە.

ئەو پیاوانەی کە بۆ یەکەمجار تەرمەکەیان هەڵگرت بەرەو یەکەمین ماڵی گوندەکە هەستیان کرد ئەم تەرمە لەوانی تر جیـاوازە، لەهەر مردوویەکی تر قورسترە، هەستیان کرد تەرمی ئەسپێکیان هەڵگرتوە بۆیە لە دڵی خۆیاندا وایان لێکدایەوە : (ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە بێت ماوەیەکی دوورودرێژە تەرمەکە لە بنی دەریاکەدا ماوەتەوە ئیتر ئاو چۆتە مۆخ و ئێسکەکانیشیەوە)

وەختێک پیاوەکان تەرمەکەیان دانایە سەر زەوی هەستیان کرد تەرمەکە باڵای لە هەموو پیاوەکانی تر بەرزترە، لە کاتێکدا سەری مردووەکە نوسابوو بە دیواری ژورەکەوە قاچەکانی خەریک بوو دەیدا لە دیوارەکەی ئەمبەر، لەو کاتەدا یەکێک لە پیاوەکان دەیپرسی تۆ بڵێی ئەو کەسەی دەخنکێت دوای مردنیشی باڵای بەرزتر بێت؟!

مردووەکە بۆنی دەریـای لێدەهات، بە توێژێک لە قوڕ و ماسی داپۆشرابوو، پێویستی نەدەکرد دەموچاوی تەرمەکە خاوێن کەنەوە هەتا بیناسنەوە و بزانن خەڵکی گوندەکەی خۆیانە یان نا، چونکە گوندەکەیان هێندە بچوک بوو لە بیست ماڵێک زیاتر نەدەبوو، لەو ماڵە بچوکانەی بە تەختە دروسـت کرابوون. خۆڵی گوندەکە لە جۆرێکی زۆر دەگمەن بوو، ژنەکان دەترسان کە ڕەشەبا منداڵەکان هەڵگرێت، هەر بۆیە پیاوەکانیش هیچ جۆرە گوڵێکیان نەدەڕواند، مردوەکانیش شتێکی دەگمەن بوو، زیندوەکان هیچ جێگایەکی وەهایان

شک نەدەبرد کە مردوەکانی تێدا بنێژن، هەر بۆیە مردوەکانیان لە بەرزترین شوێنی سەرچاوەکەوە هەڵدەدایە دەریاکەوە، دەریاکەیان میهرەبان بوو، هێمن و بەخشندە، خەڵکی خواردنی خۆیان لەو مسۆگەر دەکرد، پیاوەکانی گوند ژمارەیان زۆر نەبوو، هەموویان باری ئەو حەوت بەلەمە بوون کە هەیان بوو. لەبەرئەوە ئەوەندە بەس بوو کە چاوێک بەناو خۆیاندا بگێڕن ئیتر دەیانزانی کە کەسیان کەم نەکردوە.

سەر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژە پیاوەکان نەچوون بۆ دەریا بۆ ڕاوکردن، بەڵکو ڕوویان کردە گوندەکانی دەوروبەر تا بزانن کێ دیار نەماوە. لە کاتێکدا ژنەکان لە گوندەکە بەدیار خنکاوەکەوە مانەوە، بە لفکە دەستیان کرد بەلێکردنەوەی ئەو قوڕەی بە لەشیەوە بوو ئەو قەوزانەی بە قژیەوە نوسابوو، بە چەقۆش ئەو شتانەیان لێدەکردەوە کە نوسابوو بە پێستەکەیدا .

ژنەکان تێبینیان کرد ئەو قەوزەیەی کە تەرمەکەی داپۆشیوە سەر بەو جۆرە قەوزانەیە کە زۆر لە قوڵایی بنەوەی دەریـادا دەژی. جلەکانی وەها دڕابـون، هەلاهەلا بوبون. وەکو ئەوەی بە پێچیدەیەکی پڕ لە مەرجاندا مەلەی کردبێت وابوو. هەروەها ژنەکان تێبینی ئەوەشیان کرد کە ئەم تەرمە زۆر بە شکۆ و شانازیەکی بێوێنەوە چاوی بە هەردوو فریشتەی مردن کەوتوە، چونکە ڕوخساری هیچ لەو جۆرە ترس و تۆقینەی پێوەنەبوو کە بە ڕوخساری نقومبووی دەریاکانەوە هەیە، یان ئەو داماویەی بە ڕووخساری نقومبوی ڕووبارەکانەوە .

کاتێ ژنەکان لە پاککردنەوە و ئامادەکردنی تەرمەکە بونەوە هەناسەیان لەبەر بڕابوو، لە ژیانی خۆیاندا هەرگیز پیاوێکی وەها قۆز و بەهەیبەتیان نەدیبوو .

لەبەر درێژی و کەڵەگەتی تەرمەکە ژنانی گوند نەیانتوانی پێخەفێک یان تەنانەت مێزێکیش پەیدا کەن بەرگەی ئەوە بگرێت ئەو شەوە تەرمەکەی لەسەر ڕاکێشن، نە قاچی بە هەراوترین شەڕواڵدا نە جەستەی بە گەورەترین کراسدا دەچوو. ژنەکان دوای ئەوەی گەورەترین پێڵاویشیان تاقیکردەوە کەچی تاقە پێڵاوێکیان دەست نەکەوت قاچی ئەو مردوە بگرێت.

لەبەردەم ئەو جەستە زەبەللاحەدا ژنەکان عەقڵیان وەختە بوو ڕادەوەستا، لە چارۆکەی بەلەمەکان دەستیان کرد بە دوورینی شەرواڵێک و لە قوماشی تەنکی ئۆرگەندیش (ئۆغەندی – وەکو ئۆرگەنزا قوماشێکی تەنکە) کراسێک چونکە هەر ئەوە شایستەی مردویەک بوو بەو ئاستە لە هەیبەت و قۆزی.

ژنـەکـان لە شـێـوەی بازنەیەکدا بە دەوری مـردوەکـەدا دانیشتن و هەریە کەیان دەرزی ودەزوویـان بەدەستەوە گرت وکەوتنە دوورینی جلەکان ، جـار جـارەش بە سەرسامیەکی زۆرەوە سەیرێکی تەرمەکەیان دەکرد ، گەشتنە ئـەو بـاوەڕەی هەرگیز ڕەشـەبـا لـەوەوبـەر وەکو ئەو ئێوارەیە قاییم وتوند نەبوە ، هەرگیز دەریای (کارابیب)یش وەکو ئەو ئێوارەیە تێکچڕژاو وپەشۆکاو نەبوە ، یەکێک لە ژنەکان گوتی ( ئەوە هەمووی بە هۆی ئەم تەرمەوە بوو ) ، یەکێکی تریان گوتی ( ئەگەر ئەم پیاوە لە گوندەکەی ئێمە ژیابا بێگومان گەورەترین و قاییمترین خانوی بینا دەکرد ، خانویەک کە



دەرگـای زۆر گـەورەو فـراوان ،سەقفی بـەرز و زەویەکەی زۆر کۆک و پتەو بێت ، تەختێکی خەوتنی ئاسن و پۆلا بۆ خۆی دروست دەکرد ، ئەگەر ڕاوچی بوایە ، هەر ئەوەندە بەس بوو کە ماسیەکانی بە ناوی خۆیانەوە بانگ بکردایە ئیتر دەهاتنە بەردەستی ، بێگومان زۆر ئازایانە بیرێکی هەڵدەکەند ، دەیتوانی لە بەردەکانەوە ئاو دەربێنێت ، دەیتوانی بە کەناری سێڵاوەکان گوڵ بڕوێنێت )

هەر ژنەو تەرمەکەی بە مێردەکەی خۆی بەراورد دەکرد ، ئەوە فرسەتێکی زێڕین بوو بۆ ژنەکان کە داخـی دڵـی خۆیان هەڵڕێژن وبڵێن کە مێردەکانیان داماوترینن ، ژنەکان کەوتنە کۆڵانە پێچ و پەناکانی خەیاڵەوە .

بە تەمەنترینی ژنەکان گوتی ( دەموچاوی مردوەکە لە کەسێک دەچێت ناوی «ئیستبان» بێت ) ، ئـەوەش زۆر لە جێگای خۆیدا بوو ، هەر ئەوەندە بەس بوو ژنەکانی تر چاوێک لەو تەرمە بکەن هەتا تێبگەن کە مەحاڵە هیچ ناوێکی تر هەڵگرێت بێجگە لە «ئیستبان» ،بەڵام هەرە گەنجترین و هەرە عینادترینی ژنەکان لە خەیاڵی خۆیدا پێی وابوو تەرمی خنکاوێکی ڕاکشاو بە تەنیشتی گوڵەکانەوە وبە جوتێک پێڵاوی بریقاوەوە ،نابێت وناکرێت هیچ ناوێکی تر هەڵگرێت جلە لە ناوێکی ڕۆمانسی وەکو (لۆتارۆ) نەبێت.

لە ڕاستیدا قسەی بەتەمەنترینەکەیان ڕاست بوو ، شێوەی مردووەکە بەوجلوبەرگانەوە زۆر ناشرین بوو ، شەرواڵەکە باش نەدورابوو ،کورت و تەسک دەردەکـەوت پێدەچوو ژنەکان باش

پێوانەیان نەگرتبێت ، وەکو ئـەوەی دڵی مـردوەکـە بـە تـونـدی کەوتبێتەوە لێدان قۆپچەکان پچڕان وکەوتن .
دوای نیوەی شەو ڕەشەباکە هێمن بۆوە ، دەریاکە خامۆش بوو ، بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا ، ئەوکات ژنەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە هەر بەڕاستی مردووەکە ناوی «ئیستبان»ە ، هیچ یەک لە ژنەکان هەستیان بە بێزاری و ماندوو بون نەکرد : ئەوەی کە جلەکانی کردە بەری ، ئەوەی کە قژی بۆ داهێنا ، ئەوەی کە نینۆکی بۆ بڕی ، ئەوەی کە ڕیشی پاککردەوە ، هیچ یەکێکیان هەستی پەشیمانی نەیگرتن کە لاشەکەیان بە ڕاکێشراوی لەسەر زەویەکە بە جێهێشت .
کە چونە ماڵەوە هەریەکە بیری لەوە دەکردەوە کـە دەبێت ئـەم خنکاوە چەندە بەدەست گەورەیی قەبارەی خۆیەوە ناڵاندبێتی. تەنانەت دوای مردنەکەشی ، دەبێت هەموو جار خۆی دانەواندبێت کە لەدەرگاکانەوە چۆتە ژورەوە ، ڕەنگە لە هەموو سەردانێکیدا وەک گەمژەیەک بە پێوە ڕاوەستابێت تا کابانەکە کورسیەکی وەهـای بۆ دۆزیـوەتـەوە بەرگەی بگرێت ، بێگومان کابانەکە هەزارانجار لە خودا پاڕاوەتەوە کە کورسیەکە لە ژێریدا ووردو خاش نەبێت ، هەمو جارێکیش «ئیستیبان « بە خەندەیەک وەڵامی کابانەکەی داوەتەوەو هەستی ڕەزامەندی خۆی نیشانداوە بەو بە پێوەوەستانەی ، بێگومان دەبێت لە دووبارە بونەوەی ئەم جۆرە هەڵوێستانە چەند بێزار بوبێت ، بێگومان دەبێت خەڵکیش پێیانگوتبێت (دانیشە بمێنەرەوە ، قاوەیەک بخۆرەوە لەگەڵمان) ، بەڵام کە ئەمیش پۆزشی هێناوەتەوەو ڕۆشتوە ،کەتونەتە چرپوهوڕ (باش بوو ئەو گەمژەیە ڕۆی)
ژنەکان لە بەزەیی خۆیانەوە بۆ مردوەکە ئاوا بیریان لێدەکردەوە .
بەیانی زوو ،لـە ترسی تیشکی هەتاوەکە ژنەکان دەمووچاوی مردوەکەیان داپۆشی کە هەندێک پەژموردە ببوو ، خنکاوەکەیان وەکو مێردەکانیان بێدەرەتان دەهاتە بەرچاو بۆیە لە سۆز وبەزەییەوە فرمێسک لەچاوەکانیانەوە ڕژایـە خـوارێ ، هـەرە گەنجەکەیان دەستی کرد بە هاوار ولاوانـەوە، ئیدی ئەو هەستەی زیاتر وزیاتر بەهێزتر کرد کە خنکاوەکە لە «ئیستیبان» دەچێت .....
شین وشەپۆڕ بۆ خنکاوەکە هێندە گەرم بوو تا وای لێهات خنکاوەکە بو بە گەورەترین کڵۆڵ لەسەر ئەم رووی زەویە .
پیاوەکان دوای ئەوەی دڵنیا بوون کە خنکاوەکە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەریش نیە ئیتر گەڕانەوە ، دڵخۆشی وفرمێسک لەسەر ڕوخساری ژنەکان تێکەڵ بوون .
ژنـەکـان گوتیان :(سـوپـاس بۆ خـودا کە مردوەکە هی گوندەکانی دوروبـەر نیە ، کەواتە بۆ خۆمانە)
پیاوەکان لـەوبـاوەڕەدا بوون ئەمە هیچ نیە تۆزیک خۆبردنەپێشەوەی ژنەکان نەبێت ، هیلاکی بڕستی لێبڕیبوون ، زۆر مەراقی ئەوەیان بوو پێش ئـەوەی خۆرەتاوەکە تیژتر بێت ،پێش ئـەوەی ڕەشەباکە ببێتە گڕە لە دەست ئەو

هـاتـوە ناوەختە ڕزگـاریـان بێت ، پیاوەکان نەقفالەیەکیان ئامادەکرد لە پاشماوەی بەلەم و هەنێک گژوگیا کە بە ڕیشاڵی دەریا قاییمیان کردبوو هەتابەرگەی هەڵگرتنی لاشەکە بگرێت تا سەرچاوەکە ، بەنیازیش بوون لەنگەرێک لە قاچەکانی تەرمەکەوە ببەستن هەتا بە ئاسانی و بێ گـرفـت شـۆڕ بێتەوە بۆ نـاو قوڵایی دەریاکە. لەوێدا کە ماسیە کوێرەکانی لێیە ، لەوێدا کە مەلەوانەکان بە خۆشیەوە دەمردن ، لەنگەرەکەیان وەها تێوە ئاڵاند هەتا شەپۆلە سەرلێشواوەکان نەتوانێت جارێکی تر تەرمەکە بێنێتەوە سەر ڕووی دەریاکە وەکو لەگەڵ زۆر مردووی تردا ڕویدا ، بەلام تا پیاوەکان زیاتر پەلەیان لەو شتەی دەیانویست بکردایە، ژنەکان زیاتر بەهانەیان دەهێنایەوە بۆ درێژکردنەوە و کوشتنی کاتەکە، لە کاتێکدا ئـاپـورەی دەوری تەرمەکە تا دەهـات زیاتر دەبـوو ، هەندێک لە ژنەکان هەوڵیان دەدا بازوبەند بکەنە شانی ڕاستی بۆ هێنانی بەختی باش ،هەندێکی تریان هەوڵی دەدا قیبلەنومایەک ببەستێت لـە مەچەکی چـەپـی ، دوای کێشمەکێشم و دەنگەدەنگ وپاڵپاڵێنی ترسناکی ژنەکان ، پیاوەکان هاواریان لێبەرزبۆوە (ئەو درۆودەلەسەو ئاژاوەیە چیە ، چی هەڵدەواسن ؟ نازانن ماسی (قرش)ەکان ئارامیان لێبڕاوەو و چاوەڕیی ئەم تەرمە دەکەن ؟ چیتانە ؟ ئەمە ش هەر تەرمێک نیەو بەس ؟؟؟)

دوای ئەوە ژنێک سەرپۆشی سەر ڕوخساری مردوەکەی لادا ،پیاوەکان لەسەرسامی خۆیاندا هەناسەیان لەبەربڕا ،(ئەوە «ئیستیبان»ە !!) .

پێویستی بە دوبـارە وسێبارەکردنەوە نەبوو چونکە پیاوەکان یەکسەر ناسیانەوە ، لەو زیاتر کەسی تر نەبوو ،ئـاخـۆ کەسێک هەبووبێت پێیوابوبێت ئەم خنکاوە ڕەنگە بۆ نمونە « سێرواڵتەر ڕۆڵیک « بێت ؟ ئەگەر ئەوە وابوایە بێگومان ئەکسانتە ئەمەریکیەکەیان دەهێنایە بەرچاوی خۆیان ، هەروا دەیشیانهێنایە بەرچاوی خۆیان کە توتیەک لەسەرشانەکانیەتی وتفەنگێکی کۆنیش بە دەستیەوە نیشانە دەگرێتەوە ، بەڵام ئەم تەرمەی ئێستا

لە بەردەمیاندایە ئەو جۆرە نیە ، ئەمەیان جۆرێکی دەگمەنە !

ئەمەیان «ئیستیبان»ە ،وەکو ماسی سەردین لە پێشی خەڵکەکەدا درێژبوە، پێی پەتی و شەرواڵی ساوایەکی لەبەردابوو ، ئەی ئەو نینۆکانەی کە هەردەبوو بە چەقۆ ببڕدرێت ، تەریق بونەوە بە ڕوخساری خنکاوەکەوە دەرکەوت ، خەتای ئەو داماوە چیە کە ئەوەندە درێژ و قورسە بەو رادەیەش قۆزە ؟

ئەگەر بیزانیایە ئەم هەموو بەزمەی لێبەسەر دێت بێگومان جێگایەکی تری هەڵدەبژارد تێیدا نقوم بێت .

یەک لە پیاوەکان گوتی : (من لە جێگای ئەو بومایە ملی خۆم دەبەستەوە بە لەنگەرێکەوە پێش ئەوەی خۆم هەڵدەمە شەتاوەکەوە ، بێگومان ڕزگارم دەکردن لەم هەموو ماندوبون ودەردەسەریە ولەم لەشولارە ناقۆڵایەشم )

خەڵکی گوندەکە گەورەترین پرسە یان گرت کە بە خەیاڵدا بێت بۆ خنکاوێکی بێناسنامە ، ئەو ژنانەی کە چوبونە گوندەکانی دەوروبەر

بۆ هێنانی گوڵ ، گەڕانەوە وهەندێک ژنانی تریش لەگەڵیان هاتبوون بۆ دڵنیابون لەو هەواڵەی بیستبویان .

دوای ئەوەی ئەو ژنانەی لە گوندەکانی ترەوە هاتبوون ڕوخساری خنکاوەکەیان بینی ، ئەوانیش چون بۆ گوندەکانی دەروبەر گوڵی تر بێنن ،هەروا ژنی تریش ، ئابەو جۆرە هەتا ئەو شوێنە یەکپارچە بوە ئاپورای ژن وگوڵ ...

لە دواچرکەکاندا خەڵکی گوندەکە زۆریـان بەلاوە ناخۆش بوو کە تەرمەکە وە هەتیو بخەنە دەریاکەوە، هەربۆیە لە نێوان باشترین کەسی خۆیاندا دایک و باوکێکیان بۆ هەڵبژارد ،خێرا هەندێکی تریان لەولاوە خۆیان کردە خوشک وبرای ، هەندێکی تر مام وخاڵەکانی، بەوجۆرە خەڵکی گوندەکە هەموو بون بە خزم وکەسی یەکتر .

لە کاتێکدا خەڵکەکە لە نێوان خۆیاندا پێشبڕکێیان بوو لەسەر هەڵگرتنی تەرمەکە وبردنی بە ڕێگا سەرەوخوار وکوڕەکەدا کە دەچۆوە سەر چەمەکە ، لەوکاتەدا خەڵکی ئەو گوندە تێبینی ئەوەیان کرد ، کۆڵانەکانیان چەند تەسکە ، زەویەکەیان چەندە ووشک وبرنگ ،دڵی خۆیان چەندە پیسە .. بەبەروارد بە جوانیی ئەو خنکاوە .

پیاوەکان لاشەکەیان هەڵدایە چەمەکەوە بێئەوەی لەنگەرەکەی پێوە ببەستن بۆ ئەوەی هەرکاتێک ویستی بگەڕێتەوە لایان ، لەو چرکەساتەی کە لاشەکە بەرەو قوڵاییەکان بەردەبۆوە وایان هەست کـرد کە کە سێکی گوندەکەیان لە دەستداوە ، لەو دەقیقەیەوە ئیتر زانیان کە زۆر شت لە گوندەکەیاندا دەبێت بگۆڕێت .

ئەوکات زانیان کە خانوەکانیان پێویستی بە دەروازەی بەرز و سەربانی زۆر قاییمترە هەتا ڕۆحی «ئیستیبان» بتوانێت بە ئارەزوی خۆی بە گوندەکەدا بگەڕێت و بێتە ماڵەکانەوە بێئەوەی ناوچەوانی بەر سەر دەرگاکان بکەوێت وبێئەوەی کەسێک لە ژێرەوە بچرپێنێت وبڵێت ،گەمژەکە مرد .

لەو ڕۆژەوە خەڵکی گوندەکە بڕیاریان دا کە وەکو ڕێزێک بۆ یادی «ئیستیبان» ماڵەکانیان بە بۆیەی ڕەنگاوڕەنگ بۆیە کەن ، شەرتیان کرد پشتی خۆیان بشکێنن لە هەڵکەندنی بیری ئاو لە دڵی ئەو بەردانەدا ، بە درێژایی چەمەکان گوڵ بڕوێنن ، هەتا لە سەرلەبەیانیانی ساڵانی داهاتودا وەختێک دەریاوانی ئەو کەشتیانەی لێرەوە تێدەپەڕن ، بە بۆنی باخچەکان لەخەوڕابن ، هەروا دەریـاوان ناچار کات لە سەری سەرەوەی کەشتیەکەوە بە خۆی وئەستەرلابەکەیەوە بێتەخوارێ ودەست بۆ ئەو شاخە ڕاکێشێت کە گوڵە پەمەییەکانی بە ڕووی ئاسۆدا بڵاوبۆتەوە بە هەموو زمانەکانی دنیا بڵێت : (سەیری ئەوێ کەن ، دەریای هێمن و ڕووناکی خۆرەتاوی لێیە ، ئەوێ گوندەکەی «ئیستیبان»ە ) .

سەرچاوە: ئینتەرنێت (مارکیزیات – مجموعە قصص قصیرە)

www.maseera.com



نادین جۆردیمەر

یەکێک بە نووسین داوای لێکردبووم لە ئەنتۆلۆجیای چیرۆکی منداڵاندا بەشداری بکەم. وەڵامم دایەوە کە من چیرۆک نووسی منداڵان نیم. ئەو وەڵامی دامەوە کە یەکێک لە ڕۆمان نووسەکان ,لەکۆنگرەیەکدا ,یان لە پێشانگایەکی کتێبدا , یان لە کۆڕێکدا کە بەم دواییە گیراوە. وتوویەتی: لەسەر هەر نووسەرێک پێویستە , بەلایەنی کەمەوە تاقە چیرۆکێک بۆ منداڵ بنوسێت. بیرم کردەوە بە پۆستەدا کارتێک بنێرم و تێیدا بنووسم کە من دەستەواژەی — لەسەر هەر نووسەرێک پێویستە — ڕەت دەکەمەوە.

شەوی پێشوو لەخەو هەستام , یان هەڵیان ساندم , نازانم چی بوو , دەنگێک لەژوورەکەدا , دەنگدانەوەیەکی نائاگا , جیرەجیرەیەک بوو لەبابەتی دەنگی پێیەکی قورس لەسەر زەویەکی دارینددا.

پیاسە بکات , گوێم گرت , هەستم کرد لەو کاتەدا تا دەهات زیاتر گوێم دەکرایەوە. جارێکی تر جیرەکە هاتەوە. چاوەڕێی بووم. بۆئەوەی بزانم پیاسەکردنەکە لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی ترە. بە ڕاڕەوەکەدا بەرەو دەرگاکەم هات. من نەشیشم پێیە دژی دز و نە دەمانچەیش لەژێر سەرینەکەمدایە. بەڵکو وەک ئەو کەسانە ترس دامدەگرێت کە ئیحتیاتی وەها دەخەن , شیشی پەنجەرەکەم وەک تویکڵ نەرمە , لەوانەیە وەک پێکی شەراب بشکێت ...

ساڵی ڕابردوو ژنێک بە ڕۆژی نیوەڕۆ کوژرا لە ماڵێکدا کە دوو فرسەخ دوورە ( چۆن گوزارشتیان لێکرد). سەگە درەکان پاسەوانی بێوەپیاوێک و کەل و پەلی وەک کاتژمێرە شوێنەوارییەکانیان دەکرد , پیاوەکەیان خنکاند پێش ئەوەی کرێکارێکی پیاوم بە چەقۆ بیکوژێت کە لەکارەکەی دەریکردبوو بێئەوەی کرێکەی بداتێ. من لە دەرگاکە ورد دەبومەوە , لەجیاتی ئەوەی ببینم لە مێشکمدا وێنام دەکرد. بە هێمنی و جێگیری مامەوە — پێشتر قوربانی بووم , بەڵام دڵم پەلەپەلی بوو بە شێوەیەک کە لەسەر قەفەسی جەستەم دەلەرزی , چۆن لەکۆتاییدا هەستەکان لەگەڵ یەکتردا گونجان , کە تازە لە پشوو (نوستن) دەرچوو بوون! هەرگیز ناتوانم لەکاتی سەرقاڵیەکانی ڕۆژانەدا بەم ورياييە گوێ بگرم , نزمترین دەنگم دەخوێندەوە , هەموو هەڕەشەیەکی چاوەڕوانکراوم دیاری دەکرد. بەڵام زانیم کە من هەڕەشەم لێنەکراوە یان ئاوارتە نیم ,کەسێک قورسایی نەخستبووە سەرپلێتەکان , جیرەجیرەکە لە ئەنجامی هاتوچۆی منەوە پەیدا ببوو , ئەو خانووەی تیایدا نوستووم لەسەر زەویەکی وێرانە دروستکراوە , دوور لەژێر جێگەی خەوەکەمەوە. لەژێر زەمین , بناغەی خانووەکەدا , چاڵ و ڕاڕەوی کانی ئاڵتون لێدراون , کاتێک سەربانێک دەلەرێتەوە , جیادەبێتەوە و دەڕوخێت لە قوڵی سێ هەزار پێ لە خوارەوەدا , گشت خانووەکە لە شوێنی خۆی بەحاڵ دەجوڵێت , بە کاریگەری لە هاوسەنگی و دژە هاوسەنگی خشتەکانی , هەروەها لە چیمەنتۆ و تەختە و ئەو شووشەیەی کە خانووەکەی وەک کۆڵەکەیەک ڕاگرتووە کە لە چوار دەورمدان , ترپە شێواوەکانی دڵم کۆکردەوە وەک دوا ئاوازی نوسراو کە لە سەنتۆرێکەوە دەردەچێت , کە ڕەنگە لەوێ بن , لە ژێرمەوە , لەناو زەوی , لەو ساتەدا. لەوانەیە ئەو ئەو کۆچکەرانەی چاڵەی کە رووخان تیایدا ڕوویداوە , چۆڵ کرابێت , لە ڕەگ و ڕیشە لەت و پەتەکانیەوە دڵۆپە دەکات , لەوانەشە پیاوەکان لە قوڵترین گۆڕدا گیریان خواردبێت.

نەمتوانی شوێنێک بدۆزمەوە کە بیرم بتوانێت لە جەستەم ئازاد بێت — بۆ ئەوەی بنومەوە. بەمشێوەیە چیرۆکم بۆ

خۆم دەخوێندەوە , چیرۆکێک بۆ نوستن.
له ماڵێکدا که دەکەوێتە دەوروبەری شار , ژن و مێردێک هەبوون زۆریان یەکتر خۆش دەویست , له بەختیاریەکی بەردەوامدا دەژیان , کوڕێکی بچووکیان هەبوو زۆریان خۆش دەویست , پشیله و سەگێکیش که منداڵەکه خۆ شیدەویستن. ئۆتۆمبیلێک و کەرەڤانەیەکیان هەبوو بۆ پشووەکان , حەوزێکی مەلەکردنی شوراکراو تا منداڵەکه و هاوڕێکانی لەکاتی یاریکردندا نەکەونه ناوی و بخنکێن , له ماڵەکەدا کارەکەرێکی متمانه پێکراو و باخەوانێکی گەڕۆک هەبوو که دراوسێکه زۆر پشتگیری لێکرد. کاتێک خەریکبوو ژیانیان بەختەوەر بێت جادوبازێکی پیرەژنی دانا که دایکی پیاوەکه بوو , ئاگاداری کردنەوە نەهێڵن هیچ کەسێک لەشەقامەکەوە بێتە ژوورەوە , ناویان لەکۆمەڵەی سودی پزیشکیدا بوو , سەگە ماڵیەکەیان مۆڵەتی هەبوو , له ئاگر , و زیانەکانی لافاو و دزین پارێزراو بوون , له لیژنەی چاودێری گەڕەکە ناوخۆییەکە (ئیبرهود وتش)دا بەشداربوون– دەرگاکەیان تابلۆیەکی پێوە بوو , لەسەری نوسرابوو: ئاگاداربه , لەسەر وێنه سێبەریەکەی مشەخۆره گریمان کراوەکه که دەمامک دار بوو , دەزانرا ڕەشه یان سپی. ئەمەش بەڵگەی ئەوە بوو که خاوەن مولکەکه ڕەگەز پەرست نییه.

مەحاڵ بوو خانووەکه , حەوزی مەلەکردنەکه , یان ئۆتۆمبیلەکه دژی بچووکترین گێرەشێوێنی زامن بکرێن , چونکه گێرەشێوێنی و تێکدانی ئاسایش بەرقەرابوو . بەڵام ئەمه لەدەرەوەی شاردا ڕوودەدات. که مرۆڤی له ڕەنگێکی دیکه لێیه. ڕێنەدەدرا بەو کەسانه بچنه ژوورەوە تەنها وەک نۆکەر یان باخەوان نەبێت که متمانەیان پێدەکرا , لەبەرئەوە هیچ شتێک جێی مەترسی نەبوو. وەک مێردەکه به ژنەکەی وت , سەرەڕای ئەوەش ژنەکه دەترسا که ڕۆژێک له ڕۆژان کەسانێکی وەک ئەوانه بێن بۆ شەقامەکه و تابلۆی ئاگادارکرنەوەکه بشکێنن , دەرگاکه بکەنەوە وروژم بێنه ژوورەوە.... مێردەکه وتی: ئەمه قسەیەکی بێ مانایه ئازیزەکەم , سەرباز و پیاوانی پۆلیس و گازی فرمێسک ڕێژ و چەک هەیه بۆ دوورخستنەوەیان — بۆئەوەی دڵخۆشی بکات چونکه زۆری خۆشدەویست , لەبەرئەوەی پاسەکان دەسوتێنران , بەرد دەکێشرا به ئۆتۆمبیلەکاندا. پیاوانی پۆلیس تەقەیان لەخوێندکارانی قوتابخانەکان دەکرد لەو گەڕەکه دوورانەوە که نەدەبینران و نەدەبیستران. دەزگا ئەلەکترۆنیەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەرگاکان دانرابوون. هەر کەسێک تابلۆی ئاگادارکردنەوەکه لێبکاتەوە و هەوڵ بدات دەرگاکان بکاتەوە پێویسته لەسەری دەست بنێت بەدوگمەکەدا و نیازی خۆی بڵێت و له ڕێگەی ئەو مایکرۆفۆنەوە که بەماڵەکه گەیەنراوە قسه بکات. ئەو ئامێرە سەرنجی کوڕە بچووکەکەی ڕاکێشا لەگەڵ هاوڕێ بچووکەکانیدا بۆیە وەک نێرەر و وەرگر بەکاری هێنا لەیاری پۆلیس و دزدا.
ئاژاوەکان سەرکوت کران , بەڵام زۆر کرداری سوتاندن له ناوچەکەدا ڕوویدا , دزەکان کارەکەرێکی متمانه پێکراوی کەسێکیان بەستەوە و خستیانه ناو مەخزەنێکەوە , ئەمە کاتێک کاروباری ماڵەکەی بەڕێوە دەبرد , کارەکەرە متمانەپێکراوەکەی پیاو و ژن و منداڵەکه شڵەژا لەو نەهامەتیەی بەسەر هاوڕێکەیدا هات که بەرپرسیارێتی موڵکی پیاو و ژن و کوڕێکی بچووک لەئەستۆ دەگرێت کاتێک ئەوان لەوێ نین , وەک ئەمیش دەیکرد , بۆیە له خاوەن ماڵەکه پاڕایەوە که شیش بۆ دەرگا و پەنجەرەکان دابنێت دژی دزین , و دەزگای ئاگادارکردنەوە دابنێت. ژنەکه وتی ڕاست دەکات با بەقسەی بکەین. بەمشێوەیە ئێستا له شیشی گشت دەرگا و پەنجەرەکانەوە ئاسمان و درەختەکان دەبینن لەو ماڵەدا که به بەختیاری دەژین. کاتێک پشیله نازدارەکەی کوڕە بچووکەکه هەوڵیدا لەپەنجەرەی پانکەکەوە سەربکەوێت تاوەکو لەگەڵ منداڵەکەدا بچێتە جێگە خەوە بچووکەکەیەوە لەشەودا , وەک هەمیشه دەیکرد , دەزگای ئاگادارکردنەوەکه لەگشت ماڵەکەدا لێیدا.
زۆرجار دەزگای ئاگادارکردنەوەکه وەڵامی دەدایەوە وەک دەزگاکانی ئاگادارکردنەوە دژی دزین لەماڵەکانی دیکەدا. که پشیله نازدارەکان یان مشکه قرتێنەرەکان دەیخەنه ئیش.
دەزگاکانی ئاگادارکردنەوە به دەنگێکی تیژی زیقنی لوشەلوش که هەمووان لەسەری ڕاهاتبوون له میانەی باخچەکانەوە یەکتریان بانگ دەکرد , بەمشێوەیە

ژاوەژاوەکە خەڵکی ناوچەکەیان بەئاگا دەهێنایەوە زیاتر لە قیڕەی بۆق و دەنگە بێزارکەرەکەی زیک زیکە , لەژێر ڕوپۆشی ئاوازی دەزگا ئەلەکترۆنیەکاندا , دزەکان بە مشار شیشە ئاسنەکانیان دەبڕیەوە و دەچوونە ماڵەوە دەزگاکانی ناردن , تەلەفزیۆن , کامێرا , ڕادیۆ , خشڵ و زێڕ و جل و بەرگیان دەدزی , هەندێک جار ئەوەندە برسی بوون هەرچی لە بەفرگرەکەدا بوایە لوشیان دەکرد , یان بەبێ شەرمانە دەوەستان و ویسکی ناو کۆگا و بارەکانیان دەخواردەوە , کۆمپانیاکانی دڵنیایی پارەی یەک شووشە لینکۆریان نەدا , ئەمەش زیانێکە خاوەن موڵکەکە گەورەی دەکرد. دەیوت: دزەکان نرخی ئەوە نازانن کە دەیخۆنەوە.
پاشان کاتێک دێت خەڵکانێکی زۆر لەو ناوەدا دەسوڕێنەوە کە نۆکەرو باخەوان نین متمانەیان پێبکرێت چونکە ئیشیان پێنەکراوە , هەندێکیان سورن لەسەر کارکردن , گیا ڕواندن یان بۆیەی بنمیچ , هەرشتێک گەورەم , خانمەکەم , بەڵام ژن و پیاوەکە ئاگاداریەکەیان بیر کەوتەوە دژی کردنە ژوورەوەی هەر کەسێک لە شەقامەکەوە , هەندێکیان شەرابیان دەخـــواردەوە و شەقامەکەیان بە شووشە فڕێدراوەکان پیس دەکرد .
هەندێکی تر چاوەڕێیان کرد تاوەکو پیاو و ژنەکە ئۆتۆمبیلەکە لێدەخوڕن بۆ دەرەوەی دەرگا ئەلەکترۆنیەکان , دانیشتبوون و قاچیان لەژێر ئەو درەختانەدا ڕاکێشابوو کە شەقامەکەی کردبووە تونێلێکی سەوز , شوێنێکی جوان بوو , تەنها هاتنی ئەوان تێکی دابوو , هەندێک جار لەبەردەم دەرگاکان لەژێر خۆری نیوەڕۆدا دەنوستن.
ژنەکە نەیدەتوانی کەسێکی برسی ببینێت بۆیە نان و چای بە کارەکەرە متمانە پێکراوەکەدا دەنـارد , بەڵام کارەکەرە متمانە پێکراوەکە وتی ئەوانە بەرەڵان دێنە ژوورەوە تاوەکو بیبەستنەوە و لە مەخزەنەکەدا بەندی بکەن , مێردەکەی وتی: ڕاست دەکات با بەقسەی بکەین.
تۆ بەنان و چاکەت هانیان دەدەیت , ئەوان بەدوای هەلدا دەگـەڕێـن..... پیاوەکە هەموو شەوێک پاسکیلە سێ تاییەکەی منداڵەکەی لە باخچەکەوە دەبردە ژوورەوە , چونکە ماڵەکە بەباشی پارێزرابوو , هەر کە دادەخراو بەهۆی دەزگـای ئاگادار کردنەکەشەوە , تەنانەت لەم حاڵەتەشدا کەسێک دەتوانێت بە دیوارەکە یان دەرگاکەدا کە بەشێوەیەکی ئەلەکترۆنی داخراوە هەڵگەڕێت و بچێتە ناو باخچەکەوە.
ژنەکە وتی: تۆ ڕاست دەکەیت. کەواتە پێویستە دیوارەکە بەرزتر بێت. ژنە جادوبازە داناکە , دایکی پیاوەکە , بۆ خشتە زیادەکان کرێی زیادەی دەدا وەک دیاری سەری ساڵ بۆ کوڕەکەی و ژنەکەی. منداڵەکەش جل و بەرگی فەزایی و کتێبی چیرۆکی خورافی دەستکەوت. بەڵام هەموو هەفتەیەک هەواڵی ماڵ بڕین هەبوو بە ڕۆژی نیوەڕۆ ونیوە شەو , لەبەرەبەیاندا , تەنانەت لەئاوابوونی خۆرە جوانەکەی هاویندا کاتێک خێزانێک نانی ئێوارەیان دەخوارد , ژوورەکانی نوستن لەقاتی دووەم دەبڕان — لەکاتێکدا پیاو و ژنەکە باسی دوا ڕووداوی ماڵ بڕینیان دەکرد کە لە دەوروبەرەکەدا ڕوویداوە , دیمەنی پشیلە نازدارەکەی منداڵەکە سەرنجی ڕاکێشان کاتێک بەزەحمەت بەو دیوارەدا سەردەکەوت , کە بەرزیەکەی حەوت مەتر بوو , پاشان زۆر بە تیژی و بەهۆی چڕنوکە تیژەکانیەوە بەسەر لێژاییەکەدا دەهاتە خوارێ , پاشان بە کلکی سوکە بازێکی هەڵدا خشەخشێکی لەناو وایەرەکاندا دروست کرد , پاشان بەهاتن و چوونەکەی لەسەر دیوارە بۆیاخ کراوەکە بە سپی نیشانەی دادەنا , لەپاڵ ئەو دیوارەی بەسەر شەقامەکە دا دەڕوانێت پەڵەیەکی خۆڵاوی سوری پێوە بوو , دەشێت جێ پێی جۆرێک لە پێڵاوە شڕی ڕاکردن بێت وەک ئەوەی لە پێی بەرەڵاکاندا بینرا , کە کارمەند نین و بە ئەنقەست ئەو پەڵانە دانراوە.
کاتێک پیاوەکە و ژنەکەی و کوڕە بچووکەکە سەگە نازدارەکەیان برد بۆ پیاسە بە شەقامەکانی گەڕەکەکەدا , نەوەستان تاوەکو سەرسامی خۆیان دەربڕن بە دیمەنی گوڵەکان یان ئەو باخەی کە پەرژینێکی جۆراوجۆر بەدەوریدا کرابوو , دیوار , ئامێرەکان بەری گرتبوون , پیاو و منداڵە بچووکەکە و سەگەکە , شتێکیان بینی کە کەمتری تێچوو بوو , پێکهاتبوو لە پارچە شووشەی شکاو تێکەڵ بە چیمەنتۆی سەر دیوارەکە کرابوو , تۆڕێکی ئاسنی کە لاکانی تیژ بوون , هەروەها پێکهاتەیەک کە لەگەڵ جوانی نەخشەی بەندینخانەکە لەگەڵ نموونەی ڤیلا ئیسپانیەکە بگونجێت (بزمارە بەیەکداچووەکان کە بەڕەنگی مێخەک بۆیە کرابوون) لەگەڵ عەرەبانە گەچیەکان

بۆ رووکاره نیو کلاسیکیەکان , بزماری ١٢ ئینجی , بە خەتێکی پێچاوپێچ , بە ڕەنگی سپی بۆیەکراو) هەندێک لە دیوارەکان تابلۆیەکی بچووکیان لەسەر هەڵواسرابوو , ناو و ژمارە تەلەفۆنی ئەو کۆمپانیایەی لەسەر بوو کە بەرپرسە لە بەستن و دانانی ئەو ئامێرانە. لەکاتێکدا منداڵەکە و سەگە بچووکەکە بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتن , ژن و مێردەکە دەیانویست خۆیان بەراود بکەن بە هەموو پێشهاتێک کە ڕوودەدات. دوای چەند هەفتەیەک لەبەردەم هەر بەربەستێکدا دەوەستان بێ ئەوەی قسە بکەن , هەردووکیان گەیشتنە یەک ئەنجام کە تەنها یەک کەس شایەنی بیرکردنەوەیە. هەرە ناشرینەکەیان ڕاستگۆتر بوو لە شێوازی سەربازگەی ئەشکەنجەدان. زەخرەفەی تێدا نییە , بەڵکو گوزارشت لە چالاکیەکی تەواو دەکات. بە درێژایی دیوارەکە دانرابوو. لە کانزایەکی ڕەقی پێچاوپێچ و بریقەدار و تیژ پێک هاتبوو , بە جۆرێک کە کەس نەیدەتوانی بە بێ کێشە پێیدا سەربکەوێت یان بە تونێلەکەیدا بڕوات , دەرباز بوونیش نەبوو , هەوڵدان بۆ دەرباز بوون دەبێتە هۆی خوێن ڕۆیشتنی زیاتر , تەڵەیەک کە زیاتر گۆشتەکە دەبڕێت و پارچە پارچەی دەکات. ژنەکە تەماشای کرد و تەزویەکی پێدا هات , مێردەکەی وتی: تۆ ڕاست دەکەیت , هەرکەسێک بێت دووجار بیر دەکاتەوە ....

بەگوێی ئەو ئامۆژگاریەیان کرد کەلەسەر تابلۆیەکی بچووک نوسرابوو بەسەر دیوارەکەوە: ڕاوێژ بە ددانەکانی ئەژدیها بکەن , ئەو مرۆڤانەیش کە دڵنیاییەکی تەواو دەدەنێ . ڕۆژی دوایـی کۆمەڵێک کرێکار هاتن چەند شتێکی پێچراوەیان دا بەسەر دیواری ئەوماڵەدا کە پیاو و ژن و کوڕە بچووکەکە , سەگەکە , پشیلەکە , بە بەختیاری تێیدا دەژیان , تیشکی خۆر بەسەر ئەو نوکە تیژانەی کۆرنیشەکەوە دەبریسکایەوە کە دەوری ماڵەکەیان دابوو , پیاوەکە وتی گرنگ نییە , ژەنگ هەڵدێنێت , ژنەکە وتی تۆ هەڵەیت , زامنی دەکەن کە ژەنگ هەڵناهێنێت .

ژنەکە چاوەڕێی کرد , تاوەکو منداڵەکە ڕایکرد و یاری بکات پێش ئەوەی پێی بڵێت ئاگات لە پشیلەکە بێت.... مێردەکەی وتی: مەترسە ئازیزەکەم هەمیشە پشیلە چاوەڕێ دەکات پێش ئەوەی باز بدات. بەڕاستیش لەو ڕۆژە بـەدواوە پشیلەکە لە جێگەی کوڕە بچووکەکەدا دەنوست و لەباخچەکەدا دەمایەوە , بێئەوەی هیچ هەوڵی تێکدانی ئاسایش بدات.

ئێوارەیەکیان دایکەکە چیرۆکێکی خورافی بۆ کوڕە بچووکەکە خوێندەوە تا بیخەوێنێت لەو کتێبەدا کە جادوبازە پیرەژنە داناکە بەبۆنەی جەژنی لەدایک بوونەوە پێشکەشی منداڵەکەی کردبوو , لە ڕۆژی دواییدا منداڵەکە وەک شازادەیەک خۆی دەرخست کە بەرەنگاری جەنگەڵی دڕک وداڵە ترسناکەکە دەبێتەوە , تاوەکو بچێتە ناو کۆشکەکەوە و جوانکیلە نوستووەکە ماچ بکات و بەئاگای بێنێتەوە , پەیژەیەکی بۆ لای دیوارەکە ڕاکێشا , تونێلە پێچاوپێچە ڕووناکەکە ئەوەندە پان بوو بەشی لاشە بچووکەکەی دەکرد پیایدا بچێت , کاتێک ددانە تیژەکانی لە ئەژنۆ و سەر و دەستەکانی گیر کرد , قیژاندی و هەوڵیدا کەچی زیاتر لە شریتەکە گیر بوو , کارەکەرە متمانە پێکراوەکە و باخەوانەکە لەو ڕۆژەدا کاریان دەکرد , بەڕاکردن هاتن , منداڵەکەیان بینی و قیژە دەستی پێکرد , باخەوانە گەڕۆکەکە دەستی بڕا کە هەوڵی دا کوڕە بچووکەکە بێنێتە دەرەوە , پاشان پیاوەکە و ژنەکە بە هەڵەداوان هاتن بۆ باخچەکە , لەبەر هەر هۆیەک (بەزۆری پشیلەکە بوو) دەنگی دەزگای ئاگادارکردنەوەکە لەگەڵ قیژەکەدا دەرچوو لەکاتێکدا ئەو بەشەی جەستەی منداڵەکە کە خوێنی لێ دەڕۆیشت لە وایەرە پێچاوپێچەکان و سویچ و شیشەکان دەکرایەوە , پاشان پیاوەکە و ژنەکە و کارەکەرە متمانە پێکراوەکە کە توشی هیستریا ببوو , باخەوانەکەش کە دەگریا — منداڵەکەیان هەڵگرت و بردیانە ژوورەوە.

نادین جۆردیمەر

لەساڵی ١٩٢٣دا لە باکوری ئەفەریقا لەدایک بووە .*

*چالاکەوانێکی سیاسی بوو , زۆری لەبارەی پەیوەندی نێو ڕادیکالیە سپیەکان و لیبرالیە ڕەشەکان نوسیوە

*زۆرترین کاری خوێنراوەی ڕۆمانەکانی (میوانی بەڕێز) و ( پارێزکار) ە

*ساڵی ١٩٩١ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە .

سەرچاوە : کتێبی (القفزە ) وچیرۆکی تریش

## مران ٢٤ ژوین ١٩٢٠ پێنج شەممە

مرۆڤ دوای شەوخەوێکی ناخۆش لەوکاتە وریاترە کە خەوی خۆشی لێ کەوتبێت. دوێنێ کەمێک باشتر نووستبووم بۆیە ئەو هەڵیت و پڵیتانەم لەبارەی سەفەرەکەی ڤیەناوە نووسی. ئاخر سەفەرەکە هەروا بابەتێکی بێ بایەخ و مایەی گاڵتە نیە. دەبێت تۆ لەوە دڵنیابیت کە بە هیچ جۆرێک من سەرزەدە نایەم بۆ لات. ئەمە شتێکە کە بیری لێ دەکەمەوە لەرز دام دەگرێت. من نیازی هاتنە ئاپارتمانەکەتم نیە. ئەگەر رۆژی پێنج شەممە لەرێی پۆستی باوە[1] نامەت بە دەست نەگەیشت ئەوا من لە پراگم. ئەوەندەی من ئاگاداربم لە وێزگەی خۆراوا دادەبەزم. (وابزانم دوێنێ شەو وێزگەی باشوورم نووسیبوو) بەڵام ئەم مەسەلەیە ئێستا گرنگ نیە. من بەو مەرجەی کەمێک خەوتبێتم، ئیتر ئەوە نیە لە ڕادەبەدەر خۆم لە کار بدزمەوە یان کەمتەرخەمی بکەم. لەم ڕووەوە ترست نەبێت. ئەوەندە بەسە سواری شەمەندەفەر بم و بەڕاستیی بگەمە شوێنی مەبەست. تەنیا سواربوونەکە بۆ من ناخۆشە. بۆیە خوات لەگەڵ (بێگومان نابێت ئەم ماڵئاوایی کردنە لە ڤیەنا بێت. لە نامەیشدا هەر دەکرێت)

ف

دەربارەی ناوی میلنا دەبێت بڵێم کە هیچ پەیوەندیەکی بە جوولەکایەتی و جەرمانیەتەوە نیە. ئەوانەی زمانی چیک لە هەموو باشتر دەزانن (دیارە بێجگە لە جوولەکەکانی چیک) بەڕێزان naserec[2] کە پەیوەندیان بە زمانی ئێمەوە نیە. بە پلەی دوەم خوێنەرانی ئەم بڵاڤۆکە زمانی چیکی باشتر تێ دەگەن، بە پلەی سێیەم بەشداربوەکانی ئەم بڵاڤۆکەکە من بە یەکێک لە خۆیان دەزانن. بۆیە من پێت دەڵێم تاقە شتێک کە لە زمانی چیکیدا لە میلناوە نزیک بێت بچووک کراوەی میلنکایە[3]. ئیتر تۆ لات پەسەندە یان نا ئەمە ڕای زماننناسانە.

کە گەیشتمە ڤیەنا نامەت بۆ دەنووسم یان لە پۆستەخانەوە تەلگورافت بۆ دەکەم. سێ شەممە یان چوارشەممە. بێگومان من پوول بە هەموو نامەکانەوە دەنێم. ئایا دیارنیە ئەگەر پوولەکانیان لە زەرفەکە کردبێتەوە[4]؟

## مران ٢٥ ژوین ١٩٢٠ عەسری هەینی

---

١ جۆرە سیستمێکی پۆستیە

٢ ئاماژەیە بە بڵاڤۆکێکی کۆڕی زانیاری و هونەری چیک کە بۆ پاراستنی زمانی چیک دامەزرابوو چەند زانایەک هەڵیان سووڕاندوە. و.ف

٣ کافکا ڕای وایە میلنا ناوێکی لاتینیە. بچوک کراوەی میلنکایە کە وشەیەکی چیکیە بەمانای (دڵدار).

٤ گوایە میلنا حەزی بە پوول کۆکردنەوە هەبوە و پۆستەچیەکەیش هەروا.

ئەمڕۆ گەوجانە شتێکم نووسی. هەنووکە هەردوو نامە ئازیز و پڕ لە سۆزەکەتم پێ گەیشت. من وەڵامی هەردوو نامەکە بە ئامادەبوونی خۆم دەدەمەوە. ئەگەر شتێکی چاوەڕوان نەکراو- ناوەکی یان دەرەکی- نەیەتە پێش، من ڕۆژی سێ شەممە لە ڤیەنا دەبم. ئەگەر پێشتر پێت بڵێم لەکوێ چاوەڕێم بکەیت کارێکی ئاقڵانەترە (وابزانم ڕۆژی سێ شەممە پشوە، لەوانەیە ئەو پۆست خانەیەی دەمەوێت لەوێوە تەلگورافت بۆ بکەم یان نامەت بۆ بنێرم ئەو ڕۆژە داخرابێت) بەڵام ئەگەر بڕیاربێت هەر ئەمڕۆ، لەم چرکەساتەدا، ناوی شوێنێک بهێنم و بە ناچاریی بەردەوام و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و سێ شەو، ئەو جێگایە ببینم کە چۆڵ و هۆڵ لە چاوەڕوانی گەیشتنی مندایە لە سەعاتێکی دیاری کراوی ڕۆژی سێ شەممەدا، ئەوە دەخنکێم. میلنا! ئایا لە دنیادا جێگایەکی وا بوونی هەیە ئەوەندەی من پێویستیم پێیەتی بە ئارام بێت؟ ڕۆژی سێ شەممە وەڵامی ئەمەم بدەرەوە.

ف

## نامەی کارتی پۆستی ڤیەنا ١٩٢٠/٦/٢٩
## سێ شەممە سەعات ١٠

پێ ناچێت ئەم نامەیە پێش سەعات ١٢ بگات. یان لەوانەیە بەدڵنیایەوە هەر نەگات. ئێستا سەعات دەیە. کەواتە دەکەوێتە سبەی بەیانی. ڕەنگە خۆشیەکەی لەوەدابێت. چونکە هەرچەندە من لە ڤیەنام و لە کافەیەکی نزیک بە وێزگەی باشوور دانیشتووم (ئیدی ئەمە چ جۆرە کاکاوێکە. ئەمە چ جۆرە شیرینیەکە؟ ئایا تۆ بەم شتانە دەژیت؟) لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا من بەتەواویی لێرەنیم. دوو شەوە نەخەوتووم. هەرچەندە نازانم لە ئوتێل دیوای نزیک بە وێزگەی باشوور، کە لە پاڵ گەراجێکدام دەتوانم بنووم یان نا. لەمە چاکتر بۆ من ڕێ ناکەوێت کە بڵێم: بەیانیی چوارشەممە سەعات ١٠ لەبەردەم ئوتێلەکەدا چاوەڕێت دەکەم میلنا. داواکارم کە لێم نزیک دەبیتەوە لە پشتەوە یان لە پەناوە غافڵ گیرم نەکەیت. منییش بەڵێنت پێ دەدەم ئەو کارە نەکەم. ڕەنگە ئەمڕۆ لە دیمەنەکان بڕوانم: شەقامی لرشن فلدر، پۆستەخانە، گۆڕەپانی دەرەوە لە وێزگەی باشوورەوە تا شەقامی لرشن فلدر، ژنە خەڵوزفرۆشەکە و شتی ترییش. هەرچیەکی دی کە نابینرێت.

خۆشەویستەکەت

## پراگ ٤ ژولای ١٩٢٠ یەک شەممە

میلنا، میلنا، میلنا، بێجگە لەمە من ناتوانم هیچی تر بنووسم. بەڵام دەمەوێت بنووسم. میلنا! بۆیە ئەمڕۆ بە تەنیا و پەلە پڕوزکێ، شەکەتی و دووری (لەڕاستیا سبەینێش هەروا دەبێت) چۆن ماندوو نابم؟ بەڵینی سێ مانگ پشوو بە نەخۆش دەدەن و کەچی تەنیا چوار ڕۆژی دەدەنێ. کەمێک لە سێ شەممە و چوارشەممە و تەنانەت لە بەیانی و عەسرەکانیشی لێ دەکرایەوە. ئیتر ناهەقم نیە بڵێم هێشتا بەتەواویی چاک نەبوومەتەوە؟ ئایا هەقی خۆم نیە؟ میلنا (کاتێک کە تۆ لەوێ بە هەر هۆیەکەوە بێت لە پێخەفێکی چۆڵ و بەدبەختا لە خەونێکی قووڵدا ئارام بیت، کاتێکیش ئارام و ناهوشیار لە ڕاستەوە بۆ چەپ سووربخۆیت و ڕووت لە دەمی من بێت، ئەم قسەیە بە گوێی چەپتا دەکەم...

سەفەر؟ لە سەرەتادا شتێکی زۆر سادەبوو. مەحاڵ بوو بتوانیت لە ڕێگا ڕۆژنامە بکڕیت. بەڵگەیەکە بۆ هەڵاتن. تۆ ئیدی لەوێ نەبوویت. هەموو شتەکان باش بەڕیوە دەچوون. من سواربوومەوە. شەمەندەفەرەکە کەوتە جووڵە. من دەستم بە ڕۆژنامە خوێندنەوە کرد. هێشتا هەر شتەکان باش دەڕۆیشتن. دوای چرکەساتێک وازم لە خوێندنەوە هێنا، ئەوە ئەو کاتە بوو کە تۆ لەپڕێکدا لەوێ نەمابوویت. یان باشتری بڵێم تۆ لەوێ بوویت. بە هەموو بوونی خۆمەوە هەستم بە بوونت دەکرد. بەڵام ئەم جۆرە ئامادەگیە لەگەڵ چوار ڕۆژەکەدا زۆر جیاوازبوو. یەکەمجارم بوو خووی پێوە بگرم. دیسان کەوتمەوە خوێندنەوە، بەڵام یاداشتەکانی هیرمان بار لە باسی باد کروزندا نزیک بە گرین لەسەر دانوب دەستی پێ دەکرد. لەوێدا دەستم لە خوێندنەوە هەڵگرت. لێ کە تەماشای دەرەوەم کرد شەمەندەفەرێک تێپەڕی وشەی «گرین»ی پێوەبوو. تەماشای ناو واگۆنەکەم دەکەم. بەڕێزێک بەرانبەرمە و بڵاڤۆکی «نارونی لیستی» ڕۆژی یەک شەممە دەخوێنێتەوە. دووربەدوور چاوم بە پەراوێزێکی ڕوزینا یزنسکا[٥] دەکەوێت. بڵاوکراوەکەی لێ وەردەگەرم و هەر ئاوا دەست بە خوێندنەوەی دەکەم. لەوکاتەدا بەرانبەر بە ڕوخسارت، تەواو وەک ئەو کاتەی لە وێزگەکە ماڵئاواییت لێ کردم دانیشتووم. ئەوەی وێزگەکە هێند سروشتی بوو کە هەرگیز پێشتر شتی وام نەدیبوو. خۆر تاریک دەبێت، بەڵام نەک بەهۆی هەورەوە بەڵکوو هەر خۆی تاریک دەبێت. چی تر بڵێم؟ نە هەناسە بوار دەدات و نە دەستیش فەرمان قبووڵ دەکات

خۆشەویستەکەت

سبەینێ چیرۆکێکی تری ئەم سەفەرە سەیرە دەست پێ دەکاتەوە.

## پراگ ژولای ۱۹۲۰ یەک شەممە

پۆستەچی ئەم نامەیەت بۆ دێنێت (تکایە خێرا بیدڕێنە، نامەکەی ماکسیش هەر وا لێ بکە) ئەو وەڵامێکی

٥ Ruzena Jesenaka ناوی خوازراوی میلنا لە چیرۆکە خۆماڵیەکانیدا.

خێرای گەرەکە، من دەنووسم سەعات ٩ لەوێ دەبم، ئەوەی دەمەوێت بیڵێم زۆر ڕوونە. بەڵام بەڕاستیی نازانم چۆنی بڵێم. ئای وای جا ئەگەر ژنم بهێنایە[٦] کە دەگەیشتمە ماڵەوە لەباتی پۆستەچی پێخەفم دەبینی، پێخەفێکی بوارئاسا کە ڕێگای ڕۆیشتنت هەرگیز پێ نەدات، مەگەر لەڕێی خۆشاردنەوە لە ڕاڕەوێکی ژێر زەویی میترودا بۆ ڤیەنا.

وا بە خۆم دەڵێم تا خۆم بەوە قایل بکەم کە ئەو کێشانەی لە پێشمدان چەندە ئاسانن.

خۆشەویستەکەت

نامەت بۆ دەنێرم. دەڵێیت بەم کارە کاتێک سەر و خواری شەقامەکە لە بەرامبەر ئەو ماڵەدا دەکەم، دەتوانم تۆ لە خۆم نزیک بکەمەوە.

## پراگ ٤ تا ٥ ژولای ١٩٢٠ – یەکشەممە سەعات ١١:٣٠

(٣)[٧]

من هیچ نەبێت ژمارە لەسەر نامەکان دادەنێم. تا بەوجۆرەی ئەو ڕۆژە کە من لە باخچە بچووکەکەدا تۆم لێ ون نەدەبوویت. هیچ یەکێک لەم نامانەیش نەتوانن لە تۆ ون بن. دەبێت هەموویان پێت بگەن.

بەهەرحاڵ، هەرچەندە بە گشتی هەمووشتێک ئاشکرایە و ئەوەی پەیوەندیی بە منەوە بێت بە ڕوونی دەرم بڕیوە. ناکەومە وردەکاریەوە تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەو[٨] لەبارەی من و تۆوە تەنانەت دووربەدووریش بێت تووڕەبوونم لێ نەدیوە. ئەمەندە زێدەڕۆییم لە ڕوونیدا هەبوو کە هەستی هاودەردیی و سۆزم نەمابوو. هەر ئەوەندەم توانی ڕاست گۆیانە بڵێم کە لەنێوان من و تۆدا هیچ نەگۆڕاوە و لەوانەیشە نەگۆڕێت. مەگەر- ئیتر بەسە- ڕووداوێکی تەواو بەدفەڕە. ئەمە کاری خوێن ڕێژە نەک من. تەنیا شتێک هەیە پێت بڵێم میلنا. ئەگەر بەڕاستیی ئەو نەخۆش بێت (تەندروستیی هەرگیز باش نەدەهاتە بەرچاوم و بێ ئەنداز نائومێد بوو. سبەی بەیانی ناچارم بچمەوە بۆ بینینی) بەڵێ، ئەگەر ئەو نەخۆش بکەوێت یان شتێکی تری لێ ڕووبدات، ئیدی من هیچم بۆ ناکرێت. چونکە تاقە کارێک کە من دەتوانم بیکەم ئەوەیە هەقیقەتەکەی پێ بڵێم و بەردەوامیش بم لەسەری. هەقیقەت نەک تەنیا هەقیقەت بەڵکوو شتێک لەو زیاتر (هەقیقەت) ئەوەیە ئەوکاتەی لەگەڵ ئەودا پیاسەدەکەم نوقمی تۆم. بۆیە، جارێکی تریش دەیڵێمە، ئەگەر شتێک ڕوویدا، ئەوکاتە میلنا، پێویستە بێیت.

ف.

قسەی بێ مانا، بێگومان تۆ هەر لەبەرئەوە نایەیت.

سبەی (نامە بۆ باوکم)ت بە ناونیشانی ئاپارتمانەکەت بۆ دەنێرم. تکایە باش ئاگاداریی بکە. لەوانەیە

٦ پێ دەچێت مەبەستی لە هێنانی (ژولی وریزکی) دوەم دەزگیرانی کافکا بێت.

٧ ژمارە دانان لەسەر نامەکان لەلایەن خودی کافکاوە کراوە، لەم دەقانەدا ژمارە ١ و ٢ نیە. و.ف.

٨ پێ دەچێت ئاماژەبێت بە ژولی وریزکی دەزگیرانی کافکا

ڕۆژێک بڕیاربدەم بیدەمە باوکم. ئەگەر کرا مەهێڵە کەسی تر بیخوێنێتەوە. لەکاتی خوێندنەوەیدا هەوڵ بدە هەموو فێڵ بازیەکانی پارێزەرێکی بەرگری کەری تیا بدۆزیتەوە. ئەمە نامەی پارێزەرێکی بەرگیریکارە. کاتێک ئەوە دەکەیت هەرگیز ئەمە و «شتی»ە گەورەکانی تریشت لەبیرنەچێت.

## پراگ ٥ ژوڵای ١٩٢٠ – بەیانیی دووشەممە

(٤)

ئەمڕۆ بەیانیی زوو نامەی ڕۆژی هەینیتم بە دەست گەیشت و پاشان نامەی شەوی هەینیش. ئای کە دەم و چاوت لە وێزگەی ڕێگای ئاسندا چەند ئازیز و خەمباربوو. یەکەم نامەت زۆر خەمگین بوو. خەمگینیەکەی لەبەر ئەوەنا کە ناوەرۆکەکەی چی بوو، بەڵکوو بەهۆی ئەوەوە کە کاتەکەی تێ پەڕیبوو. نامەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ڕابووردووەوە هەبوو. پێکەوە لە دارستاندا، پێکەوە لە دەرەوەی شار، پێکەوە سواربوون. چۆن کۆتایی هەموو ئەمانە وێنا دەکرێت. بە پاڵ یەکەوە سواربوون لە ناوەڕاستی شەقامە بەردینەکاندا و گەڕانەوە بە کۆڵانەکاندا کۆتاییان نیە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم قسەیە کە ئەمانە بێ کۆتا بن گاڵتەیەکی گەوجانەیە. بەڵگەکانی ئێستا لە بەرانبەری مندان. چەند نامەیەک کە هەر ئێستا خوێندنمەوە. بەخێرهاتن و سڵاوکردن لە سەرۆک (لەباتی ئەوەی فەرمانی دەرکردنم بدات) و چەند نامەیەکی تر کە لەم لا و لەولاوە بڵاوبۆتەوە. لە هەموو ئەم ماوەیەدا زەنگێکی بچووک لە گوێمدا لێ دەدات کە زمان حاڵەکەی بەم جۆرەیە:
((ئیدی میلنا لەگەڵ تۆدا نیە)) هەرچەندە زەنگێکی بەتوانای تر لە جێگایەکی ئاسمانەوە بە زمانی حاڵ دەڵێت: ((ئەو واز لە تۆ ناهێنێت)) بەڵام زەنگە بچووکەکە بەڕاستی لەگوێمدایە و نامەیەکی تریش کە پەیوەندیی بە شەوەوە هەیە و نازانیت بۆ ناتوانیت بیخوێنیتەوە. نازانم بۆ ناتوانم سنگم بکەمەوە و بەپێی پێویست هەوا هەڵمژم. نازانم بۆ ناتوانم ئەوەندە لە تۆ دووربم.
لەگەڵ ئەمانەیشدا سکاڵا ناکەم. ئەمانە گلەیی نین و من بەڵێنی تۆم لایە.
ف.

من چیرۆکی (ژەنیارە هەژارەکە)ت بۆ دەنێرم. لەبەرئەوە نیە کە چیرۆکەکەم زۆر لا گرنگ بێت (هەرچەندە چەند ساڵێک لەمەوبەر وابوو) بەڵکوو لەبەر ئەوەی زۆر ڤیەنابیە. گەلێک بێ ئاهەنگە لەبەرئەوەی مرۆڤ دەخاتە گریان. لەبەرئەوەی ئەو لە باخچەی میللیەوە بە چاوی سووکەوە لە ئێمەی دەڕوانی (من و تۆ! چونکە تۆ بە پاڵ منەوە پیاسەت دەکرد میلنا. بیری لێ بکەوە. تۆ بەپاڵ منەوە پیاسەت دەکرد) لەبەرئەوەیش کە ئەو زۆر بورۆکراسیە و لەبەرئەوەیش کە عاشقی کچێک بوو کە لە کارەکەیدا سەرکەوتووبوو.

ئێستا گوێ لە دەنگوباسی سەفەرەکەم بگرە. پاشان پێم بڵێ کە تۆ فریشتە نیت. پێشتر دەمزانی ڤیزەکەی نەمسام لەپێش دوو مانگەوە بەڕاستی و بە مەجازییش تەواو بوە. بەڵام لە مران پێیان وتبووم

پێویستم بە ڤیزە نیە. لەڕاستیدا بۆ هاتنە نەمسا من هیچ کێشەیەکم نەهاتە ڕێ. بۆیە ئەوکاتەی لە ڤیەنا بووم بەتەواویی ئاگاداریی ئەم هەڵەیە نەبووم. لێ لە گموند، یەکێک لە کارمەندەکانی ئۆفیسی ڤیزە، کە لاوێکی توند و تیژ بوو زوو هەستی بە هەڵەکە کرد. ڤیزەکەمی خستە لاوە. مۆڵەتی ڕۆیشتنی بە هەمواندا من نەبم. بارم لە پێشوو خراپتربوو (بـەردەوام بێزارم دەکەن. هەرچۆنێک بێت دوای سەفەرەکە ئەمە یەکەم ڕۆژە هاتبمە ئۆفیسەکە، بۆیە ناچار نیم گوێ لە چەنەبازیەکەی بگرم. بەردوامییش یەکێک دێت بۆ ئەوەی من لە تۆ دووربخاتەوە. لەڕاستیدا تۆ لە من دووربخاتەوە. بەڵام میلنا ئەو جۆرە کەسانە سەرکەوتوونابن، وانیە؟ هیچ کەسێک، هەرگیز) بەڵێ، دۆخەکە بەو جۆرە بوو. بەڵام لەدواییدا کاریگەریی تۆ هاتە ئاراوە. یەکێک لە پاسەوانەکانی سنوور پەیدادەبێت (کەسێکی میهرەبانی، ڕاست گۆ، نەمساوی، گەلێک بە بەزەیی) بەرەو قاتی سەرەوە ڕێنماییم دەکات. لەوە بەدواوە پاش ئەوەی بە ڕاڕەوەکاندا تێ دەپەڕین، دەگەین بە چاودێریی کەری سەر سنوور. لەوێ ژنێکی جوولەکەی ڕۆمانی وەستاوە و ڤیزەکەی ئەوییش وەک ئەوەی من کەم و کورتی تیایە. ئەی فریشتەی پاسەوانی جوولەکە، سەیر ئەوەیە یەکێک لەوانەی تۆ بە نهێنی لەوێت داناوە دەردەکەوێت، بەڵام هێزە دژەکان هێشتا دەستەڵاتیان هەیە و بەتوانان. چاودێرە گەورەکە و یارمەتیدەرە بچووکەکەی (هەردووکیان لاواز و ڕەنگ زەرد و لانی کەم لەوساتەدا دەم و چاو ترشاون) گوزەرنامەکە وەردەگرنەوە. چاودێرەکە خێرا مەبەستەکەیان پێ دەڵێت: (بگەڕێنەوە بۆ ڤیەنا، بڕۆن بۆ بەڕێوبەرایەتی پۆلیس ڤیزەیەکی تازە بۆ گەڕانەوە وەربگرن) من لەوە زیاترم پێ ناکرێت کە چەند جارێک بڵێم: ((ئەم کارە بۆ من ترسناکە)) چاودێرەکە بە قین و ڕقەوە چەند جارێک وەڵام دەداتەوە: ((ئەوە بەتەنیا لای تۆ وایە)) ((ئەی ناکرێت بەهۆی تەلگورافەوە ڤیزە ئامادە بکرێت؟))

- نەخێر! نابێت.
- ئەی ئەگەر هەرچیەکی تێ دەچێت هەمووی بدەم؟
- نا، نابێت.
- ئەی لێرە دەستەڵاتێکی باڵاترنیە؟
- نا، نیە.

ژنەکە کە من بەو ناڕەحەتی و ئـازارەوە دەبینێت و خۆیشی شکۆمەندانە بێدەنگ وەستاوە، داوا لە چاودێرەکە دەکات هیچ نەبێت ڕێگای ڕۆیشتن بە من بدات، هەوڵێکی بێ سوودە میلنا. بەم شێوازە لەو شەڕە ڕزگارم ناکەیت. دەبێت تا بەڕیوەبەرایەتی گوزەرنامە بە پێ بگەڕێمەوە و شتەکانم بێنم. بۆیە ئەمڕۆ بە هیچ جۆرێک ناتوانم سەفەرەکە بکەم. هەنووکە ئێمە لە ژووری چاودێری کەریی سنوور دانیشتبووین، تەنانەت پاسەوانەکەیش ناتوانێت کارێکمان بۆ بکات. تەنیا ئـەوە نەبێت بڵێت بلیتەکان لە کارناکەون هتد... لەم جۆرە قسانە. چـاودێـرەکـە دوا قسەی خـۆی کـردوە و چوەتە نووسینگە تایبەتیەکەیەوە. تەنیا هاوکارە بچووکەکە هێشتا ماوەتەوە، من خەریکی لێکدانەوەی خۆمم: شەمەندەفەری دوایی کە بۆ ڤیەنا دێت سەعات دەی پاش نیوەڕۆ دەجووڵێت (سەعات دوو نیوی بەیانی دەگات، هێشتا جێ گازی چنگنەکانی ئوتێل ڕیڤام




پێوەیە. باری ژوورەکەم لە وێزگەی فرانز جوزف باهنهوف چۆن دەبێت؟ بەڵام بەهەرحاڵ ژوورێکم دەست ناکەوێت. پاشان من (بەڵێ، سەعات ٢:٥) دەڕۆم بۆ لرشن فلدر و داوای ژوورێـک دەکەم (بەڵێ، سەعات پێنجی بەیانی) چی دەبێت بابێت. من هەردەبێت بچم، بۆ ئەوەی بەیانیی ڕۆژی دووشەممە ڤیزەکەم وەربگرم (بـەڵام تۆ بڵێی یەکسەر ڤیزەکەم بدەنێ نەمخەنە ڕۆژی سێ شەممە؟) پاشان دێم بۆ لات، لەبەردەم دەرگایەکدا کە تۆ دەیکەیتەوە غافڵگیر و سەرسامت دەکەم. ئای وای، لەو شوێنەدا هەموو بیرۆکەکان دەوەستن و پاشان دووبارە زیندوو دەبنەوە: دوای شەوێکی نـاو شـەمـەنـدەفـەر دەبـێـت حاڵم چـۆن بێت؟ دیسانەوە دەبێت عەسر بەپەلە سەفەرێکی شانزە سەعاتی تر بکەمەوە. کە دەگەمەوە پراگ دەبێت چیم بەسەر هاتبێت؟ سەرۆکی ئۆفیسەکەیش کە دەبێت ئێستا بەهۆی تەلگورافەوە داوای درێژکردنەوەی مۆڵەتەکەم بکەم چیم پێ دەڵێت؟ تۆ هەرگیز ناتەوێت ئەم پێش هاتە ڕووبدات بەڵام ئەی تۆ چیت دەوێت؟ هیچ کارێکی تر نیە. من وای بۆ دەچم تاقە ڕێگایەک کە کەمێک کارەکە ئاسانتر بکات ئەوەیە شەو لە گموند بەسەربەرم و بەیانی زوو بەرەو ڤیەنا بێم. بەم جۆرەیان ، لەوکاتەدا کە زۆر شەکەتم دەتوانم بە هێوریی داوای شەمەندەفەری بەیانیی بـەرەو ڤیەنا لە بەردەستەکە بکەم. تاقە شەمەندەفەرێک هەیە لە سەعات ٥:٣٠ بەیانی دەکەوێتە ڕێ و سەعات ١١ دەگات. زۆرباشە، من و ئەو ژنە ڕۆمانیە بەو شەمەندەفەرە دێین. بەڵام لێرەدا لەپڕێکدا قسەکان بەرەو لایەکی تر دەچن. نازانم چۆن. بەهەرحاڵ

پێ دەچێت شاگردە بچووکەکە بیەوێت یارمەتیمان بدات. ئەگەر ئێمە شەو لە گموند بەسەربەرین، ئەو کە بە تەنیا لە نووسینگەکە دانیشتوە دەهێڵێت ئێمە هەرئاوا بە بێدەنگیی بەرەو پراگ سواری شەمەندەفەری ئاسایی ببین. ئەوکاتە ئێمە سەعات ٤ دوای نیوەڕۆ دەگەینە پراگ. زۆرچاکە، تاڕادەیەک زۆر باشە. چونکە من هەردەبێت تەلگورافێک بۆ پراگ بکەم. بەهەرحاڵ چاودێرەکە دەگات. ئێمە لەناو شەمەندەفەرەکەی ڤیەنادا کۆمیدیایەک سازدەکەین. پاشان بەردەستەکە دەرمان دەکات. پێویستە لە عەسرا ئێمە بۆ گفتوگۆکردنی زیاتر بە دزیەوە ئەو ببینین. من کوێرانە ڕام وایە هەموو ئەم شتانە کاری تۆن، لەکاتێکدا کە بەڕاستیی بێجگە لە هێرشی هێزە نەیارەکان چی تر نیە بەم جۆرە، من و ژنە ڕۆمانیەکە هێدی هێدی لە وێزگەکە دووردەکەوینەوە. (ئەو شەمەندەفەرە ئیکس پریسەکە دەبوا ئێمەی بگەیەنایەتە پراگ هێشتا لێرە وەستاوە، گومرگی شتەکان زۆر دەخایەنێت) تا شار ماوەکە چەندە؟ سەعاتێک. ئاوا! بەڵام دەڵێن دوو ئوتێل لە نزیکی وێزگەکەیە. دەچینە یەکێکیان. لە نزیک ئوتێلەکانەوە هێڵێکی ئاسن تێ دەپەڕێت. بۆ ئەوەی بگەیتە ئوتێلەکان دەبێت بەسەر ئەو هێڵەدا تێپەڕین. بەڵام لەوکاتەدا شەمەندەفەرێکی بارهەڵگر نزیک دەبێتەوە. لەوکاتەدا کە من دەمەوێت خێرا بپەڕمەوە ژنەکە بۆ دواوە ڕامدەکێشێت. دەوەستین و ڕێگاکەمان دەگیرێت. ناچارین چاوەڕێ بکەین. ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە کە هەر ئەم بەدبەختیەمان کەم بوو. بەڵام کارەساتەکە لێرەدایە. ئەگەر ئەم دواکەوتنە ڕووی نەدایە من ڕۆژی یەکشەممە نەدەگەیشتمە پراگ؟ تۆ دەزانیت (هەر بەو جۆرەی

کە تۆ لە وێزگەکەی خۆراوا لەم ئوتێلەوە بە ڕاکردن دەچوویت بۆ ئوتێلێکی تر) وائێستا لەم دەرگای بەهەشتەوە بۆ ئەو دەرگای بەهەشت ڕات دەکرد بۆ ئەوەی کارئاسانیم بۆ بکەیت. چونکە لەو ساتەدا کە فریشتە پاسەوانەکەی تۆ لەکاتێکدا لە وێزگەکەوە تا ئێرە بە هەناسەبڕکێ دوامان کەوتوە و هاوار دەکات: ((بگەڕینەوە. چاودێرەکە مۆڵەتی پەڕینەوەتان پێ دەدات)) ئایا ئەمە دەکرێت؟ ئایا دەکرێت؟ شتی وا گەروو وشک دەکات. دەبێت دەجار لە پاسەوان بپاڕێیتەوە بۆ ئەوەی پارەمان لێ وەربگرێت. هەنووکە دەبێت بە ڕاکردن بگەڕێینەوە. شتەکانمان لە نووسینگەکەی چاودێرەوە بێنین بۆ ئەولای ئۆفیسی گوزەرنامەکە و پاشان بەرەو گومرگ ڕاکەین. بەڵام لەدوای ئەمەوە پێویستە تۆ هەمووشتێکت ئەنجام دابێت: کاتێک کە ئیتر من ناتوانم بکەومە دوای بارکردنی شت و مەکەکانم، بارهەڵگرێک لە پەنامدا دەردەکەوێت. کاتێک لە ئۆفیسی گوزەرنامە ئاپوورەی خەڵکەکە بەرەو دواوەم دەبات، پاسەوانێک ڕێگام بۆ دەکاتەوە. کاتێک لە ئۆفیسی گومرگ بێ ئەوەی خۆم ئاگام لێ بێت قوتووی دوگمەی سەر کراسەکەم کە لە زێر دروست کراوە لێم ون دەبێت، کارمەندێک دەیدۆزێتەوە و بۆم دەهێنێتەوە. ئێمە سواری شەمەندەفەر دەبین و زوو بەڕێ دەکەوین. سەرئەنجام ئارەقەی سەروڕووم پاک دەکەمەوە. هەمیشە لەگەڵمابە.

ف.

سەرچاوە: نامەهای بەمیلنا

# ئەنتۆنیۆ مەچادۆ
## ژیان و بژاردەیەک لە شیعرەکانی

نووسینی: ڕۆبەرت بلیی
و. لە ئینگلیزییەوە: هێرش سەعید



ئەنتۆنیۆ مەچادۆ

ئەنتۆنیۆ مەچادۆ بە جۆرێ شیعر دەنووسێت، کە پاش لێ وردبوونەوە و ناسینیان، وا دەردەکەون وشەگەلێک بن لەلایەن هاوڕێیەکی زۆر نزیکمانەوە نووسرابن. هەمیشە (ئێمە)یەکی شاراوە لە شیعرەکانیا ئامادەیە:

دوێنێ شەو، کە نوستبووم،
خەوێکی سەیرم بینیی!
دەڕوانم وا پوورەیەک هەنگ
داوێتییە دڵم.
هەنگە تەڵاییەکانی
شانەی سپی و
هەنگوینی شیرین سازئەکەن،
لە شکستە کۆنەکانمەوە.

وا هەست ناکەیت ئەمە جۆرێک بێت لە دانپیانان؛ هیچ سکاڵایەکیش لە ئارادا نییە؛ هەستکردن بە کەڵکەڵەی شیعری دانپیانان لای ئەو زۆر کەمە. ئەو خەو دەبینێ کە هەنگەکان شانەی سپی و هەنگوینی شیرین سازئەکەن لە شکستە کۆنەکانیەوە. وێنەیەکی ئاوا هێمن و واقیعیی، لە توانای کەم کەسدایە.
خوێنەرانێکی زۆر بۆیان نوسیووم، ئەم هەڵبەستە تاقە هەڵبەستێک بووە کە لە ژیانیاندا یادیان گرتبێت.

ساڵێک کە زۆر گرنگ بێت لای مەچادۆ و نەوەی ئەوکاتە، ساڵی ١٨٩٨ ـە، ساڵی جەنگی ئیسپانی-ئەمریکی، کاتێک ئیسپانیا تەواوی ئیمپراتۆریەتەکەی لەدەست دا. ئەودەمە مەچادۆ بیست و سێ ساڵ بوو. دەرکەوت کە درۆ ڕەوانبێژییەکانی سیاسەتوانەکان و کەنیسە سەری لە هیچەوە دەرچوو. هەموو شتێک بەسەرچوو. تەواوی هەوڵە بازرگانییەکانی ئیمپراتۆریەت هەرەسی هێنا، گەنجانیش دەبایە بە چاوەڕوانیی کەمترەوە لە ئاینده، بە خەم و پەژارەوە بژیانایە. ئەمەش بە واتای سەرەتایەکی نوێ دەهات لە شیعردا؛ بەکارهێنانی وشەی کەم و دڵسۆزانە.

دەشێ، لەکاتێکا ئێمە نوستووین،
ئەو دەستەی کە ئەستێرەکان وەکو تۆو دەپرژێنێ
جارێکی دی مۆسیاقا دێرینەکەی ژەندبێ

ـ وەک نۆتەی چەنگێکی مەزن ـ
شەپۆلی نییان هاتە سەر لێومان
لە شێوەی یەک دوو وشەی دڵسۆزانە.

کاتی دەرسەکان بەسەرچوون. چۆن بەسەر ئەو بۆشاییەدا بپەڕینەوە کە کەوتۆتە نێوان ئێمە و کەسێکی تر؟

بۆ قسەکردن لەگەڵ کەسێ،
سەرەتا پرسیارێک بکە،
جا گوێبگرە.

مەچادۆ دەڵێت، گەر بەتەنها سەرنجی جیهانی ناوەوە بدەین، پێک نایەت؛ وە گەر تەنها سەرنجی جیهانی دەرەوەش بدەین، پێک نایەت؛ بۆ ئەفراندنی هونەر، دەبێت هەردوو جیهانەکە پێکەوە گرێدەین. ئەی ئەمە چۆن دەکرێت؟ مەچادۆ کورت و پوخت پێمان دەڵێت، پێویستە هەردەم چاوکراوە بین.

یەکێک لە کۆنترین یادەکانی، کە لە یەکێک لە یادەوەرەکانیدا بڵاوی کردەوە، ئەمە بوو: «پێم خۆشە گرنگترین شتێک کە بەسەرمدا هاتووە، پێتان بڵێم. ڕۆژێک، لە ڕۆژانی لاوییم، لەگەڵ دایکم چووینە دەرێ، دارحەیزەرانێکم بەدەستەوە بوو، لەبیرمە ــ لە سەڤییل بووین، تازە کریسمس دوایی هاتبوو. کەمێک لەپێش ئێمەوە دایک و کوڕێکی تری لێبوو ــ کوڕەکەش دارحەیزەرانێکی بەدەستەوە بوو. دڵنیابووم کە دارەکەی من لەوەیئەو گەورەترە، خۆم دەمزانی! کەچی هەر لە دایکم پرسی ــ چونکە منداڵان هەمیشە ئەو پرسیارانە دەکەن کە خۆشیان وەڵامەکەی پێدەزانن: «ئەوەی من گەورەترە، وانییە؟» کەچی ئەو وتی: «نا کوڕم، وانییە.» سەرم سوڕما. باشە دەبێت چاوەکانم چییان لێ هاتبێت! لەوکاتەوە هەمیشە ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم.

ئەنتۆنیۆ مەچادۆ، لە ٢٦ ی یولیۆی ١٨٧٥ لە سەڤییل لەدایک بووە. باوکی مامۆستا و کۆکەرەوەی شیعر و مۆسیقای فۆلکلۆری ئیسپانیا بوو. خێزانەکەی ماڵیان گواستەوە بۆ مەدرید وەختێک ئەنتۆنیۆ تەمەنی هەشت ساڵ بوو؛ لەوێ ئەنتۆنیۆ و براکانی چوونە دامەزراوەی فێرکردنی ئازاد، کە دامەزرێنەرەکەی، فرانسیسکۆ جیندەر دی لۆس ڕییۆس، کاریگەرییەکی گەورە و بەرچاویدانابوو لەسەر دوو سێ نەوە لە نووسەر و ڕۆشنبیرەکانی ئیسپانیا، بە کاریگەریی مامۆستاکانی ئەنتۆنیۆ پەروشیی بۆ ئەدەب تێدا درووست بوو کە دواتر ڕێخۆشکەربوو بۆ بڵاوکردنەوەی یەکەم کتێبی شیعریی لە ١٩٠٣ دا بەناوی سۆلیدادێس (خەڵوەت). بەڵام ئەنتۆنیۆ لە خوێندنەکەیدا وەک بڵێی سست و بێ تیین بوو، بۆیە تەواوکردنی بەکالۆریۆسەکەی دە ساڵ دوواکەوت. دوواجار پیشەی مامۆستای ناوەندیی هەڵبژارد و بۆ وتنەوەی دەرسی فەرانسەیی، تاقیکردنەوەکانی بڕیی، وە کاتێک بووە سی و دوو ساڵ، یەکەم کاری دەستکەوت لە سۆریا، کە شارۆچکەیەکی هەژار نشیین و زەحمەتکێش بوو، لە بناری چیای کاستییل. پێنج ساڵ لەوێ مایەوە، لە ساڵی دووەمدا هاوسەریی لەگەڵ کچی ئەو خێزانەدا کرد کە خانەکەی لێ بە کرێ گرتبوون، لیۆنۆر ی شانزە ساڵ. پێکەوە چوونە پارییس، بۆ کارکردن لە سۆربۆن؛ لە گەڕەکێکی هەژارنشییندا دەژییان، لیۆنۆر تووشی نەخۆشی سییل هات و پاش دوو ساڵ، لە پاییزی ١٩١١ دا گیانی لەدەست دا. دەیگوت: «ئەو هەمیشە لەگەڵما دەژی.» زۆربەیجار لە هەڵبەستەکانیدا ناوی دەهێنا، وە هەرگیز دوای ئەو هاوسەریی نەکردەوە. دەستی لە کارەکەی سۆریای هەڵگرت و گواستییەوە بۆ بایزا، ئەندەلوسیا، لە باشوور و لەوێ ماوەی حەوت ساڵ مایەوە. لە ١٩١٢ دا کە دووایین ساڵی بوو لە سۆریا، دووەم کتێبی دەرکرد بە ناوی، کۆمپۆس دی کاستێلا (دەشتی کاستییل)، وە بەردەوام هەڵبەستی تری بۆ زیاد دەکرد. لەماوەی ئەو ساڵانەی لە بایزا بوو، لە ١٩١٩ دا جارێکی تر گواستییەوە، ئەمجارەیان بەرەوسیگۆڤیا، کە تەنها سەعاتێک لە مەدریدەوە دوور بوو. ماوەی سیانزە ساڵ لە سیگۆڤیا ژییا، لە ١٩١٩ بۆ ١٩٣٢، لەو

سالآنەدا کەوتە داوی خۆشەویستیی ژنێکی شوودار بە نێوی «گیێومار»وە سێیەم کتێبی بلآوکردەوە بە ناوی، نوێڤاس کانسیۆنێس (سروودە نوێیەکان). لە ژییانی گشتییدا، زیاتر و زیاتر چالاک بوو، لە ڕۆژنامەکاندا لەبارەی گرفتە ڕامیاری و ئاکارییەکانەوە دەینووسی، لە سەروبەندی ئەو کاتە گرژانەی کە وڵات پێیدا تێدەپەڕی لە ١٩٣١ ەوە بۆ ڕاگەیاندنی دووەم کۆماری ئیسپانیا. لە ١٩٣٢ کۆچی کرد بۆ مەدرید و بەشدارییەکی بەهێزی کرد لە بەرگریی کۆماردا. لە ١٩٣٦ دا جەنگی ناوخۆ هەڵگیرسا. لە کۆتایی یەنایری ١٩٣٩ لەپێش سوپاکەی فرانکۆوە هەڵهات و بە پایرینییسدا پەڕییەوە. لە دوایین وێنەی بەجێماوی ئەنتۆنیۆدا، لە سەیارەیەکی فۆرتی کۆنەدایە — هەموو دەستنووسەکانی فەوتاون — دایکی کردۆتە باوەش و دەچنە ناو فەرەنساوە. لە کۆلییۆری سەر سنوور و لە لە فێبرایەری ١٩٣٩ دا گیان لەدەست دەدا. وە لەسەر کێلی گۆڕەکەی، نووسراوە کە دایکی سێ ڕۆژ ئەوی بە زیندوویی هێشتۆتەوە، بەر لەوەی کە خۆی بمرێت. لە گیرفانییدا، دوایین شیعری دۆزراوەتەوە بە ناوی، (ئەم ڕۆژە شینانە و ئەم خۆرەی منالّیی).

## کاتژمێرەکە دوانزە جار زەنگی لێدا

کاتژمێرەکە دوانزە جار زەنگی لێدا... ئەوەش خاکەنازێک بوو
دوانزە جار بەناخی زەوییدا ڕۆکرا.
... هاوارم کرد. «نۆرەی منە!» ... بێدەنگیی
وەلآمی دامەوە: مەترسە.
هەرگییز کەوتنی دوایین دڵۆپی
کاتژمێرە ئاوییەکە نابینییت.
چەندیین سەعاتی تریش لێرە دەنوویت
لەسەر ئەم کەنارانە،
بەیانییەکی ڕووناکیش کە بەخەبەردێی
بەلەمەکەت بەستراوەتەوە بە کەنارێکی ترەوە.

## دوێنێ شەو، کە نوستبووم

دوێنێ شەو، کە نوستبووم
خەوێکی سەیرم بینی!
دەڕوانم وا کانییەک
لەناو دڵما، ئەتەقێ.
وتم: ئەی ئاو،
بە کام ئاوبارەی نهێنییدا هاتییە لام؟
ئەی ئاوی ژیانی نوێ
کە نەکرا بیینت پێوە نێم.

دوێنێ شەو، کە نوستبووم
خەوێکی سەیرم بینی!
دەڕوانم وا پوورەیەک هەنگ
داوێتییە دڵم.
هەنگە تەلآییەکانی
شانەی سپی و
هەنگوینی شیرین ساز ئەکەن
لە شکستە کۆنەکانمەوە.



دوێنێ شەو، کە نوستبووم
خەوێکی سەیرم بینی!
کە وا خۆرێکی گڕاوی
لەناو دڵما ئەدرەوشێ.
گڕاوی بوو، چون ئاگردانێک
گەرمیی بۆ لەشم دەهێنا،
خۆر بوو، کە ئەدرەوشایەوە

فرمێسک لە چاوم ئەزا.

دوێنێ شەو، کە نوستبووم
خەوێکی سەیرم بینی!
ڕووانیم کە خوا لێرەیە،
ئالێرە، لەناو دڵما.
**ئەرێ ڕووحم نوستووە؟**

ئەرێ ڕووحم نوستووە؟
ئەرێ ئەو هەنگەوانانەی کە بە شەودا کار دەکەن
دەستیان هەڵگرتووە؟ ئاخۆ ئاسیاوی هزر وشکە،
کاسەکان خاڵیین،
هەر دەخولێنەوە، هەر سێبەریان هەڵگرتووە؟
نا، ڕووحم نەنوستووە.
ئەو بێدارە، تەواو بێدار.
نە نوستووە و نە خەویش دەبینێ، بەڵکو دەڕوانێت
چاوە ڕوونەکانی کراونەتەوە،
دوور دەڕوانێ و گوێدەگرێ
لە کەنارەکانی بێدەنگیی مەزن.

## بژاردەیەك لە دیوانی، دەشتیکاستییل

### I

مەسیحم خۆش دەوێت، کاتێک پێی وتین:
ئاسمان و زەوی کۆتاییان دێت،
بەڵام وشەکانی من دەمێننەوە.
وشەکانی تۆ چی بوون، مەسیح؟
خۆشەویستی؟ سۆز؟ لێبوردەیی؟
هەمو وشەکانت یەک وشە بوون:
بێداربوونەوە.

### II

شتێکی باشە کە بزانین پەرداخەکان
بۆ خواردنەوەن؛
خراپییەکە لەوەدایە کە نەزانین
تینوێتی بۆ چییە.

### III

تۆ دەڵێی هیچ شتێکی دروستکراو تازە نییە؟
خەمی ئەوەت نەبێ، بە قوڕی زەوی
کوپێک دروست کە، با براکەت پێی بخواتەوە.

### IIII

هەموو شتێک دەمرێ و هەموو شتێک دەمێنێ؛
بەڵام ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە بمرین،
بمرین و ڕێگاکان دروست کەین،
ڕێگای دەریاکان.

### V

بمرین... وەک دڵۆپە ئاوێک
بکەوینە ناو ئۆقیانوسێکی بەریین؟
یان ببین بەو شتەی کە هەرگیز نەبووین:
مرۆڤێک بەبێ سێبەر، بێ خەون،
مرۆڤێک تەواو تەنیا، کە هەنگاو دەنێت
بێ ئاوێنە و بێ ڕێگا؟

### VI

مرۆڤایەتی خاوەنی چوار شتە
کە بۆ دەریاکان دەست نادەن:
سوکان و لەنگەر و سەوڵەکان
لەگەڵ ترسی چوونە ناو قوڵاییەکان.

سروودەکان



I

لای بناری گوڵزاران
دەریای بەریین مەوج دەدا.
شانەی مێشهەنگەکانم
دەنکی نمەک جەم دەکا.

II

لای ئاوی ڕەش داگیرساو
بەرامەی دەریا و یاسەمین
شەوی مالاگا.

III

دیسان بەهار لێرەیە
کەس نازانێ چۆن هاتووە!

IV

بەهار هاتووە
هالەلویا ی سپیی دێت
لەناو تووترکەکانەوە!

V

شەوی کاستییل:
گۆرانییەکە چڕاوە،
یان، هێشتا نەچڕاوە
دەچمە بەر تاقی پەنجەرە.

VII

بیچڕە، بە ئاوازێکی ساف
سترانی سەوزی بادەم و
شۆڕەبیی کەنار دەریا

سترانی بەڕووی خاڵدار
سترانی لق و تەور و
گوڵە نەبینراوەکان.

سترانی باغی هەرمێی
گوڵسپی و
دارقۆخی شکۆفە سوور.

سترانی ئەم بەرامەیەش
بەرامەی بایەکی شێدار
لەناو گوڵی لۆبیاکانەوە.

VIII

فووارەیەک و
چوار درەختی ئەکاکیا
گوڵیان لێ دەڕژێ، لە سەرای شارا.
دەسا لەم خۆرنشینەدا
بخوێنە بولبول،
ئەمەیە ساتی دڵی من.

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:
The Winged Energy of Delight
Selected Translations by, Robert Bly
HarperCollins, ISBN ٠-٦-٠٥٧٥٨٢-٤

http://en.wikipedia.org/wiki/Antonio_Machado

# فلۆبێر.. مرۆڤ و ئەدیب

لە عەرەبییەوە: فرمێسک



گۆستاف فلۆبێر

دوای ئەوەی مێژونووسی فەرەنسی "میشێل وینۆک" ژمارەیەک بەرهەمی دەربارەی مێژووی سیاسی فەرەنسا و ئەدیب و داهێنەرەکانی فەرەنسا پێشکەش کرد، پێش چەند هەفتەیەک لەمەوبەر کتێبێکی تازەی دەربارەی ژیاننامەی "گۆستاف فلۆبێر" خاوەنی ڕۆمانی بەناوبانگ (مەدام بۆڤاری) بڵاوکردەوە.
ئەمە یەکەمجار نییە ژیاننامەی "گۆستاف فلۆبێر" دەکرێت بە کتێب و دەخرێتە بەردەستی خوێنەران، بەڵام هەر بەرهەمێکی "میشێل وینۆک" بە ڕووداوێکی گرنگ لەقەڵەمدەدرێت و هەر کارێکیش دەربارەی "گۆستاف فلۆبێر" بێت، ئەوا سەرنج و بایەخی خوێنەرانی فەرەنسی بۆ خۆی ڕادەکێشێت. سەبارەت بەو پرسیارەی بۆچی جارێکیتر ژیاننامەیەکی تازە دەربارەی گۆستاف فلۆبێر پێشکەش دەکەیت؟ دانەری کتێبەکە ئاوا وەڵام دەداتەوە: (ئەو دەیەوێ لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، سەرسامبوونی زۆری خۆی بۆ خاوەنی ڕۆمانی مەدام بۆڤاری دەربڕێت). ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم چاپەی دواییان، بڕێکی زۆر لە نامەکانی فلۆبێر لەخۆدەگرێت کە پێشتر چاپنەکراوە. لێرەوە دانەری کتێبەکە پێیوایە دەرفەتێکی ڕاستەقینە لەبەردەستدایە بۆ (بەراوردکردنێکی سەرتاپاگیر) لەنێوان فلۆبێری مرۆڤ و ئەدیبێکی داهێنەر.
دانەر لە میانەی چەند بەشێکی کتێبەکەدا کە ئەم ناونیشانانەی لەخۆگرتووە: ئاسۆ جیاوازەکان، ئارەزووی خۆرهەڵات، پەیوەندی بە "لویز"ەوە کە خۆشەویستی ژیانی بووە، ئاوا فلۆبێر دەناسێنێ: مرۆڤ و نووسەر و عاشق. ئەوە فلۆبێرە بە هەموو سیماکانییەوە. هەروەها دانەر باس لە بلیمەتی فلۆبێر دەکات، بەڵام لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا باس لە (گەمژەی




خێزان) دەکات وەک ئەو وەسفەی کە جان پۆل سارتەر لە یەکێک لە توێژینەوەکانیدا فلۆبێر-ی بەو شێوەیە وەسفکردووە. دانەر لە باسکردنی ژیانی شەخسی فلۆبێردا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە فلۆبێر لەو ڕێڕەو و ڕێگایەی لاداوە کە خێزانە بۆرجوازیەکەی بۆیان کێشابوو.

دانەر ئەوە دەخاتەڕوو کە فلۆبێر کوڕی پزیشکێکی جەڕاحی ناودار بووە، بەڵام ئەو پشتی کردووەتە ئەو میراتە و ناپاکی لەگەڵ چینەکەی خۆیدا کردووە و لە شێوە ژیانی بۆرجوازی دوورکەوتووەتەوە. نووسەری ئەم ژیاننامەیە هیچ دوودڵ نییە لەوەی بڵێ فلۆبێر بەهۆی ناکۆکییەکان و هەموو ئەو فشارە جۆراوجۆرانەی کە لەلایەن خێزانەکەیەوە دەخرایە سەری،

لەسەرەتای ساڵانی گەنجیدا، دووچاری ناخۆشی و نەهامەتییەکی زۆر هاتووە. تەنانەت کار گەشتووەتە ئەوەی خێزانەکەی گومانیان لە ساغی و سەلامەتی عەقڵی کورەکەیان هەبووە، وەک ئەوەی دانەری کتێبەکە ئاماژەی پێدەدا. گۆستاف فلۆبێر دواتر ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە خێزانەکەی زۆر خۆشویستووە، بەڵام لە بەرامبەردا، نایەوێت ملکەچی فەرمانەکانیان بێت و حەز و ئارەزووەکانی ئەوان جێبەجێ بکات.

دانـەر لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەیدا ئاماژە بـەوە دەکـات هەموو ئەو کتێبە جیاواز جیاوازانەی باس لە مێژووی ئەدەب دەکەن، فلۆبێر بە (بلیمەتێک لە شێوان) دادەنێن و باس لەوە دەکەن ئەو لەپێناوی نووسیندا، وازی لە ژیانی خۆی هێنابوو، هەروەها ئەو زۆر دڵسۆزی هونەر بووە، ئەمە جگە لـەوەی گۆستاف فلۆبێر لە ناوەوەی خۆیدا هەڵگری کەسایەتییەکی کۆچبەر بووە. ئەمە لە میانەی ئەو گەشتە گەورەیەوە دەردەکەوێت کە بۆ خۆرهەڵات ئەنجامیدا. لەپاڵ ئەو گەشتانەی دیکەی کە بۆ ناوچەی (بروتانیا)ی فەرەنسی یان بۆ ئینگلتەرە یاخود بۆ دورگەی کۆرسیکا ئەنجامیدان. ئەم گەشتانەی لێدەرچێت، فلۆبێر هەموو ژیانی خۆی لەو کونجەدا بردەسەر کە لە شاری (کرواسیە)ی ناوچەی نۆرماندی بۆ خۆی دروستیکردبوو. ئەوێ شوێنی لەدایکبوونی بوو، فلۆبێر ساڵی ١٨٢١ هاتووەتە دنیاوە و ساڵی ١٨٨٠ هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکات.

فلۆبێر وەک ئـەوەی دانـەری کتێبەکە باسی دەکـات، حەزی لە تەنیایی بووە، بـەڵام لـە هـەمـان کـاتـدا و لـە میانەی داهێنانەکانییەوە، بیابانی پڕ کردووە لە خەڵک. دواجـار دانـەری کتێبەکە دەڵێ فلۆبێر بە درێژایی ژیانی، وەک خودی فەرەنسا، کوشتەی دەستی دژەکان بووە. فەرەنسا لەنێوان کۆماری و ئیمپراتۆریەت و پاشایەتیدا بەشوێن خۆیدا دەگەڕا. ژیانی فلۆبێر ملکەچی ئەو یاسا گشتییە بوو. ئەو کاتێ هەستیکرد گەمژەکان ڕۆڵێکی یەکلاییکەرەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و هەروەها لە ژیانی فیکریدا ناگێڕن، بۆیە لە پێگەی هونەرمەندێکەوە ڕووبـەڕووی مێژوو بووەوە.

دانەری کتێبەکە لە چەند دێڕێکدا میشێل وینۆک مێژونووسێکی فەرەنسییە، بەو بەرهەمانەی ناوبانگی پەیداکرد کە دەربارەی مێژووی سیاسی فەرەنسایە و بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمانەی بۆ زۆربەی زمانە بیانییەکان وەرگێڕدراون. یەکێکە لە پسپۆڕە هەرە شارەزاکانی هەردوو کۆماری فـەرەنـسـا: کـۆمـاری چـوار و پێنج کە جەنەڕاڵ دیگول ساڵی ١٩٥٨ دایمەزراندن. ژیاننامەی زۆرێک لە ئەدیب و سەرکردە فەرەنسییەکانی نووسیوەتەوە، لەوانە ژیاننامەی فیکتۆر هیگۆ.

سەرچاوە: بیان الکتب، ١٢ تەموزی ٢٠١٣

# مەرگی عەفیف ئەلئەخزەر

ئامادەکردنی: باوکی پایان

لە ٢٧ تەموزی ئەمساڵدا، درەختی فیکر و مەعریفە، نووسەر و بیرمەند و ڕۆشنبیر و تێکۆشەرێکی چەپی تونسی لەدەستدا. ئەم لە دەستدانە دوای ژیانێکی جەنجاڵی پڕ ئێش و ئازار و پڕ نەهامەتی دەرونی و خەونی لە دەستچوو و داهێنانی فیکری دەوڵەمەند و بە پیت هات. پێش ماوەیەکی کەم لە مەرگی عەفیف ئەلئەخزەر، لە میدیاکانەوە دەنگۆی ئەوە بڵاوبوەوە ئەم بیرمەندە تونسییە، لە ماڵە پاریسییەکەیدا، بەهۆی ئەو نەخۆشییە درێژخایەنەی کە عەیامێکە لەگەڵیدایە، کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناوە و خۆی کوشتووە. هۆکاری ئەو خۆکوشتنەی بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە گوایە ئەم بیرمەندە هەردوو دەستی دووچاری ئیفلیجبوون هاتوون و چیتر توانای نووسینیان نەمابوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی عەفیف لەوە بێزار ببوو کە ببووە بارێکی قورس بەسەر برێک لە هاوڕێ و خزمەکانییەوە و ئەوان ئەو شتانەیان بۆ دەنووسییەوە کە حەزی دەکرد بیاننووسێت. هەروەها یەکێک لەو هۆکارانەی

دیکە کە وایلێکرد پەنا بۆ خۆکوشتن بەرێت، ئەوەیە نەخۆشی شێرپەنجەکەی گەشتبووە دوا قۆناغەکانی و پزیشکەکان پێیان ڕاگەیاندبوو هیچ هیوایەکی بۆ چاکبوونەوە نییە. هۆکارێکی دیکە ئەوەیە لە دوا ڕۆژەکانی ژیان و خراپبوونی باری تەندروستی، کەس نەبووە بەلایەوەبێت و بایەخی پێبدات. بەڵام دەرکەوت ئەو دەنگۆیانە ڕاست نین و هەوڵەکانی ئەم نووسەرە بۆ خۆکوشتنی سەرکەوتوو نەبوون و گواستراوەتەوە بۆ یەکێک لە نەخۆشخانەکانی پاریس، وەلێ لە ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٢٧ تەموز لە هەمان ئەو نەخۆشخانەیەدا کۆچی دوایی دەکات.

یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی عەفیف ئەلئەخزەر ئاوا باسی مردن و بە خاکسپاردنەکەی دەکات: (لە هاورێیەکەوە هەواڵی مردنەکەیم بیست، هەر بۆیە پەیوەندیم بە ڕۆماننووسی هاورێم "خەلیل نعێمی"یەوە کردو پێم وت عەفیف کۆچی دوایی کردووە و پرۆسەی بە خاکسپاردنی ڕۆژی چوارشەممە ٣١ حوزەیران بەڕێوەدەچێت. کاتێکمان دیاریکرد تا پێکەوە بڕۆین و بەشداری لە دوا ماڵئاوایی کردن لە عەفیف بکەین کە لەگەڵی ناکۆک بووین و لە جەنگی یەکەمی کەنداوەوە نەمانبینی بوو. کاتێ گەشتینە نەخۆشخانەکە، هیچ کەسێکمان نەبینی، داوای ڕوونکردنەوەمان لە بەرپرسانی نەخۆشخانەکە کرد، پێیان ڕاگەیاندین بڕۆین بۆ گۆڕستانی بەرامبەر بە نەخۆشخانەکە، کاتێ چوینە ناو ئەو هۆڵەی تەرمەکەی تێدابوو، بینیمان تەنها یەک هاورێی"ناصر بن رجب" لەوێدا بە تاقی تەنها ڕاوەستاوە و چاوەڕوانە، پرسیارمان لێکرد و وتی جگە لە ئێمە هیچ کەسێکی دیکەی نەبینیوە و ئەو چاوەڕوانە بێن و تەرمەکەی عەفیف بەرن.

لەو سەروبەندەدا هاوڕێیەکی دیکەی کۆچکردوو هات، ئەویش ئەندازیارێکی میسری بوو، لەبەر ئەوەی ئەو ڕێگایەی دەیگەیاندە نەخۆشخانەکە کاری نۆژەنکردنەوەی تێدا دەکرا، بۆیە ئەم هاوڕێیەی نەیتوانی بوو لەکاتی خۆیدا بگات. پاشان قسەمان لەسەر بارودۆخی مردنەکەی کرد و ئەم چوارەمان بڵاوەمان لێکرد و هیچ کەسێکی دیکەی لێ نەبوو بۆ ناشتنی تەرمی ئەم بیرمەندە تونسییە کە جێگای جەدەل و مشتومڕێکی دوور و درێژ بوو.

ئەو کاتەی بەرەو نەخۆشخانەکە کەوتبوومەڕێ، بیرم لەوە دەکردەوە ئێستا من لەوێ چاوم بە کۆمەڵێ نووسەر و میدیاکار و بیرمەندی عەرەبی دەکەوێت کە پەیوەندییان بە عەفیف-ەوە هەیە یان پەیوەندییان بە فیکری عەفیف-ەوە هەیە. کەچی من کەسم لەوێ نەبینی و ئەمەم بە دکتۆر خەلیل نعێمی وت، ئەویش بە سەرسوڕمان و پێناخۆشبوونەوە بیری لە هەمان مەسەلە کردۆتەوە و باسی ئەو ناوانەی دەکرد کە پێیوابووە دەیانبینێت. دواتر زانیمان هۆکاری مردنەکەی عەفیف خۆکوژی نەبووە، بەڵکو هۆکاری مردنەکەی شێرپەنجەی سییەکانی بووە کە بە تەواوی جەستەیدا بڵاوببوەوە، ئەمەش وایکردبوو پەنا بەرێتە بەر خۆکوشتن، وەلێ لەو هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو. دکتۆر خەلیل نعێمی پێی وتم: تۆ خوا ئەمە کەی ڕەوایە بیرمەندێک و پیاوێک لە ئاستی عەفیف-دا، لە مردنەکەیدا کەس ئامادەنەبێت؟

لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ پاریس زۆرمان قسە کرد و هەریەکەمان باسی لە چەندین یادگاری خۆی کرد لەگەڵ عەفیف، ئێمە لە ساڵی ١٩٥٧ دەماننناسی. هەندێک هیواداربوون تەنها دەرفەتێکیان بۆ

ڕێکەوێت تاکو قسەی لەگەڵدا بکەن یان دەرفەتی چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیان بۆ بڕەخسێنێت. لەبەرئەوە پێموابوو لانی کەم هەندێ لە پیاوانی سیاسەت یان لەو هەڤاڵانەی لەگەڵیدا بوون، بەتایبەتی ئەوانەی ساڵانی کۆتایی ژیانی، ئامادەی ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی بن.

پرسیاری ئەوەی بۆچی کەس ئامادەی مەراسیمی ناشتنەکەی نەبوون، بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێت خەڵک بە مردنەکەیان نەزانیبێت یان سوپاسی خوایان کردبێت کە هەوڵی خۆکوشتنەکەی سەرینەگرتووە و کۆتایی بە ژیانی نەهێناوە، لێرەوە ئەوان وا بیریانکردوەتەوە ئەو هێشتا لە ژیاندایە.

مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، عەفیف ئەلئەخزەری بیرمەند، دوای ململانێیەکی دوور و درێژ و تاڵ لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە، کۆچی دوایی کرد و لە دوای خۆیەوە کۆمەڵێ کتێب و هەڵوێستی بەجێهێشت و لەسەر توێژەران و ئەوانەی بایەخ بە بواری سیاسی یان فەلسەفەی یان فیکری عەرەبی دەدەن، دەبێ بۆی بگەڕێنەوە. بەتایبەتی لەم ماوەیەدا کە پێیدەوترێت بەهاری عەرەبی. عەفیف بە تاقی تەنها مرد، تەنها چوار کەس ئامادەی تەرمەکەی بوون کە ئێمە بووین. ئێستا ئیدی وەک پیشەی هەموو جارێکمان، دوای مردن نووسین دەستپێدەکات و باس لە سیفەتەکانی ئەم پیاوە دەکرێت و شیکردنەوە بۆ بیروڕا و هەڵوێستەکانی ئەنجامدەدرێت).

ئەم شۆڕشگێڕە چەپە کە دواتر دەبێت بە کەسێکی لیبراڵ، لە وەسیەتەکەیدا دەڵێ: (نامەوێ کەس لە پشتی تەرمەکەمەوە بڕوات. وەک چۆن لە ژیانمدا هیچ کەسێکم ماندوو نەکردووە، ئاوا بە هەمان شێوە نامەوێ دوای مەرگم هیچ کەسێک ماندوو بکەم)

عەفیف ئەلئەخزەر کێیە؟

بیرمەندێکی تونسییە، ساڵی ١٩٣٤ لە خێزانێکی جوتیاری هەژار و دەستکورت و لە باکوری خۆرئاوای تونس لەدایکبووە. لە قۆناغێکی زووی تەمەنیدا هەتیو دەکەوێت، هەرچەندە بارودۆخی ژیانیان خراپ بووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێداگری لەسەر خوێندن کردووە. پێش ئەوەی لە پەنجاکاندا بڕواتە زانکۆی (الزیتونە) کە زانکۆیەکی ئاینی بووە، بگرە ئەم زانکۆیە بە (ئەزهەری تونس) ناوبراوە، هەمو قورئانی خەتم کردووە. پاشان پەیوەندی بە کۆلیژی مافەوە کردووە و لەنێوان ساڵانی ١٩٥٧ – ١٩٦١ کاری پارێزەری کردووە. دواتر هەر لەو ساڵەدا، واتە ساڵی ١٩٦١ وازی لە کاری پارێزەری هێناوە و ڕۆشتووە بۆ پاریس. ساڵی ١٩٦٥ بەرەو خۆرهەڵاتی عەرەبی کەوتووەتەڕێ و لەنێوان عەمان و بێروت لەهاتوچۆدا بووە و پاشان لە بێروت نیشتەجێ بووە و چووەتە ڕیزی بەرگریکارانی فەلستینەوە. لە بێروت گرنگترین کتێبەکانی خۆی بە چاپ گەیاندووە، فیکرەی سەرەکی ئەو کتێبانەی بریتی بووە لە (ڕەخنە لە فیکری ئیسلامی تەقلیدی).

عەفیف دوای بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ لە بێروت، بە دڵشکاوی و خەمبارییەوە ئەو شارەی بەجێهێشتووە و هاوڕێ چەپەکانی زۆریان لا سەیر بووە کە هەڵوێستی عەفیف دژ بە هەڵگیرساندنی ئەو شەڕە بووە و دژ بە هەموو ئەو پاساوە "پێشکەوتوخوازانە" بووە کە ئەو شەڕە لە پێناویدا بەرپابووە. لێرەوە ئەم بیرمەندە جیهانی عەرەبی بە خۆی و جەنگە ناوخۆیی و دەرەکییەکانییەوە، جێدەهێڵێت و دەڕوات بۆ پاریس، لە ساڵی ١٩٧٩ تا ڕۆژی مردنەکەی، لە پاریس دەمێنێتەوە. بەڵام

جارجاره له قاهیره سیمیناری پێشکەش کردووه یان له هەندێ کەناڵی ئاسمانی عەرەبیدا، بەشداری له چەند گفتوگۆیەکی تەلەفزیۆنیدا کردووه.
عەفیف ئەلئەخزەر کوڕی قوتابخانەی ڕۆشنگەری تونس بووه، قوتابخانەیەک پێشتر "طاهر الحداد و طاهر بن عاشور"ی پێگەیاندووه و هەر له ڕێگەی ئەم قوتابخانەیەوه توانرا بۆ یەکەمجار له وڵاتانی عەرەبی و لەسەردەمی حەبیب بۆرقێبەدا، تابۆی یاسا کۆنەکانی باری شارستانی تێکبشکێنرێت. عەفیف هەمیشه ئەوەی دووباره کردووەتەوه که یەکەم مامۆستا و فێرکاری "تەها حوسێن" بووه و لەمبارەیەوه سەبارەت به منداڵی خۆی و کاریگەری تەها حوسێن لەسەری دەڵێ: (تا ڕادەی توانەوه تەماهیم لەگەڵ تەها حوسێن دا کردبوو، به پارچه قوماشێک چاوی خۆم دەبەست، دروست وەک ئەوەی کوێر بم و لەبەردەم هاوڕێیەکمدا لاسایی تەها حوسێن-م دەکردەوه. له تەمەنی ١٧ یان ١٨ساڵیمدا که کتێبی (الایام)م خوێندەوه، خەونم بەوەوه دەبینی ببمه نوسخەیەک له تەها حوسێن. له کاتێکدا من ئەو کتێبەم دەخوێندەوه، له هزرمدا ڕۆژه تایبەتەکانی خۆمم تۆمار دەکرد). له دیدگای ئەم بیرمەندەوه ئەو کەشتییە، یان ئەو دوو کەشتییەی که عەقڵی عەرەبی ڕزگار دەکات، بریتین له میدیا و پەروەرده، سەبارەت بەو دووانه دەڵێت: (ئەو دووانه پێکەوه هاریکاری یەک دەکەن بۆ شۆردنەوەی مێشکی قوتابی و خوێندکارەکان له هەمو زەڕەیەک عەقڵ و پیسکردنی به فقی سەدەکانی ناوەڕاست).
عەفیف یەکێکه له پێشەنگەکانی فیکری ڕۆشنگەری و عەقڵانی عەرەب، بەوه ناسراوه ڕۆشنبیرێکی بوێر و چاونەترس بووه و یەکێک بووه له قەڵەمه چەپه هەره ئازاکان. لای ئەم نووسەره مەعریفه له ژیان و له سیاسەت جیانەکراوەتەوه. ئەو سەر به نەوەی یەکەمی مارکسییەکانی عەرەبه و زۆر سەرسەختانه بەرگری له عەقڵانییه و عەلمانییەت و مۆدێرنەی سیاسی و ڕیفۆرمی ئاینی به ڕۆحێکی سەردەمیانەی داهێنەرانەوه کردووه. سەرقاڵی کێشه فیکری و ئایدۆلۆژیی و نالەبارییەکانی واقیعی خراپی عەرەب بووەو به شوێن ڕێگاچاره گونجاوەکاندا گەڕاوه و ئاڵا و دروشمی ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی و دابەشکردنێکی وەک یەکی سەروەت و سامانی بەرزکردووەتەوه. داوای کردووه له کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا، ڕیفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و پەروەرده بێتەئاراوه. ئەم بیرمەنده هەرچەنده له سەرەتای ژیانیدا مارکسی بووه، بەڵام لەم دوو دەیەی کۆتایی ژیانیدا، قەناعەته فیکرییەکانی گۆڕانیان بەسەردا هاتووه و لەبەر ڕۆشنایی وەرچەرخانه تازەکان و هەرەسهێنانی سیستمی سۆشیالیزم و کۆمۆنیسته کرێکارییەکان، به چەمک و تێگەشتنەکانی پێشویدا چووەتەوه. لێرەوه لەیەک کاتدا بووەته نەیاری چەپ و کۆنەپارێزەکان و له مارکسییەتەوه گواستویەتیەوه بۆ لیبرالیزم و بووەته کەسێکی لیبرالی و لەگەڵ کۆمەڵێ له ڕۆشنبیره چەپەکانی عەرەب، ئەوانەی قەناعەته ئایدۆلۆژییەکانیان گۆڕابوو، حەماسەتێکی زۆری بۆ فیکر و چەمکەکانی لیبرالیزم هەبووه. یەکێک له کاره بەناوبانگەکانی بریتییه له وەرگێڕانی (مانیفێستی کۆمۆنیستی- البیان الشیوعی)، ئەم وەرگێڕانەی به یەکێک له وەرگێڕانه هەره باش و جوانەکان دادەنرێت و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان به تاکه سەرچاوەی متمانەپێکراو لەقەڵەم دەدرێت بۆ ئەو مانیفێسته.
ئەم بیرمەنده پێداگری لەسەر ئەوه دەکات که

پێویستە خوێندنەوەیەکی عەقڵانی و زانستی بۆ فیکری ئاینی بکرێت و پێیوایە بە درێژایی مێژوو، فیکری ئاینی نەیاری فیکری زانستی بووە و ڕێگربووە لەبەردەم گەشەکردن و تەقاندنەوەی وزە و تواناکانی داهێنان لای مرۆڤەکان. ئەم پیاوە ڕۆشنبیرێکی ئۆرگانی و بیرمەندێکی ئازاد و سەربەگۆبەن بووە، ڕەخنەگرێکی ڕۆشنگەری بەرهەڵستکار بووە، لیبرالییەکی مۆدێرن بووە. جوانترین و باشترین گرنگترین وتار و نووسینەکانی لە ماڵپەڕی (الحوار المتمدن) دا بڵاوکردووەتەوە، بە کتێب و نووسینەکانی و بە گفتوگۆ فیکری و فەلسەفییەکانی، بەشدارییەکی بەرچاوی هەبووە لە دەوڵەمەندکردنی کایەی فیکر و ژیانی ڕۆشنبیری عەرەبی.

دیدگا فیکری و سیاسیی ئەم ڕۆشنبیرە، دیدگایەکی ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەو پێیوایە دەسەڵاتی مەدەنی و تازەگەری، وەک دوو پێشەکی پێشوەخت و بنەڕەتی وان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی مۆدێرن. ئەگەر جەوهەری ئەم دەوڵەتە لەگەڵ ئازادییەکان و دیموکراتی و کرانەوە مرۆڤانەییەکاندا یەک نەگرێتەوە، ئەوا ئەو دەوڵەتە پڕ دەبێت لە زوڵم و کۆیلایەتی. ئالێرەوەیە ڕەخنەی لە دەسەڵاتی ئاینی غەیبیانی دەگرت، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە ئازادی فیکر و بیروباوەڕە و دیموکراتی و مافی ئافرەت و فرەیی.

عەفیف ئەلئەخزەر لە وەڵامی پرسیاری سیماکانی ڕۆشنبیر چییە؟ ئاوا وەڵامدەداتەوە و دەڵێ:

١-ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە بەشدارە لە ئامادەکردنی هزر، بۆ گونجاندنی لەگەڵ داواکاری و پێداویستییەکانی سەردەمەکەی.

٢-ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە داوای ڕەتکردنەوەی هاوڵاتی نێگەتیڤ دەکات کە لە مافە گشتییەکانی بێ بەش کراوە و شوێنگرتنەوەی بە هاوڵاتییەکی پۆزەتیڤ کە خاوەنی هەموو مافە گشتییەکانە بێ لەبەرچاوگرتنی ئاین و ڕەگەز و تایفەکەی.

٣-ڕۆشنبیر کەسێکە فیکری ڕەخنەگرانە بەرهەمدەهێنێت، فیکرێک لە باوەڕی ڕەهاوە بگوازێتەوە بۆ باوەڕی سەلمێنراو، ئەوەی وەک حەقیقەتێکی تەواو دەخرێتەڕوو گفتوگۆی لەسەر بکرێت، گواستنەوە لە خوێندنەوەیەکی ڕووکەشیانەی مێژوو بۆ خوێندنەوەیەکی مێژوویانەی دەق.

٤-ڕۆشنبیر کەسێکە خاوەنی بوێری و ئازایەتیەکی فیکری و سیاسی تەواو بێت، تاکو پرسیار لەسەر کێشە ڕاستەقینەکان بخاتەڕوو کە کۆمەڵگاکەی بەدەستییەوە دەناڵێنێت. ئەو داخرانە زەمەنییانە بناسێت کە فیکر ئیفلیج دەکەن و ڕۆڵی عەقڵ دەسڕنەوە و مەوهیبەکان نەزۆک دەکەن و هزرە بیرکەرەوەکان فڕێدەدەنە دەرەوەی نیشتیمان.

٥-ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە دابڕانێکی بریندار لەگەڵ کولتووردا بەرجەستە دەکات. چونکە شارستانیەتی مۆدرێن کچی سێ برینی نەرجسیەتە: دۆزینەوەی گالیلۆ بەوەی زەوی خڕە، دۆزینەوەی داروین بۆ تیۆرەی گەشەکردن، دۆزینەوەی فرۆید بۆ نەست.

## سەرچاوەکان

ڕۆژنامەی القدس العربی، ٢٠١٣/٨/٢
ڕۆژنامەی الاهالی ٢٠١٣/٨/١٣
ماڵپەڕی الحوار المتمدن
ماڵپەڕی www.alayam.com ٢٠١٣/٧/٣
ماڵپەڕی www.assawsana.com ٢٠١٣/٧/٢٧

# نامەکانی شاعیری سەدەی بیستەم

و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ

دەزگای (فێبر و فێبر) بۆ بڵاوکردنەوە لە لەندەن، لە میانەی ئەم ساڵدا بەشی چوارەمی لە نامەکانی "ت.س. ئەلیوت ١٨٨٨ - ١٩٦٥" بڵاوکردەوە. ئەلیوت شاعیرێکی بە ڕەگەز ئینگلیزییە و لە ئەمریکا لەدایکبووە و بە شیعرەکانی (وێرانە خاک) و (پیاوە بۆشەکە) و چەندانی دیکە، شۆڕشێکی لە شیعری سەدەی بیستەمدا بەرپاکرد. هەروەها ئەلیوت نووسەرێکی شانۆییە و لەم سەردەمەماندا کاری لەسەر زیندووکردنەوەی شانۆنامەی شیعری کردووە، ئەمە دوای ئەوەی لەسەر تەختەی شانۆ زمانی پەخشان زمانێکی باڵادەست بووە. کاریگەری ئەم شاعیرە چەند کیشوەرێکی گرتووەتەوە و جێگا پەنجەی بەسەر ژمارەیەک لە شاعیر و ڕەخنەگرەکانی عەرەب جێهێشتووە، لەوانە بەدر شاکر سەیاب، سەلاح عبدالصبور، لویس عوض و ڕەشاد ڕوشدی و ئەوانی دیکە.

ئەم کتێبە کە زیاد لە هەشت سەد لاپەڕەیە،

نامەکانی ئەلیوت لە نێوان ساڵانی ١٩٢٨-١٩٢٩ لەخۆدەگرێت و بەشی چوارەمی نامەکانییەتی. بەشی یەکەمی تایبەتە بە ساڵانی ١٨٩٨ – ١٩٢٢، بەشی دووەمی تایبەتە بە ساڵانی ١٩٢٣ – ١٩٢٥، بەشی سێیەمی تایبەتە بە ساڵانی ١٩٢٦ – ١٩٢٧. ئەم بەشانە لەلایەن ژنی دووەمییەوە "ڤالێری ئەلیوت" بە هاوکاری "هیو هۆتۆن" پاشان بە هاوکاری "جۆن هافندن" کە لە زانکۆی شیفڵدی بەریتانی مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزییە، کۆکراونەتەوە و ئامادەکراون. (هاوسەری دووەمـی ئەلیوت لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کردووە).

ئەو دوو ساڵەی ئەم نامانە باسیان دەکات، واتە ١٩٢٨ – ١٩٢٩، تێیدا ئەلیوت سەرقاڵی ئیشکردن بووە لەو گۆڤارە ئەدەبییەی کە لە ساڵی ١٩٢٢ تاکو ساڵی ١٩٣٩ بڵاویکردوەتەوە، ئەویش گۆڤاری (المعیار) بووە. ئەم گۆڤارە ئاسۆیەکی ئەوروپی بەرفراوانی هەبووە و کاری بۆ پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ گۆڤارە ڕۆشنبیرییە ئاست بەرزەکانی دیکە کردووە لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئیتالیا و ئیسپانیا. گۆڤارەکە پڕە لەو نامانەی ئەلیوت لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا لەگەڵ نووسەر و شاعیرەکاندا ئاڵوگۆڕی کردووە، ئەوانەی نووسینەکانیان و شیعرەکانیان و چیرۆکەکانیان بۆ گۆڤارەکە ناردووە. ئەلیوت هەندێجار ئەو بەرهەمانەی بڵاوکردووەتەوە و هەندێجاری دیکە، لەبەر هۆکاری جیاواز جیاواز، داوای لێبوردنی کردووە کە برێک لەو بەرهەمانە بڵاوناکاتەوە. ئەلیوت زۆر بەتەنگ ئەوەوە بووە گۆڤارەکە پارێزگاری لە ئاستە بەرزو بڵندەکەی بکات، بێ ئەوەی موجامەلە بکات یان تەماشای ناوبانگی ناوەکان بکات.

ئەم نامانەی ئەلیوت کە لەم کتێبەدا بڵاوکراونەتەوە، لە ساتەوەختی خەم و خەفەتە تایبەتییەکانیدا نووسیوە، ئەو ساڵی ١٩١٥ پەیوەندی لەگەڵ کچێکی بەریتانی بەناوی "ئیڤان های ۆود"ەوە دەبەستێت، ئەم کچە بەردەوام سکاڵای لە نەخۆشییە جەستەیی و دەرونییەکانی کردووە، بێگومان ئەمە لە ژیانی هاوسەرگیریاندا، بووەتە هۆکاری بێزاری و ناڕەحەتی هەردوولا و شپرزەییەکی بەردەوامی لای هەردووکیان دروستکردووە. ئەم هاوسەرگیرییە ناخۆشە، ساڵی ١٩٣٣ بە جیابوونەوە کۆتایی پێدێت. ئیڤان چەند ساڵی کۆتایی ژیانی، لە نەخۆشخانەی دەروونـی بردووەتەسەر و ساڵی ١٩٤٧ هەر لەوێدا کۆچی دوایی دەکات.

ئەلیوت دوای مەرگی هاوسەرەکەی، هەستکردن بە تاوان یان گوناهـ، چ بە حەق یان بە ناحەق، هەرگیز یەخەی بەرنەداوە و نەیتوانیوە خۆی لەو هەستە ڕزگار بکات. ئەو خۆی بە بەشێک لەو بەرپرسیارەتییە زانیوە کە دووچاری هاوسەرەکەی هاتبوو. لێرەوە ساڵەکانی ژیانی دوای مەرگی هاوسەرەکەی، بەردەوام بیری لە حاڵەتی خۆ خەتابارکردن و لێپرسینەوە لە ویژدان کردەوە، ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین لە هیچ ئافرەتێکی دیکە نزیکنەبووەتەوە و زۆر بە توندی کەوتبووە لێپرسنەوە لە ویژدانی خۆی و بەدەم هیچ یەکێک لەو ئافرەتە زۆر و زەبەندانەوە نەچووە کە یەک لایەنە خۆشیان دەویست، ئەو ئافرەتانەی شەیدای ناوبانگ و بلیمەتییەکەی و ئەو ڕێزگرتنەی ببوون کە لە ناوەندی ڕۆشنبیریدا لێیدەگیرا، تەنانەت لە نەیارەکانیشییەوە، ئەمە با قۆزی و شیکپۆشی و ڕەفتارە سەرنجڕاکێشەکانی و قسەکانی لەولاوە بوەستێت.

بەڵام ئەم قۆناغە تاریکەی ژیانی، لەو ساتەوەختەدا کۆتایی پێهات کە لە پایزی تەمەنیدا، دووچاری خۆشەویستی بوو. ئەلیوت لە پایزی تەمەنیدا عاشقی "ڤالێری" سکرتێرە گەنجەکەی خۆی دەبێت و ساڵی ١٩٥٧ دەبێتە هاوسەری، هەرچەندە جیاوازییەکی

گەورەی تەمەن لەنێوانیاندا دەبێت، ئەم خانمە توانی لە کۆتاییەکانی تەمەنی ئەلیوتدا خۆشی و کامەرانی پێ ببەخشێت کە عەیامێک بوو لێی بێ بەش بوو.
ئەم کتێبە کۆمەڵێ لە نامەکانی هاوسەرە بەدبەختەکەی یەکەمی ئەلیوت لەخۆدەگرێت کە بۆ هاوڕێ کچەکانی خۆی نووسیوە، لەوانە خانم ئۆتۆلین مۆریل کە لە ساتێک لە ساتەکاندا دۆستی "برتراند راسل"ی فەیلەسوف بووە. ماری هتشنسۆن کە دۆستی ڕەخنەگری هونەری ئینگلیزی "کلای بل" بووە. نامەکانی ئەم خانمە، وەک کۆمەڵێ هاوار وابووە، لە دڵێکی پڕ حەسرەتەوە هاتبێتەدەر، دڵێک لێوان لێوە لە ئازاری جەستەیی و دەروونی، دڵێک هەست بە تەنهایی دەکات و لە ئایندە دەترسێت. ڤالێری ئەو بۆشاییەی دەبینی کە تادەهات لەنێوان خۆی و هاوسەرە بلیمەتەکەیدا گەورە و گەورەتر دەبوو، تارمایی ئەو شێتییەی دەبینی کە هەڕەی لێدەکرد.
هەروەها کتێبەکە ئەو نامانەی ئالیوت لەخۆدەگرێت کە لەگەڵ دایکی "شارلوت ئەلیوت" ئاڵوگۆڕی کردبوو. دایکی ئەلیوت شاعیرێکی مامناوەندی بوو، ئەلیوت زۆر هۆگری بووە، دایکی کۆچی دوایی دەکات بێ ئەوەی ئەلیوت بتوانێ بیبینێت، چونکە دایکی لە ئەمریکا دەژیا و کوڕەکەشی لە لەندەن. هەروەها کتێبەکە کۆمەڵێ نامەی ئەلیوت بۆ برا گەورەکەی "هنری ئەلیوت" لەخۆدەگرێت. ئەم کتێبە هەرچەندە ڕۆشناییەکی زۆر دەخاتە سەر ژیانی تایبەتی ئەلیوت، لەپاڵ ئەوەشدا دۆکیمێنتێکی گرنگە دەربارەی دیدگا و بیروڕای ئەلیوت سەبارەت بە ئەدەب و ڕەخنە و حوکمەکانی ئەلیوت دەربارەی ئەدیبەکانی هاوسەردەمەکەی. بۆ نموونە ئەلیوت ڕێزێکی گەورە



و بەرزی هەیە بۆ ئەدیب و بیرمەندەکانی فەرەنسا لە نموونەی پۆل ڤالێری.
لەلایەکی دیکەوە دەبینین بێزاری خۆی دەربارەی زۆرێک لە شاعیران و ئەدیبانی ئینگلیزی و ئەمریکی سەردەمەکەی خۆی دەردەبڕێت. هەڵوێستی لەسەر ڕۆماننوسی گەورەی ئینگلیز "د. ه. لۆرانس" خاوەنی ڕۆمانی ناودار (دۆستی خاتوو شاترلی) کە بانگەشەی ئازادکردنی جەستە دەکات لە هەموو حەرامکراوەکانی چاخی کۆن و شلکردنی جڵەو بۆ غەریزە سێکسییەکان، باش نییە و بەوە وەسفی دەکات کە ویژدانێکی دووفاقی هەیە. ئەلیوت دان بەوەدا دەنێت کە لۆرانس ڕۆماننوسێکی بلیمەتە، بەڵام لە تێگەشتنێکی ئاینی ئەخلاقییەوە، لەگەڵ تێڕوانینەکانیدا نییە و ڕەتیاندەکاتەوە و پێیوایە دیدگای لۆرانس دیگایەکی ڕۆحییە، وەلێ ڕۆحییەتێکی نەخۆش.
ئەلیوت لە نامەگۆڕینەوەکانی لەگەڵ ڕەخنەگری ئەنگلیزی "ا. ا. ڕیشارد" گفتوگۆ لەسەر کۆمەڵێ مەسەلەی گرنگ دەکات، لەوانە ڕۆڵی فەلەسەفە لە شیعردا چییە؟ ئەی چ پەیوەندییەک لەنێوان بڕواکانی



د. ه. لۆرانس

شاعیر و شیعرەکانیدا هەیە؟ بۆ نموونە ئایا دەکرێ چێژ لە کۆمیدیای ئیلاهی دانتی وەربگرین کە لەسەر فیکری کاسۆلیکی بنیاتنراوە، ئەگەر ئێمە خاوەنی فیکرێکی نەیار بین یان فیکری مەسیحی بە تەواوی ڕەتبکەینەوە؟ هەروەها نامەگۆڕینەوەکانی لەگەڵ ڕەخنەگری ئینگلیزی "بۆنامی دوبریە" کە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٥- ١٩٢٩ لە زانکۆی قاهیرە مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزی بووە، پڕە لە گاڵتەپێکردنێکی توند لەسەر خراپی و ئاست نزمی خوێندکارە میسرییەکانی زانکۆ!

ئێمە لەگەڵ ئەوەی دان بە گرنگی و بایەخی ئەم نامانە دا دەنێین، وەلێ پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین کە ئەلیوت نووسەرێکی نامەنووسی مەزن نەبووە، وەک شاعیری ڕۆمانسی ئینگلیز جۆن کیتس یان ڕۆماننوس د. ه. لۆرانس. ئەلیوت زیاتر لە خۆبەدوورگرتن و ڕەسمییاتەوە نزیک بووە و زیاتر حەزی لە شاراوەیی و نەدەرکان بووە و ئێمە لەم نامانەدا شتێکی ناوەکی ئەوتۆ نابینین کە بۆنی ئابڕووچونی لێ بێت، ئەویش وەک هەموو مرۆڤێکی دیکە، بێ بەش نییە لە دووفاقی. لە زۆر ساتەوەختی کەمدا، لە دانیشتنە تایبەتەکانیدا، زەم و سەرزەنشتی هەندێ لە ئەدیبەکانی کردووە، کەچی لەسەر کاغەز ستایش و دەستخۆشی لێکردوون. ڕەنگە هێرشی کردبێتە سەر هەندێ لە ئەدیبەکان- بەهۆی ئەوەی لە ڕووی ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە- جیاواز بوبێت لەگەڵیاندا، کەچی لە قوڵایی ناخییەوە پێیان سەرسام بووە و سووربووە لەسەر ئەوەی هەمو ئەو شتانە بخوێنێتەوە کە قەڵەمی ئەو ئەدیبانە نووسیویانە.

زیاد لە هەزار نامە هەیە کە ئەلیوت بۆ خانم "ئەمیلی هاڵ"ی نووسیوە، ئەو خانمە کچێکی ئەمریکی بووە و ئەلیوت لە تەمەنی لاویدا خۆشیویستووە، بەڵام پەیوەندییەکەیان نەگەشتووەتە قۆناغی مارەبڕین یان هاوسەرگیری. ئەم کچە کاتێ زانی ئەلیوت سکرتێرەکەی خۆی هێناوە، دووچاری شۆکێکی بەهێز بوو، چونکە هەمیشە بێ هیوا نەبوو لەوەی پەیوەندییەکەیان بگات بە قۆناغی هاوسەرگیری. ئەلیوت لە وەسیەتنامەکەیدا، ئەو مەرجەی داناوە کە نابێت نامەکانی بۆ ئەمیلی بڵاوبکرێنەوە، تەنها ساڵی ٢٠٢٠ نەبێت. ئەمە وەک جۆرێک لە پەرۆشی ئەلیوت بۆ تایبەتمەندیەتی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ ئەو کچەدا هەیبووە، ئەلیوت نەیویستووە پەردە لەڕووی ئەو نامانە هەڵدرێتەوە تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دڵنیایە خۆی و خۆشەویستە کۆنەکەی کۆچی دواییان کردووە.

ئێمە نازانین ئاخۆ تەمەن-دوای حەوت ساڵی دیکە- دەرفەتی ئەوەمان پێدەدا ئەو نامانە ببینین، یان نا. بەڵام بە دڵنیاییەوە نەوەکانی داهاتوو، چێژ لەو نامانە دەبینن و هەندێ لەو کەلێنە ئاشکرایانە پڕ دەکەنەوە کە لە ناسینی ئەم شاعیرە گەورەیەدا هەیە و بەدەر نەبووە لە هەندێ حاڵەتی دووفاقی و ئاڵۆزی. ئەگەر ناونیشانی ڕۆمانێکی "جێمس جۆیز" بخوازین (وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا)، ئەوا ئەم نامانە عاشقێک و شاعیرێکمان پێشکەش دەکات کە لە دۆخی پێگەیشتندایە، ڕەخنەگرێکی تازە پشکوتومان پێدەناسێنێت، توێژەرێکی فەلەسەفی و کوڕ و برا و خوێندکارێکی زانکۆیی و ئەمریکیمان دەخاتە بەردەست کە خواستی ئەوەی هەیە دیدگای بینینەکانی بکاتە ئاسۆکانی ئەوروپا.

سەرچاوە:

ماهر شفيق فريد، الشرق الاوسط، ٢٠١٣/٨/٢٢

# ڕۆمانی (وەرزی ئێسک) لە نێوان شەوو ڕۆژێکدا ناوبانگی نووسەرەکەی بەرزدەکاتەوە

و. لە عەرەبییەوە: سەردەم






"سامنشا شانون" کە کچێکی بەریتانی تەمەن ٢١ساڵە و دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە شەو و ڕۆژێکدا وەک خانمە نووسەری زنجیرەی هاری پۆتەر "جی. کی رۆلینگ- J.K rowling"ی لێهاتووە. دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەریتانیا، لەو بڕوایەدان ئەم کچە گەنجە، هەمان ئەو سەرکەوتنە بەدەستدەهێنێت کە نووسەری زنجیرەی هاری پۆتەر بەدەستیهێناوە. هەروەها کاتێ یەکەم ڕۆمانی بە ناونیشانی (وەرزی ئێسک - موسم العظم) بڵاودەکاتەوە، ناوبانگێکی گەورە بەدەستدەهێنێت. پێدەچێت ئەم ڕۆمانە بەشی یەکەمی ڕۆمانێک بێت کە لە حەوت بەش پێکهاتووە و تا ئێستا شانون لە نووسینەوەی تەواو نەبووە.
ئەم خانمە نووسەرە، ساڵی ٢٠١١ دەستی بە نووسینی ڕۆمان کردووە. لە کاتی دانیشتنی بۆ ژەمەکانی خواردن، لەو دەفتەرەی کە لە نووسینگەی پۆست کڕیبووی، ئەو خەیاڵاتانەی بە مێشکیدا تێپەڕیوون، بەشێوەیەکی نارێک تۆمار کردووە، پاشان دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، تا درەنگانێکی شەو بەردەوام بووە لەسەر تۆمارکردنی نارێکی خەیاڵاتەکانی. بەم شێوەیە بەشی یەکەمی کارەکەی تەواو کردووە کە ٤٨٠ لاپەڕە بووە. دواتر شانون ئەم نووسینەی پیشانی مامۆستاکانی زانکۆی داوە و ئەوانیش زۆر پێی سەرسامبوون و ئامۆژگارییان کردووە بینێرێت بۆ یەکێک لە دەزگاکانی بڵاوکردنەوە لە بەریتانیا. ئەم کچە هیچ دەزگایەکی نەناسیوە تەنها دەزگای (دێڤید جودۆین) نەبێت کە بە مەبەستی پەیداکردنی شارەزایی، بە خۆڕایی تێیدا کاری کردووە. ڕۆمانەکە بووەتە جێگای بایەخ و سەرسوڕمانی هەموو ئەو کارمەندانەی لەو دەزگایەدا کاریان کردووە. دوای چەند هەفتەیەکی کەم، دەزگای (بلۆمزبری) ڕۆمانەکەی کڕیوە و ئەرکی بڵاوکردنەوەی گرتووەتە ئەستۆی و پێشەکی بڕی سەد هەزار جونەیهی ئیستەرلینی بە نووسەری ڕۆمانەکە داوە.

ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە، باس لە ئایندەیەکی خەیاڵی دوور دەکات کە دەکاتە ساڵی ٢٠٥٩، باس لە کچێک دەکات ناوی "بایچ ماهۆنی"یە و تەمەنی ١٩ ساڵە و توانای بینینی پێشبینی هەیە. ئەم کاراکتەرە لە ڕۆژێکی باراناویدا، دووچاری فڕاندن دەبێت و لەو چرکەساتەوە بۆ هەتاهەتایە ژیانی دەگۆڕدرێت و لە شاری ئۆکسفۆرد زیندانی دەکرێت. بەپێی ڕۆمانەکە بێت ئەم گرتووخانەیە بۆ ماوەی ٢٠٠ ساڵ بە دوور لە چاوی خەڵکی و بە نهێنی دەمێنێتەوە و کۆمەڵێ بوونەوەری سەیر و سەمەرە کە توانای ڕادەبەدەریان هەیە، سەرپەرشتی زیندانەکە دەکەن. بایچ دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی بەڕێوەبەری زیندانەکەوە و ناچاری دەکات نهێنییەکانی جیهان ئاشکرا بکات و بۆ ئەوەی ئازادی خۆی بەدەستبێنێت، ئەوا پێویستە لە ناوەوەی زیندانەکە مەشق و ڕاهێنان بکات.
ڕۆمانەکە خواستی نووسەرەکەی و خەیاڵە بەرفراوانەکەی دەردەخات، ئەم خانمە پاڵەوانی ڕۆمانەکەی بە جۆرێک دارشتووە، جیاوازە لە کەسایەتی ژیانی ڕۆژانەی خۆی. پاڵەوانی ڕۆمانەکە خانمێکی بەهێز و ئازایە و حەز لە وەرزش دەکات، کەچی نووسەری ڕۆمانەکە وا باس لە خۆی دەکات کە کەسێکی شەرمن و داخراوە و حەز لە گۆشەگیری و نووسین دەکات. ئەم ڕۆمانە کە هێشتا بڵاونەکراوەتەوە، ڕیکلامێکی زۆری بۆ کراوە، ڕیکلامێک زەحمەتە نووسەرە تازە دەستپێکردووەکان بە دەستی بێنن. شانون گرێبەستێکی لەگەڵ نوێنەری کۆمپانیای (ئاندی سرکیس) واژۆکردووە، لەم واژۆکردنەدا مافی ئەوەی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە بکرێت بە فیلمێکی سینەمایی فرۆشتووە، هەروەها بیست دەوڵەت مافی کڕین و بڵاوکردنەوەی ڕۆمانەکەیان دەستکەوتووە.

سەرچاوە: الشرق الاوسط، ٢٠١٣/٨/١٩

# بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

دەزگای سەردەم لەماوەی دوو مانگی ڕابردودا، كۆمەڵێ كتێبی تازە و هەمە جۆری خستە كتێبخانەی كوردییەوە، كتێبەكانی ئەم ماوەیە هەم لە ڕووی ناوەڕۆك و هەم لە ڕووی قەبارەوە جیاواز و هەمە ڕەنگن. ئەم جیاوازی و هەمەڕەنگییەیە وادەكات كتێبەكان بایەخێكی باشیان هەبێت و كتێبخانەی كوردی پێ دەوڵەمەند بكرێت. لە خوارەوە و بەپێی توانا و ئەوەندەی ئەم گۆشەیە دەرفەتمان بداتێ، ڕانان بۆ هەندێ لەو كتێبانە دەكەین.

# ڕاپەڕینەکانی عەرەب..
# لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی مێژوودا




ئـەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە بەنرخ و جوانەکانی نووسەر و بیرمەندی عەرەب د. هاشم ساڵح، کتێبەکە بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی و دوور لە هەر هەڵچونێکی سۆزداری، باس لە شۆڕشەکانی عەرەبی دەکات و هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکات.

ئەم نووسەرە پێشتر و لەکاتی سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی توونس و لیبیا و میسر، بە ئەندازەیەکی گەورە دڵخۆش و گەشبین بوو، واتە بە جۆرێک لە جۆرەکان پشتگیرییەکی تا ڕادەیەک زۆری ئەم شۆڕشانەی دەکرد، تەنانەت لە یەکێک لە وتارەکانیدا ئەم شۆڕشانەی بە شۆڕشی فەرەنسی چواند. جگە لەوە کۆمەڵێ وتاری دیکەی لەسەر ئەم شۆڕشانە نووسی و لەو وتارانەیدا خاڵە جوان و دەگمەن و ناوازەکانی خستەڕوو. بەڵام وەک لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە، ئەم خۆشحاڵی و گەشبینییەی زۆری نەخایاند و تاڕادەیەک پەشیمانە لەوەی ئەم شۆڕشانەی بە شۆڕشی فەرەنسی چواندووە و لەم بارەیەوە دەڵێ: (...بە تایبەتی هەندێک ڕووناکبیری عەرەب شۆڕشی میسری و شۆڕشی فەرەنسیان پێک بەراوورد کردووە، بەڵکو لە شۆڕشی فەرەنسیان بە مەزنتر داناوە! من بۆ خۆم تاڕادەیەک بووم بە تەڵەکەوە و دواتر زیاتر لە جارێک داوای لێبوردنم کرد).

لێرەوە پرسیاری سەرەکی کە نووسەر دەیەوێ لەم کتێبەدا وەڵامی بداتەوە، ئەمەیە: بۆچی بەهاری عەرەبی و شۆڕشەکانی ئەم بەهارە، لە شۆڕشی فەرەنسی ناچن و ناکرێت لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ ئەو شۆڕشە مەزنەی فەرەنسادا بەراوردبکرێن؟ دەکرێ بڵێین نووسەر بە درێژایی ئەم کتێبە بەشوێن وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەگەڕێت و هەوڵدەدا لە دوتوێی لاپەڕەکانی کتێبەکەدا - کە کتێبێکی قەبارە گەورەیە - وەڵامەکانی بخاتەڕوو. بۆ ئەو مەبەستە، واتە بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکانی پشت ئەو پرسیارە سەنتراڵەی کتێبەکە، هاشم ساڵح پەیڕەوی لە خوێندنەوەیەکی مێژوویی ڕووداوەکان دەکات و ئەم شۆڕشانە لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی مێژوودا دەخوێنێتەوە، بەتایبەتی تێگەشتنی هیگڵ بۆ مێژوو. لە ئەنجامی ئەم خوێندنەوەیەدا نووسەر گەلێک جیاوازی و خاڵی لێکنەچوون لەنێوان بەهاری عەرەبی و بەهاری فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ کە ساڵی بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسییە، دەدۆزێتەوە.

دانەری ئەم کتێبە بەهاری عەرەبی بە یەکێک لە

ڕووداوه گەورەکانی مێژوو لەقەڵەم نادات. بێ گومان نووسەر بۆ ئەو مەبەستە، بە درێژایی لاپەڕەکانی کتێبەکە، چەندین پاساوی گرنگ و لۆژیکی دەخاتەڕوو. بەڵام سەرەتا با بزانین ئەو ڕووداوە گەورانەی مێژوو کامانەن کە بەڕێز هاشم ساڵح بە ڕووداوی گەورەیان ناودەبات و پێیوایە ئەو ڕووداوانە وەرچەرخانی گەورەیان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هێناوەتە ئاراوە. نووسەر ئەم ڕووداوانەی خوارەوە بە ڕووداوی گەورەی مێژوویی دادەنێت: (١-سەرهەڵدانی ئیسلام و شارستانییەتەکەی، ٢- هەرەسهێنانی ئەو شارستانییەتە پێش هەشت سەدە لەمەوبەر و سەرکەوتنی غەزالی و ئیبن تیمیە بەسەر فارابی و ئیبن سینا. ٣- سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینی لە ئەورووپا لەسەر دەستی مارتن لۆسەر. ٤- هاتنەئارای سەردەمی ڕێنیسانس لە ئەورووپا. ٥- بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩. ٦- ڕووخاندنی دیواری بەرلین ساڵی ١٩٨٩ هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم. ٧- تەقینەوە تاوانکارییەی ١١ سێپتێمبەر...هتد)، ئەمە سەرەڕای چەندین ڕووداوی دیکە کە دانەری کتێبەکە ئاماژەی پێکردوون.

ئەگەر لە خاڵی یەکەم وردبینەوە، دەبینین نووسەر ڕێزێکی گەورەی بۆ شارستانیەتی ئیسلامی هەیە، ڕێزێک ئەوە دەردەخات ئەم نووسەرە کەسێکی مولحید نییە وەک ئەوەی هەندێ لە گروپ و دەستە و تاقمی توندڕەوی سەلەفی و جیهادی دەیڵێن. بەڵکو ئیمانی ئەم بیرمەندە، ئیمانێکە لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی قووڵی مێژووی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە. خوێندنەوەیەک توانای دەستنیشانکردنی خاڵە پرشنگدارە و تاریکەکانی ئەم شارستانیەتیەی هەیە و بوێرانە باسیان لێوەدەکات و دەست دەخاتە سەر ئەو ساتەوەختەی کە تێیدا شارستانیەتی ئیسلامی لەباتی ئەوەی هەنگاو بۆ پێشەوە بنێت و بەردەوامبێت لەسەر ڕەوتە ڕۆشنگەرەکەی، دەست بە پاشەکشە دەکات و هەنگاو بۆ دواوە دەنێت.

لای ئەم نووسەرە، ئەو جیاکارییەی بەهاری عەرەبی و ئەو ڕووداوە مێژووییانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، لە دوو خاڵی سەرەکیدا کۆدەکاتەوە کە دەکرێ بەم شێوەیە بیانخەینەڕوو

یەکەم: بەهاری عەرەبی دابڕانێکی گەورەی لەگەڵ ڕابردوی پێش خۆیدا نەهێناوەتە ئاراوە، وەک ئەوەی ڕووداوە گەورەکانی مێژوو دەیهێننە ئاراوە. بگرە شۆڕشەکانی عەرەبی بە جۆرێک لە جۆرەکان گەڕانەوەیەکی زەقە بۆ ڕابردوو، هێنانەوەی ڕابردووە بە هەموو دواکەوتوویی خۆیەوە، بۆ ئێستا و بۆ ئایندە. ئەم خاڵەیە وادەکات نووسەر گومانی لەم شۆڕشانە هەبێت.

دووەم: لە شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبیدا، وێنەی پیاوانی ئاینی بەرزکرانەوە و گۆڕەپانەکانیان پێ ڕازێنرایەوە. ئەمەش تەواو پێچەوانەی شۆڕشە گەورەکانی دونیایە، بەتایبەت شۆڕشی فەرەنسی کە لە بنچینەدا دژ بە دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی و کۆشکی پاشایەتی بەرپاکرابوو. واتە لە شۆڕشی فەرەنسیدا پیاوانی ئاینی لەسەر سەحنەی سیاسی دوورکەوتنەوە و بگرە زۆرێکیان یا کوژران یاخود گیران یان هەڵهات و بە دونیادا پەرتەوازەبوون یاخود بەردەوام لە خۆشاردنەوەدابوون تاکو نەبینرێن و نەکەونە دەست شۆشرگێرەکانەوە. کەچی لە بەهاری عەرەبیدا، پیاوانی ئاینی بەخۆیان و ڕیشە درێژەکانیانەوە هاتنە سەر سەحنەی سیاسی و داگیریان کرد، لە ژێرزەمین

و ماڵە تاریک و نووتەکەکانەوە هاتنە دەرەوە و کەوتنەر بەر ڕۆشنایی میدیاکان و گۆڕەپانەکان و سەراکانی ئازادیان داگیر کرد و جڵەوی حوکمڕانییان گرتە دەست. لە شۆڕشی فەرەنسیدا وێنەی فەیلەسوفانی وەک ڤۆڵتێر و ڕۆسۆ بەرزدەکرایەوە، کەچی لە شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبیدا و پێش ئەویش لەشۆڕشی ئێرانیدا، وێنەی خومەینی و ئایەتوڵاکان و قەرزاوی و فەتواچییەکان بەرزکراونەتەوە. بێگومان ئەم دوو جۆرە وێنەیە، جیاوازییەکی تابڵێی گەورە لەنێوانیاندا هەیە و مەبەست و ئامانجی هەر یەک لەو وێنانە بەڕوونی و بە ئاشکرایی دیارە. بەرزکردنەوەی ئەو وێنانە لە هەردوو شۆڕشەکەدا، دەریدەخات ئەو شۆڕشانە بەرەو کوێ هەنگاو دەنێن و چیان دەوێ و دژ بە چی بەرپابوون. لە ڕاستیدا ئەوە وێنەکانن کە ئاراستەی شۆڕشەکان دیاریدەکەن و بەرەو ئەو ئاقارەی دەبەن کە وێنەکان گوزارشتی لێدەکەن.
ئالێرەوەیە نووسەری کتێبەکە ترسێکی گەورەی لە بەرامبەر ئەم شۆڕشانەدا هەیە. بەڵام دواجار دەبێت ئەوە بڵێین، دوای لابردنی مورسی و کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتەکەی لە وڵاتی میسر، ئەم نووسەرە لە بەرواری ١٣-٧-٢٠١٣ لە ڕۆژنامەی (شرق الاوسط) وتارێکی بە ناونیشانی: (خۆری شارستانیەت بەسەر عەرەبدا هەڵدێت) نووسی، تێیدا سوپاسی گەلی میسر دەکات کە توانیان ڕێڕەوی شۆڕش بگرنە دەست و هیوایەکی بۆ گەڕاوەتەوە بەوەی ئەم شۆڕشانە بکەونەوە سەر ڕێگای ڕاستی خۆیان.
کتێبی ڕاپەڕینەکانی عەرەب لەلایەن بەڕێز کاک هەڵکەوت عەبدوڵڵا کراوە بە کوردی، ژمارەی لاپەڕەکانی ٤٢٣ لاپەڕەی گەورەیە و تیراژی هەزار دانەیە و نرخی شەش هەزار دینارە.

## دەروازەیەك بۆ کۆمەڵناسی




یەکێکی دیکەیە لەو کتێبانەی لەماوەی دوو مانگی پێشودا کەوتە کتێبخانەی کوردییەوە. کتیبەکە یەکێکە لەو کتێبە دەگمەنانەی بە زمانێکی کوردی پاراو، قسە لەسەر زانستی کۆمەڵناسی دەکات و بە شێوەیەکی سوک و ئاسان ئەم زانستە ئاڵۆزە شیدەکاتەوە و لایەنەکانی دەستنیشان دەکات. بڕێک لە جوانی ئەم کتێبە لەوەدایە، هەردوو نووسەری کتێبەکە، بە کوردییەکی پوخت و بە زمانێکی سادە، بەڵام قووڵ و زانستی، باس لە یەکێکە لە زانستە هەرە ئاڵۆزە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن کە زانستی کۆمەڵناسییە.

کۆمەڵناسی ئەو زانستەیە کە باس لە کۆمەڵگا دەکات بە هەموو پێکهاتەکانییەوە، کۆمەڵگاش دیاردەیەکی ئاڵۆزی پێکداچووە و لە چەندین ڕەگەز و مرۆڤ و توێژ و چین و ئاین و مەزهەب و ئاقاری فیکری و ئەدەبی و هونەری جیاواز جیاواز پێکهاتووە. ئەم پێکهاتە گەورە و بەرفراوان و هەمە ڕەنگەیە وا دەکات بینینی ئەوەی لە کۆمەڵگادا ڕوودەدات، ئاسان نەبێت و کارێکی زەحمەت بێت. کۆمەڵگا یەکەیەکی فرە ڕەنگ و فرە دەنگ و فرە بیرکردنەوەیە، لە هەر بەشێکی کۆمەڵگادا چەندین دیدگا و تێڕوانینی تەبا و ناتەبا، کۆک و ناکۆک، گونجاو و ناگونجاو لەگەڵ یەکدا هەیە. زۆرجار ئەم دیدگایانە لە گفتوگۆ و مشتومڕی بەردەوامدان لەگەڵ یەکتر و یەک ئەوی دیکە ڕەتدەکاتەوە. لێرەوەیە کۆمەڵگا بەو هەموو پێکهات و دیدگا جیاوازانەوەی، بووەتە پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و پێویستی بە زانستی کۆمەڵناسی و کۆمەڵناسان هەیە، تا بەوردی تیشک بخەنە سەر ئەو پێکهاتانە و مەرام و ویست و ئامانجەکانیان ڕووناک بکاتەوە.
بێگومان لای هەموان ئاشکرایە، کتێبخانەی کوردی لە ڕووی ئەم جۆرە کتێبانەوە هەژار و دەستکورتە. لەم لایەنەوە نەبوونی سەرچاوە بە زمانی کوردی، بایەخێکی گرنگ و گەورەی کتێبەکە دەخاتەڕوو. ئەمە ئەگەر زانیمان ئەو زمانەی لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا بەکارهاتووە، زمانێکی زانستی و لۆژیکییە و دەوڵەمەندە بە سەرچاوەی مەعریفی. کتێبەکە وەک لە پێشەکییەکەیدا هاتووە، لە نۆ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمی تا بەشی پێنجەمی لە لایەن پرۆفیسۆر د. تاهیر حەسۆ زێباری -یەوە نوسراوە. بەشی شەشەم تا بەشی نۆیەم لەلایەن بەڕێز د. محەمەد حوسێن شوانی-یەوە نوسراوە. کۆی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ٢٩٧ لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندییە و تیراژی کتێبەکە ٦٠٠ دانەیە و نرخی ٤٥٠٠ دینارە.

## چیرۆك و ئەفسانەی موكریان




بێگومان هەموو نەتەوە و میللەتێک لەسەر ئەم گۆی زەوییە، خاوەنی کۆمەڵێ چیرۆک و ئەفسانەی تایبەت بە خۆیەتی. دوور ئەو ئەفسانانە لەگەڵ ئەفسانەی نەتەوە و میللەتانی دراوسێدا، لە هەندێ ڕووکار و ڕووداویدا لێکبچن. واتە وەک چۆن هەموو نەتەوە و میللەتێک ئەفسانەی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوا دەکرێ لە پاڵ ئەو ئەفسانە تایبەتانەیدا، هەندێ ئەفسانەی دیکەی هەبێت کە هاوبەشە لەگەڵ نەتەوەو میللەتانی دیکەدا.
ئەفسانە بۆ خۆی بریتییە لەو چیرۆک و بەسەرهاتە

مێژوییانەی لەدەرەوەی تێگەشتن و لۆژیکدایە و بە مەنتقی عەقڵ و تێفکرین لێکنادرێتەوە. بە مانایەکی تر ئەفسانە کۆمەڵێ ڕووداوە لە زەمەنێکی مێژویی دیاریکراودا ڕویانداوە، ئەم ڕووداوانـە لە ڕێگەی یادەوەری دەستەجەمعییەوە گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و لێی لابراوە و بۆشی زیادکراوە. ئەفسانە زیاتر بەرگێکی زارەکی هەیە تا بەرگێکی نووسین، واتە ئەفسانە هێندەی لەڕێگەی قسە و وتن و بە شێوەیەکی زارەکی دەماودەم دەگێڕدرێتەوە، هێندە لە ڕێگەی نووسین و ئەرشیفکردنییەوە ناگێڕرێتەوە. پـاڵـەوان و کـارەکـتـەری ئـەفـسـانـە، بـەزۆری خوداوەندەکان، پەریزا و جنۆکە و دێو و درنج، گیاندارە باڵدارەکان و ئەو مرۆڤانەن کە نیوەی جەستەیان مرۆڤە و نیوەکەی دیکەی گیاندار. واتە زۆرجار پاڵەوانانی ئەفسانەکان مرۆڤی ئاسایی نین و هێز و توانایەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە کە مرۆڤی ئاسایی دیکە ئەو هێز و وانا گەورە و زەبەلاحەیان نییە.

ئـەم کتێبە کـۆمـەڵـێ ئـەفـسـانـەی دەگـمـەن و سەرنجڕاکێشی ناوچەی موکریان-مان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەکاتی خوێندنەوەیدا دەگەڕێیتەوە بۆ ڕۆژگار و سەردەمانی دێرین و گەشتێکی گەورە بەناو زەمەندا دەکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆ ڕۆژانی ڕوودانـی ئەو ئەفسانانە. بەمەش جۆرێک لە چێژ و لە ئارامی و لە کردنەوەی خەیاڵ، لای خوێنەر دروست دەبێت.

ئەم کتێبە ١٠٢ چیرۆکی ئەفسانەیی لەخۆگرتووە، دانەری کتێبەکە کارێکی باشی کردووە کە ئەم ژمارە زۆرەی ئەفسانەی بۆ پێنج کۆمەڵە پۆلێنکردووە کە بریتین لەمانەی خـوارەوە: چیرۆکی جیانەوەران. چیرۆکی سیحراوی. چیرۆکی کۆمەڵایەتی تەنزاوی. چیرۆکی کۆمەڵایەتی هەمەلایەنە. کورتە چیرۆک. بەم پێیە خوێنەر دەتوانێ بە ئـارەزووی خۆی لە هەر بەشێک لەو بەشانەوە دەست بە خوێندنەوەی کتێبەکە بکات و پابەند نەبێت بە ڕیزبەندی ئەفسانەکانەوە.

کتێبی چیرۆک و ئەفسانەی موکریان لەلایەن بەڕێز هاشم سەلیمی کۆکراوەتەوە و لێکۆڵینەوە و پۆلێنبەندی بۆ کراوە. ژمارەی لاپەڕەکانی کتێبەکە ٤٧٥ لاپەڕەی گەورەیە، تیراژی ٥٠٠ دانە و نرخی حەوت هەزار و پێنج سەد دینارە.

## ئارەزووی خوێندنەوە




ئەم کتێبە یەکێک لە زنجیرە کتێبەکانی گیرفان و ژمارە (١٢٧) ئەو زنجیرەیەی وەرگرتووە. بابەتی سەرەکی کتێبەکە بریتییە لە چۆنیەتی جۆشدان و

هاندانی منداڵ بۆ خوێندنەوەی کتێب. بریتییە لە گەشەپێدان و بەرفراوانکردنی حەز و ئارەزووی منداڵ و مێردمنداڵان بۆ خوێندنەوەی کتێب. بریتییە لەوەی چۆن و بە چ شێوەیەک دەکرێ حەز و ویست و ئارەزووی خوێندنەوە لای نەوەکانی ئایندە بچێنین و وایان لێبکەین خوێندنەوەی کتێب، لە تەمەنێکی زووەوە، ببێت بە بەشێک لە کاری ڕۆژانەیان.

بێ گومان لێرەدا مەبەست لە کتێب، ئەو گۆڤار و بڵاوکراوانەیە کە دەکەونە دەرەوەی کتێبەکانی قوتابخانە. واتە خوێندنەوەی کتێبی دەرەوەی مەنهەجی دیاریکراوی مەکتەب. بەتایبەتی خوێندنەوەی کتێبە ئەدەبییەکانی وەک شیعر، چیرۆک، ڕۆمان، شانۆنامە. بە پێی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە کە لە سویدییەوە کراوە بە کوردی، خوێندنەوەی ژانرە جیاوازەکانی ئەدەب، هۆکارێکە بۆ کردنەوەی خەیاڵ و بەرفراوانکردنی توانای بیرکردنەوەی منداڵان. لەم کتێبەدا سەرنج و دیدگای زۆرێک لە دایکان و باوکان، ژمارەیەک لە مامۆستایانی قوتابخانە بنەڕەتییەکان لە ١ بۆ ٧، کۆمەڵێ نووسەر وەرگیراوە. ئەمەش خاڵێکە لە دەوڵەمەندکردنی کتێبەکە سودی لێوەرگیراوە. چونکە ئەو بەڕێزانە لە ڕێگەی ئەزمونی خیانەوە لەگەڵ منداڵەکانیان، گەشتوونەتە کۆمەڵێ دیدگا کە بۆ ڕاهێنانی منداڵ لەسەر خوێندنەوە بەکەڵکن و دەکرێ پشتیان پێ ببەسترێت.

ئەم کتێبە لە نۆ بەش پێکهاتووە، هەر بەشەی باس لە لایەنێکی گرنگی کاری خوێندنەوە دەکات. لە هەندێک لە بەشەکاندا، ئاماژە بە چەندین ڕێنمایی و تاقیکردنەوەی ئاسان و سودبەخش کراوە کە دەکرێ لێیانەوە منداڵ، بێ ئەوەی هەست بە نارەحەتی و بێزاری و ناخۆشی بکات، ئاشنای جیهانی کتێب ببێت. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هاتووە: (منداڵی حەوت ساڵە پاشخانی وشەی دەگاتە ٥٠٠٠ — ٧٠٠٠ هەزار وشە. منداڵێکی ١٧ ساڵ کە بە بەردەوامی دەخوێنێتەوە، پشخانی وشەی دەگاتە ٥٠ ٠٠٠ – ٧٠ ٠٠٠ هەزار وشە. بەڵام ئەو منداڵە تەمەن حەڤدە ساڵییەی کە ناخوێنێتەوە، هەگبەری وشەی تەنیا دەگاتە ١٥ ٠٠٠ — ١٧ ٠٠٠ هەزار وشە).

لەم بەراوردکردنەوە تێدەگەین کە پاشخان و هەگبەی ئەو منداڵانەی بەشێوەیەکی بەردەوام کاری خوێندنەوە ئەنجامدەدەن، زۆر زیاترە لە پاشخان و هەگبەی ئەو منداڵانەی ناخوێننەوە. لە ڕاستیدا جیاوازییەکە زۆر گەورەیە و پێویستە بە هەند وەربگیرێت. جگە لەوە کتێبەکە باس لەوە دەکات هاندانی منداڵ بۆ خوێندنەوە تەنها ناکەوێتە ئەستۆی لایەنک و لایەنێکی دیکە لێی بەرپرسیار نەبێت، بەڵکو ئەو بەرپرسیارەتییە هەمە لایەنە و هەموو ئەوانەی ڕۆژانە تەماسیان لەگەڵ منداڵدا هەیە، بەشێک لەو بەرپرسیارەتییەیان دەکەوێتە ئەستۆ. لەوانە دایک و باوک و خوشک و برا گەورەکان لە ماڵەوە، ستافی مامۆستا و پەروەردەکاران لە قوتابخانە. وەلێ لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، ڕاهێنانی منداڵ لەسەر خوێندنەوە و چاندنی حەزی خوێندنەوە لە منداڵدا، پرۆسەیەکی ئاسان نییە و سوک نایەت بەدەستەوە. بەڵگو پرۆسەیەکی زۆر لەسەرخۆیە و حەوسەڵەیەکی گەورەی دەوێت.

دواجار ئێمەش لەگەڵ وەرگێڕی کتێبەکەدا کۆکین کە لە کۆتایی پێشەکییە کورتەکەیدا دەڵێ: (بێ دروستکردنی کولتووری خوێندنەوە مەحاڵە بتوانین پێش بکەوین... خەملاندنی حەزی منداڵان و لاوان بۆ خوێندنەوە، گەلێک گرنگە، دەریایەک قسەی لەسەر کراوە. ئەم کتێبە دڵۆپێکە لەم دەریایە).

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز شاهۆ حەسەنپوور لە سویدییەوە کراوە بە کوردی، ژمارەی لاپەڕەکانی ١٤٩ لاپەڕەی بچووکە، تیراژی ٥٠٠ دانەیە و نرخی هەزار دینارە.